ماستەرنامە

# گوتاری سیاسی ئیسلامی



# لەنێوانی



# ئێستاو مێژوودا

ماکوان کەریم

**خوایە گیان دەستپێکێك كە تۆ خاوەنی نەبیت،**

**چ ئومێدێك هەیە بۆ كۆتایەکەی.. کەواتە بەناوی پیرۆزی زاتی**

**بەرزت دەست پێدەکەم**



ماستەرنامە

# گوتاری سیاسی ئیسلامی

## لە نێوان

## ئێستاو مێژوودا

نوسینی: ماکوان کەریم

ناوی پەرتووك: گوتاری سیاسی لە نێوان ئێستاو مێژوودا
ناوی نووسەر: ماكوان كەریم
سەرپەرشتیارو پێداچوونەوە: د. عومەر عەلی
دیزان و بەرگ: توانا ئەحمەد
چاپی: یەكەم
ساڵی: ٢٠١٦

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان ، ژمارەی سپاردنی (١٨٨٥)ی ساڵی (٢٠١٦) ی پێدراوە.

ISBN 978_82_690419_0_3

سوپاس و پێزانی نوسەر- بۆ برای خۆشەویستمان کاك هەریاد، کەئەرکی چاپ و بڵاوکردنەوەی گرتە ئەستۆی خۆی خوای گەورە پاداشتی خێری بداتەوە.

“

ئەم پەرتووکە پێشکەشە بەڕۆحی باوکم

خوای گەورە بیخاتە فیردەوسی بەرز،

زۆر تامەزرۆ بوو پێش شەهیدبوونی

بڕوانامەکەم ببینێ...

”

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

جیهانی ئەکادیمی گەرچی بەهێزترین پێوەری زانستی سەردەم بێت بەڵام ناتوانێت ئەو هەوڵانەی لە ڕابردوودا لە بواری نووسین و گواستنەوەی زانست و ڕووداو و زانیاریەکان دراوە پشگوێ بخات، زۆر بە تایبەتی مەخطوطات و نوسراوە ئیسلامیەکان، ئەو بنەمایانەی کە ئێستە وەك پێوەری زانستی و ئەکادیمی کاری پێ دەکرێت و کراوە بە قاڵببەندی توێژینەوەکان زۆری لەسەر بنەمای ئەو نووسراوە بۆ ماوانە بووە، گەرچی دونیای ئەکادیمیش دەتوانێت ڕاست و چەوتیش هەردووکی پێچەوانەی یەکتر بکاتەوە بەڵام دەقە دروستەکان ئەقڵە هۆشیارەکان زوو هەستی پێ دەکەن و دەتوانن لەناو دەقانی تردا جیای بکەنەوە، کاتێك کەسێکی دەشتەکی کە گوێی لەم چەند ئایەتەی قورئان دەبێت ئایەتی ٥٩ بۆ ٦٢ سورەتی النجم (افمن هذا الحديث تعجبون، وتضحكون ولا تبكون، انتم سامدون، فاسجدوا لله واعبدوا) یەکسەر لە حوشترەکەی دادەبەزێت و سوجدە بۆ ئەو بەلاغەت و عەزەمەت و گەورەیی قورئانە دەبات لە کاتێکدا موسڵمانیش نییە، زانایانی پێشین بە پێوەری زانستی ئەمڕۆ کەسیان بڕوانامەی دکتۆرایان نەبووە، کە بڕوانامەی دکتۆرا دەدرێت بە کەسێك بە شێوەیەکی یاسایی کاتێك لە زانکۆیەکدا تۆمارمو کتێبێکی مامناوەندی دەنووسێت، بەڵام ئەوان خاوەنی ئەو بڕوانامەیە نەبوون و خاوەنی سەدان کتێبن، خاوەنی بیرۆکەی داهێنان و ئەقڵیەتی بەراوردکاری و بناغەی گشت زانستەکانی ئەم سەردەمەن، گەرچی بەم پێومرانەی ئەمڕۆ بە شێوە ئەکادیمیەکەش ڕەدیش بکرێنەوە!

کەسێکی وەك ابن تەیمییە ئەگەر بە پێوەری زانستی ئەمڕۆ هەڵی بسەنگێنین چ بڕوانامەیەکی بدەینێ؟ کەسێکی وەك ئیمامی شافعی دەبێت بە چ فلتەرێکی ئەکادیمی هەڵی بسەنگێنین، زۆرن ئەوانەی توانایەکی پتەو و ئەقڵیەتێکی قوڵ و بیرێکی فراوان و توانایەکی بەهێزیان هەیە کەچی پێوەرە دروستکراوە ئەکادیمیەکان قەتیسیان دەکات بە خولانەوە بەدەور بازنەیەکی یاساییدا، لە کاتێکدا تواناکانی ئەوان لە ئاستی دروستکردنی یاسادایە.

کاتێك ماستەرنامەکەی بەڕێز ماکوان کەریم هاتە بەردەستم لەگەڵ خوێندنەوەی دەقەکاندا بۆ دونیایەکی تر دەفڕیم و لەگەڵ دێڕەکاندا بەشێوەیەك گشت

هەستەکانم تێکەڵی دەبوو زۆرجار بێزم لە پێوەرە ئەکادیمیەکان دەکردەوە کە بە ناچار دەبێت دەستکاری زۆر دەق و پەیڤی راست و جوان بکرێت بۆ ئەوەی لە قاڵبە ئەکادیمیەکدا بێت، چوون بۆ خۆشی توێژینەوەیەکی ئەکادیمیە، گرنگی ئەم توێژینەوە کاتێك بە تەواوەتی دەردەکەوێت کە بە ئاگاییەوە هەمووی بخوێنرێتەوە، توێژینەوەیەکی لەم شێوە جگە لەوەی گشت بنەماکانی زانستی تێدا پارێزراوە لە هەمان کاتدا بۆشاییەکی گەورەیە لە نێو کتێبخانەی کوردی و بە تایبەتی ئیسلامیدا کە ئەم توێژینەوەیە دەتوانرێت بە پایەیەکی گەورەی ئەو بۆشاییە ئەژمار بکرێت، ئەم توێژینەوە پێویستیەکی گەورەیە بۆ ئەو کەسانەی لە ئاستی قیادیدا خۆیان دەبیننەوەو لە واقعی ڕابردوو وە کاری خۆیان تێبگەن، هەروەك چۆن پێویستیەکی ویژدانیشە بۆ ئەو کەسانەی واقع و هەڵوێست و ناوەرۆکی ڕووداوە ئیسلامیەکان بە پێچەوانەوە دەخوێننەوە.

ئەو زانستەی لەم توێژینەوەدا کۆکراوەتەوە دەتوانین بڵێین وەك خوێندنەوەی کۆمەڵە کتێبێك وایە لە هەمان تایبەتمەندیدا، هەربۆیە زۆرێك لە دەقەکانی وەك مەتن وایەو پێویستە هەڵوێستەی لەسەر بکرێت و ئەو ئامانج و مەفهومانەش لە پشت دەقەکانەوە ئەقڵێکی کراوەو بە ویژدانی دەوێت وەك خۆی لێی تێبگات.

هەبوونی توێژینەوەیەکی لەم شێوە لەناو کتێبخانەی کوردیدا قورساییەکی وای پێ دەدات زۆر نییە گەر بڵێم حەق وایە بە ڕەنگێکی جیاواز دیاری بکرێت بەشێوەیەك لە دوورەوە بدرەوشێتەوە.

خاوەنی ئەم پێنووسە حەق وایە بەشێوەیەك دڵی بەم بەرهەمە خۆش بێت لەبیری فراوانکردنی هەمان باسدا بێت بۆ توێژینەوەی دکتۆرا.

ئەم بەرهەمە ناوەرۆکێکی گەورەیەی هەیە هیوادارم دیزاین و جۆری چاپ و ڕیکلام وا نەکات ئەم بەرهەمە وەك خۆی نەناسێنرێت.

د.عومەر عەلی

## پێشەکی:

گوتاری سیاسی ئیسلامی بۆ دامەزراندی دەوڵەتی ئیسلامی و ڕێکخستنەوەی دەسەڵات لەناو سیستەمی کۆمەڵایەتیدایە، یاخود دامەزراندنی حیزب و پارت و بزوتنەوەی ئیسلامیەکانە بۆ چوونە سەر کورسی دەسەڵات، ئەم گوتارە ئاینییە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تراژیدیا گەورەیەی کەجیهانی ئیسلام توشیبووە لەبەرامبەر ئیستعماری ئیستبدادی، داگیرکەری سەربازی، کەهاوردەی ڕۆژئاوا بوو لەناو گەلانی موسڵماندا لەمۆریتانیاوە بۆ سیبریا، تا ئێستاش بەردەوامە لەڕێگای سیکۆلارەکانیان و جەنگی فکریان بەرامبەر بەخودی ئیسلام و موسڵمانان، کاریگەریی خۆیان جێهێشتووە لەناو جیهانی ئیسلامیدا.!

ئەم داڕوخان و کەوتن و خورپەیەی جیهانی ئیسلامی لەدوای هەڵوەشاندنەوەی خیلافەتی ئیسلامیەوە دێت لەساڵی (١٩٢٤ز)، کەعەلمانیەت هەموو جومگەکانی دەسەڵات و حکومەت و سیاسەتی کردە مۆرکی خۆی، ویستی ئاینی ئیسلام بکاتە ئاینێکی کەهەنوتی.

لەدوای ئەو ڕووداوانەی کەڕوویدا، دروستبوونی دەوڵەتی نەتەوەیی و سەرهەڵدانی شۆڕشی پیشەسازی بووە هۆکاری ئەوەی کەگوتاری سیاسیی ئیسلامی هاوچەرخ لەدایك بێت، بەسەدان بیرمەند و توانامەندو لێکۆڵەرو چاودێری بۆ دروستبوو لەبواری فکری سیاسیدا، لەسەردەمی خیلافەتی عوسمانی چەند بزوتنەوەیەك هەبوون بۆ چاکسازیکردن لەدەسەڵاتی عوسمانییەکاندا لەسەدەی نۆزدەدا، بۆ بوژانەوەی سیاسەتی شەرعی و دامەزراوە ئیسلامییەکان، پاشان ئەو بزوتنەوە فکرییە، کەبوونی هەبوو لەناو جیهانی ئیسلامیدا، بەسەرکردایەتی جەمالەدینی ئەفغانی و محەمەد عەبدەو قوتابیەکانیان لەڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای جیهانی ئیسلامی، ئیتر دەیان بزوتنەوە و پارت و ڕێکخراو و دەستەو کۆمەڵی تری ئیسلامی دامەزران بەگوتاری ئیسلامی هاوچەرخەوە بۆ

رووبەڕوبوونەوەی عەلمانی، سەرلەنوێ بوونیادنانەوەی کۆمەڵگە و دەسەڵاتی ئیسلامی لەڕووی رەهەندەکانی ژیانەوە لەبواری ئابووری، سیاسی، هونەری، کۆمەڵایەتی...هتد.

ئەو رووبەڕوبوونەوەی ئاینی ئیسلام و ویستی نەیارانی بۆ پەراوێز خستنی، بووە هۆکاری سەرقاڵبوونی سیاسییە ئیسلامییەکان بۆ سەرلەنوێ داڕشتنەوەی شۆڕش و خەبات و سیاسەتی هاوچەرخی ئیسلامی بەگوتارێکی ئیسلامی نوێوە، بۆ بەرزکردنەوەی دروشمەکانی دەوڵەتی ئیسلامی و کارە باشەکانی لەڕووی رەوشت و سیاسەت و ئابووریی دوور لەمیتۆدو لاسایکردنەوەی پێشووتر، لەلایەن بیرمەندانی فکری سیاسی ئیسلامی.

کارێکی سەرسوڕهێنەر نەبوو کەبزوتنەوە ئیسلامییەکان دروستبوون لەناوچەکاندا، بەتایبەت لەناوچە عەرەبیەکەدا بزوتنەوەیەکی گەورەی وەك ئیخوان موسلمین دروستبوو بەسەرکردایەتی حەسەن بەننا لەساڵی (١٩٢٨ز) تاڕادەیەك هاوکات بوو لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی خیلافەتی ئیسلامی بەدەستی کەمال ئەتاتورك لەناو پایتەختی عوسمانیدا، بۆ دواجار ئەمە بووە هۆکاری ئەوەی کەسەرلەنوێ فیکرو فیقهی ئیسلامی تێکەڵبێتەوە بەسیاسەتی ئیسلامی و بانگەشە بۆ هەموو پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابورییەکان بکەنەوە بەدیدو تێڕوانینێکی ئیسلامی. چەند دەستێك هەبوو لەوسەردەمەدا وەك عەلی عەبدول رەزاق[1] کەویستی لەڕێگای نوسینی کتێبێکەوە بیسەلمێنیت ئیسلام هیچ پەیوەندیی بەسیاسەت و حومکدارییەوە نیە، ئەزهەرو زانایانی ئەو سەردەمە بەگشتی هاتنە دەنگ و بەرپەرچیاندایەوە، تەنانەت پلەی زانایی و بڕوانامەی

---

[1] ناوی (عەلی حەسەن ئەحمەد عەبدول ڕەزاق)ە یەکێك بووە لە زانایانی ئەزهەری میسری ، نوسەری کتێبی ئیسلام و بنەماکانی فەرمانڕەواییە .. لەساڵی ١٨٨٨ لە لادێیەکی پارێزگای مینا بەناوی ئەبو جەرج لە خێزانێکی دەوڵەمەند لەدایك بووە، یەکێك بووە لە حافز قورئانەکان ، ساڵی ١٩١٢ بڕوانامەی ئەزهەری بەدەست هێناوە ، پاشان چۆتە زانکۆی ئۆکسفۆردی بەریتانی بەشی ئابوری بەڵام تەواوی نەکردوە ، گەڕاوەتەوە بۆ میسر بەهۆکاری روودانی جەنگی جیهانی یەکەم ، پلەی حوکومی و پەرلەمانیو هەبووە ماوەیەك وەزیری ئەوقاف بووە.)

ئەزهەریان لێسەندەوە، لەهەمانکاتدا ئیسلام بەشێوەیەکی بەرچاو پەراوێزخرابوو لەڕووی حوکمەوە.

ئەم رووبەڕوو بوونەوەیەی عەلمانی، یاخود بڵێین: دەستی ڕۆژئاواو ئەو بزوتنەوە ئیسلامیانەی، کەدروستبوون لەجیهانی ئیسلامی بریتی بوون:

لەئەبوو ئەعلای مەودودی لەناوچەی هیندستان و پاکستان، نەورەسی لەتورکیا و کوردستان، شێخ عەبدولقادر لەمەغریب و جەزائیر، کەزیاتر بزوتنەوەیەکی سۆفیگەریی بوو، کاریگەریی سەنوسیەکانی لیبیای لەسەر بوو، بزوتنەوەی سەنوسیش لەلیبیا کاریگەریی باشی هەبوو، ئەمە بووە هۆکاری ئەوەی کەدەنگ بەرزبکرێتەوە بەهێنانەوەی فەرمانڕەوای ئیسلامی و بەرزکردنەوەی دروشمەکانی دەوڵەتی ئیسلامی، هێنانەوەی گوتاری سیاسی ئیسلامی لەڕووی ئابووریی سیاسی و خەبات و شۆڕش...هتد.

لەبەرامبەر ئەم گوتارەدا، گوتارێکی بەهێزتر، بوونی پەیداکردبوو بەناوی ئابووریی ئازادو پێشکەوتن و مەدەنیەتەوە خۆی دەسەپاند لەواقیعەکەدا. دەنگی ئەم گوتارە بەهۆکاری دەسەڵات و راگەیاندنەکانەوە بەهێزتربوو لەگوتارە ئیسلامییەکە، ڕۆژئاواش بەهەموو شێوەیەك پشتگیریی دەکرد بەهێزو چەك و پارەو ڕاگەیاندن..

شۆڕشی شیوعییەکان لەڕوسیا، فاشییەکان لەئیتالیا، شۆڕشی فەرەنسی بووە هۆی ڕاکێشانی سەرنجی نوخبەی سیاسی و سەرکردەکانی جیهانی ئیسلامی، بۆیە وورده وورده پەرەی سەند لەبەرامبەر گوتارە سیاسییە ئیسلامییەکاندا، لێرە وە جیهانی سێیەم دروستبوو، ئەزمونی ناسری لەمیسرو بومدینیە لەجەزائیرو تورانی لەتورکیا، حیزبی بەعث لەعێراق و سوریا، بورقیبە لەتونس، لەکوردستانیش بزوتنەوەیەکی چەپگەرایی و سیستەمی شاهەنشاهی لەئێران، ئەمانە هۆکاربوون بۆ دروستبوونی ئەو ئاڕاستەیە، کەدژی گوتاری سیاسیی ئیسلامی بوون.

لەناو کورددا هاوشێوەی ئەم جۆرە نوسینانەم نەدیبوو لەکتێبخانەی کوردی، بۆیە لەکاتی دەستنیشانکردنی تێزی ماستەرەکەم لەزانکۆی لەندەن بۆ زانستە

مرۆڤایەتیەکان خۆشحاڵ بووم، ئەو دکتۆرە بەڕێزەی کەسەرپەرشتی تێزەکەمی دەکرد هانیدام بۆ چاپکردنی و کردنی بەپەرتوکێك بۆ ئەوەی کەلێنێك پڕبکەینەوە لەکتێبخانەی کوردیدا، ئەویش دکتۆر عومەر عەلی بوو، کەزۆر ماندوو بوو لەگەڵمدا، ئەتوانم بڵێم هاندەری سەرەکیم بوو بۆ ئەوەی چاپی بکەین، جێگای خۆیەتی باسی برای خۆشەویسم کاك هەریاد بکەم ئەویش ئامادەیی دەربڕی کەچاپەکەی بگرێتە ئەستۆی خۆی، خوای گەورە پاداشتی هەردووکیان بداتەوە..

خوای گەورە لەمنیشی وەرگرتبێت و لەقیامەتدا ببێتە هۆکاری لێخۆشبوونمان و پێشکەشە بەوانەی کە لەپێناوی دامەزراندنی فەرمانڕەوایی ئیسلامدا گیانیان بەخت کردووە، خوای گەورە بیانکاتە شەهید.

ماکوان کەریم

٢١٠٦/٥/١٧ فرێدریکستاد ـ نەرویج

## ڕێبەری باس:

# گوتاری سیاسی

**یەکەم: گوتاری سیاسی چییە؟:**

گوتاری سیاسی شێوەیەکە لەشێوەکانی گوتار (گوفتار: قسەکار وەك هۆکارێك بەکاریدەهێنرێت بۆ ئامانجێك.. جا قسەکەر )تاکە، یاخود کۆمەڵ و دەستەو گروپە، یان پارت و ڕێکخراوە( لەڕێگای ئەو گوتارەوە دەیەوێت پەیوەندیی نێوان خەڵك و دەسەڵات گرێبداتەوە، خۆی بکاتە خاوەن دەسەڵات لەململانێی سیاسیدا، گوتاری تاك وەك پاڵێوراێك بۆ پەرلەمان، یان بۆ حکومەت، گروپ و دەستەکانی تر هەریەکە خاوەنی گوتاری خۆیەتی بۆ مەبەستێك، پارتەکان و ڕێکخراوەکانیش بۆ گرتنی دەسەڵات و حکومەت و پەرلەمان، هەموو ئەو پێکهاتانەی کەئاماژەم پێکردووە جەخت لەسەر گوتارەکەیان دەکەنەوە کەسوود بەخۆیان بگەیەنێن بۆ ئەوەی خەڵکی لەدەوریان کۆببێتەوە، لەپێناو بەردەوام بوونیان بۆ ناوەندی دەسەڵات و بڕیاردان لە حوکومەت و دەسەڵاتدا.. ئەم گوتارە سیاسیە بۆ بەرچاوڕوونی ئەو خەڵکەیە، کەئەو هێزە سیاسیە هەڵدەبژێرێت بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆی و گەلەکەی، هەڵبەت بەرژەوەندیی ڕێگاپێدراو[٢] .

**دووەم: ئامانجی گوتاری سیاسی:**

بەو پێییەی گوتاری سیاسی دەبێت گوتارێکی بڕواپێکراو بێت و جێگای متمانەی خەڵکی بێت، لەهەمانکاتدا خاوەن جیاکاری ئیمتیاز بێت، هەڵگری گوتارەکە دەبێت ڕاستگۆو دەمپاك و دەستپاك بێت تاخەڵکی بڕوای پێبکات، ئەو فاکتەرو

---

[٢] الدراسة والمناهج التعليمية، الخـطـاب السـياسـي، جامعة الاردن، كليه العلوم السياسيه.. المرحله الرابعة.. ص ٢٦٨،الطبعة الخامسه العشرون.. سنة ١٩٩٦

هۆکارانەی گوتارەکەی پێدەناسێنێت دەبێت پێکهاتەیەکی پارسەنگ بێت لەڕووی ڕاگەیاندنەوە کەبەزوویی بگاتە گەل، لەڕێگای وێنەو مۆسیقاو زمانی جەستەو یاخود ئەو کەرەستانەی کەهۆکارن بۆ گەیاندنی ئەو گوتارە بەگوێرەی رەوش و کات و شوێن[٣].

## سێیەم: کاری گوتاری سیاسی چیە؟:

ئەو شێوە ئیداریی و بەڕێوەبردنەیە کەچالاکی بیرو هزری مرۆڤ پێی هەڵدەستێت لە چوارچێوەی ئەو ئامانج و ستراتیژیەدا کەبۆی دیاریکراوە، ئەرکەکەی بەچوار تەوەردا دابەش دەبێت:

یەکەم: کاری گەیەنەرو هێنەری هەواڵ

دووەم: کاری بەرگری و نەیاری (ئۆپۆزسیۆن) و پێداگری

سێیەم: کاری شاردنەوەی ڕاستی

چوارەم: کاری دەستەبەرکردنی شەرعیەتە، یاخود داماڵینی شەرعیەتە. هەر کات گوتار کاریکرد لەسەر ئەم تەوەرە ستراتیژیانە ئەوا دەتوانین پێناسەی بکەین بەگوتاری سیاسی.

## چوارەم: تایبەتمەندی گوتاری سیاسی

نیشاندانی گوتاری سیاسی بەگوێرەی جێگا و رەوش و ئەو واقیعەی کاری تێدا دەکرێت زۆرینەیە، یاخود نەیار، ئۆپۆزسیۆن دەوترێت:

- تەنها پێداهەڵدان بەسیاسەت و کاری گشتی، یاخود بەپێچەوانەوە رەخنە لەسیاسەت دەگیرێت پێداگری لەسەر رەخنەکانی دەکات..

---

[٣] الدراسة والمناهج التعليمية، الخطاب السياسي، جامعة الاردن، كليه العلوم السياسيه.. المرحله الرابعة.. ص٢٦٩، سنة ١٩٩٦

بەرگریکردن لەو بەرنامە سیاسییەی کەهەڵبژێردراوە بۆ ئەو ڕەوشە گونجاوە لەگەڵیدا، پێچەوانەکەی ڕەخنەگرتن، یاخود ئەڵتەرناتیڤی دیدێکی نوێیە لەبەرنامەیەکی سیاسی نوێ..
- چاندنی گەشبینی لەناخی خەڵك و گەلدا بەگشتی وایان لێبکەیت کەمتمانە بەداهاتووت بکەن و دیدێکی سیاسی بزاڤخوازانە بخەیتەڕوو لەگەل زۆرینە دواکاری ئەو جۆرە سیاسەتە بن.

- بەگشتی دەتوانین بڵێین: تایبەتمەندی گوتاری سیاسی بریتییە لە:
یەکەم: ژێرخانێکی تیۆری گرنگ کەدرێژکراوەی ئایدۆلۆژیایەکی دیارکراوی تایبەتە.
دووەم: هەندێك لە لایەنەکان زمان و ئاخافتنی ئافرەت بەکاردێنێت بۆ گوتاری سیاسی، لەبەرئەوەی زوو وەردەگیرێت بەشێوەیەکی ئەرێنی و لەهزردا دەمێنێتەوە.
سێیەم: گرنگیدان بەڕەوانبێژی و کاریگەر دانانی بەشێوەیەکی سۆزداری (عاطیفی) لەسەر دڵ و دەروونی گەل کەبەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی ئەم جۆرە گوتارانە پیادە کراوە ، ڕۆشنبیرییەکی تایبەتە.
چوارەم: بەکارهێنانی وشەی جوان و ڕەونەقدار، دووبارەکردنەوەی وشەو ڕستەکان بۆ ئەوەی زیاتر کاریگەریی دروست بکات لەسەر دڵ و دەروونی خەڵکی. هەموو ژیان و گیانیان سەراپا داگیربکات و هانیان بدات بۆ هەوڵدان بۆ گرتنی دەسەڵات و تامەزرۆ بوون بۆ کاری سیاسی و هۆشیاریی سیاسی، تا بەئاسانی دەسەڵات بکەویتە دەستیان.

- پێناسەیەکی گشتی لەدەرئەنجامی باسەکانی پێشوو بۆ گوتاری سیاسی، بریتیە لە: مەزرایی هەڵوێست و ڕاوبۆچوون و بیرو هزرو ئەو وێستگە گرنگە سیاسیانەی کەکێشەو ڕووداوەکان دروستدەکات، یاخود لەئەنجامی سیستەمە

سیاسیەکان. جا سیستەمی ئیسلامییە، یان دیموکراسییە، یاخود دیکتاتۆریە.. هتد..

گوتاری سیاسی ئامانجی قەناعەت پێکردن و دواندنی خەڵکیە بۆ تەسلیم بوونیان بەراستگۆیی ئەو بانگەشەیە، بەو بەرنامە سیاسیە دەیکەن، بۆ دۆزینەوەی هەلی کار بۆ خەڵکی بەگشتی و دامەزراندنیان و طەوزیف کردنی تواناکانیان لەبوارە جیاوازەکانداو بەبەڵگەو دیکۆمێنتەوە.. بەگەڕخستنی پرۆژەی نوێ بۆ خۆشگوزەرانی گەل، جا لەرێگای پاڵێوراوەکان بێت، یا حیزبەکانەوە ئەم گوتارە دەخرێتە ڕوو. [٤] ئەویش چەند پێکهاتەیەکی سەرەکییە،

دەبێت هەمیشە بەنوسراوی وەك نامە لەبەردەستدا هەبێت و کۆپی بدرێتە داواکارەکان.

دەبێت پاڵێوراوەکان یاخود حیزبەکان خۆی بناسێنیت (زیاتر ئەم بوارە پاڵێوراو دەگرێتەوە) ئاگاداریان بکاتەوە بەتواناو چالاکییەکانی..

خەڵکی دەبێت متمانەی بەپەیام و گوتارەکە هەبێت..

ئەو گوتارە سیاسییە دەبێت لەحەوت بەشدا دەستنیشان بکرێت،

یەکەم، سەرەتا بەخۆناساند دەست پێدەکات وەك (سیڤی).

دووەم، پەیوەندیی و خۆگەیاندن بەزۆرترین خەڵك لەرێگای دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە.

سێیەم، دەستنیشانکردنی کێشەکان، باسکردنی ئەو کێشانەی، کەگەل ئازاری پێوەخواردووە بەشێوەیەکی ڕاستگۆیانە..

چوارەم، دەستنیشانکردنی چارەسەرکردن، بەپرۆژەیەکی تۆکمەو والآکار لەبەردەم گەلدا.

---

[٤] گوتاری سیاسی حیزبی ڕاپەڕینی ئیسلامی تونسی، پیرمو پرۆگرامیان..ل٣٣ ساڵی ٢٠١١

پێنجەم: دیدو تێڕوانین و جیهانبینی ئاشکرا بکرێت، بۆ ئەوەی هەموو لایەك بۆچوونەکان بەئاشکراو بێ پێچ و پەنا بیخوێننەوەو خەڵکی لەنادیاری و تەماوی بوون نەترسن..

شەشەم: بانگەوازکردن بۆ بزاڤ و گۆڕانکاریی، بۆ ئەوەی بتوانرێت هەمیشە ڕۆحێکی شۆڕشگێڕیی لەناو خەڵکیدا بچەسپێنرێت..

حەوتەم: هەموو باسەکان دەبێت سەرەتایەکی هەبێت و ناوەندی هەبێت، تا لەکۆتایدا دیدو بۆچوونی روون بێت و شتێکی خستبێتە بەردەم گەل و بزانن چی داواکردوە[٥]

لەوڵاتی ئێمەدا هەندێك حیزب هەیە تا ئێستاش نازانن چیان دەوێت و داوای چی دەکەن و بۆچی حیزبن!..

**گوتاری سیاسی لەڕووی زمانەوانی و زاراوەوە:**

**١: گوتار لەڕووی ڕێزمانییەوە:**

سەرچاوەکەی: گوفتارە یاخود وتارە، یان ئاخافتنە، وتنە، گوتنە، قسەکەرە گوتن، گۆیە، وتووێژکردنە، هەموو ئەمانە ئاماژەیە بۆ گوتار.. لەزمانی عەرەبیدا وشەی گوتار بۆ (الخطاب) بەکارهاتووە، ئیبن المنظور لە(لسان العرب)دا هەمان ئاماژەی کردووە، پێدەچێت وشەی گوتاری سیاسی کە کورد بەکاریهێناوە لەیەك چونێك هەیە لەو نێوەندەدا، پاشان فارسیش هەمان شێوە و میتۆدی بەکارهێناوە لەڕووی زمانەوانیەوە[٦].

---

[٥] بەرنامەی سیاسی و بەشێك لەگوتاری سیاسی حیزبی ڕاپەڕینی تونسی، ل٣٤ ساڵی ٢٠١١

[٦] لسان العرب: ابن المنظور... لەکتێبی الخطاب السیاسی العربی چاپی ١٩٧٩ لاپەرە١٨ چاپی دووەم -دا دەڵێت: ولقد جاء مصطلح الخطاب في المعاجم العربية ومنها (لسان العرب) ولـم يبتعد (ابن منظور) في تحديد مفهوم الخطاب، عن دلالة الكلام ومعاييره، وهو الضبط الذي يذهب إليه

### ٢: گوتار لەڕووی زاراوە

گوتار: دیاردەیە، وتەزا، یان پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتیە، بەواتایەکی دیکە پرۆسەو ڕموتێکە، کە لەکۆمەڵگاوە سەریهەڵداوە، بابەتە دابڕاوەکان گوزارەو مەسەلەکانەو وشەو ڕستەکانە، پەیوەندیان بەو خاڵەوە هەیە، کەبابەتە گەیەنراوەکان و گوزارەکان و کەی، کێ، چۆن و لەلایەن چ کەسێکەوە، لەدژ یان بەلایەنگیریی لەچ کەسێکەوە، یان بەشتێك کەڵکی لێوەرگیراوە[٧] .

### ٣: گوتار لەڕووی مێژوویەوە

ئەم زاراوەیە لەبنەڕەتدا ڕۆژئاواییە، واتە: چەمکی گوتار دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی چواردە لەزاراوەی فەرەنسی (Discurrer) هاتووە، پاشان لەزاراوەی لاتینی (Discurs ـ us) وەرگیراوە، بەمانای: ئاخافتن و وتوێژکردن و لەزاراوەی (Discursum/ Discurrer) وەرگیراوە بەواتای خۆدزینەوە، گونجاندن و لای سەرو ڕاکردنەوە... هتد وەرگیراوە.

نوسەر: واتە: وشەکە تجریدکراوە[٨] .

---

كثير من علماء اللغة قديما وحديثا.. وفي هذا الشأن يقول ابن منظور: الخطاب مراجعة الكلام، وقد خاطبه مخاطبة وخطابا و هما يتخاطبان .

-لەپێگەی راسخونی فارسیدا، بەناونیشانی.. گفتمان چیست نوسینی: عەلی ئەکبر ئەمینی دەڵێت:

گفتمان در لغت به چند معنی آمده است: مباحثه و مجادله، مسیر و جریان و راه و روش، گفتگو و مکالمه، عمل، قانون، پرده نمایش، نماد، قدرت، توان و استعداد تفکر و... (٢) اما این واژه همین که وارد متون تخصصی می شود و مفهوم اصطلاحی به خود می گیرد، پیچیده تر و گسترده تر می شود.

[٧] فەرهەنگی سیاسی نوێ ٢٠٠٦: ئامادەکردنی زاهیر محەممەدی و یاسین حاجی زادە. ل-٥٠٨ چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەولێر.

[٨] فەرهەنگی سیاسی نوێ ٢٠٠٦: ئامادەکردنی زاهیر محەممەدی و یاسین حاجی زادە. ل-٥٠٨ چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەولێر.

**٤: گوتار لەڕووی فەلسەفییەوە**

گوتار ئامانج و ڕۆڵێکی چەند لایەنەی هەیە، کەیەکیان بریتییە لەدورخستنەوەی چەمکی "خود" لەبواری فەلسەفە، گوتار لەدەیەی(١٩٧٠)بەملاوە لەشێوەی جیاوازدا دەردەکەوێ، کەگرنگترینیان شێوەی "شیکردنەوەی گوتار"ە (Discourse Analysis) کەوەك ئامرازێکی میتدۆ لۆژی نوێ لەبواری زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکاندا سەریهەڵداوە.

**٥- سیاسەت لەڕووی زاراوەی زمانەوانییەوە**

سیاسەت، شێوازی ئەو دەستکەوت و قازانجانەیە، لەپلەی یەکەمدا بریتییە لە کاروباری دەوڵەت، ڕێبازی دەوڵەت و بەڕێوەبردنی وڵات، دیاریکردنی شێوەکانی ئەرك و ناوەڕۆکی چالاکییەکانی دەوڵەت.

وشەی سیاسەت بەمانا یاساییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ وشەی یۆنانی کۆن کەبرتییە لەPolitique ؛

لەهونەرو دەستورو سیستەمی بەڕێوەبردنی شارو دانانی هاووڵاتی و مافەکانی لەجێ و ڕێی شیاوی خۆی. (ڕایدار لارسون)ی سویدی و مامۆستای دەوڵەتناسی لە زانکۆی سوید، لەکتێبەکەیدا (ئایدۆلۆژییە سیاسییەکانی سەردەمی ئێمە) پێناسە ی سیاسەت دەکات و دەڵێ، ((سیاسەت بریتییە لەململانێی نێوان گروپە جۆربە جۆرەکان دەربارەی چۆنیەتی بەڕێوەبردن و ڕێکخستنی کۆمەڵگە)).

ئەو ململانێیەش خۆی لەخۆیدا ڕەنگدانەوەو تەفسیرکردن و ناوەڕۆکی بڕیارە سیاسیەکانە، ململانێی نێوان نەتەوەکانە لەسەر کۆنترۆلکردنی وشکایی و مافی سوود وەرگرتن لەبەرهەمی ئاوی ئەمە سیاسەتە، ململانێی ناوخۆو تاك بەتاکی نەتەوەکان خۆشیان دەربارەی مافی تاکەکانی کۆمەڵگە هەر لەمافی هاووڵاتییە وە بیگرە تا ئەگاتە یاساو ڕێسای کارکردن و زەریبە، ئەمەش سیاسەتە.

کارکردنی پێکەوەیی ڕێکخراوە پیشەییەکان بۆ دیاریکردنی موچەو کرێی کرێگرتەو ڕێسادانان بۆی سیاسەتە، ململانێ بۆ بەڕێوەبردنی ڕێکخراوێك سیاسە تە.

ناوەڕۆکی سیاسەت هێزو توانایە (قودرەتە)، قودرەتیش بۆ هێنانەدی ویست و ئارەزووە.

١٠٠٪ بەرەو کۆنترۆڵکردنی دەزگاکانی دەوڵەت گرنگترین ئامرازبوون بۆ کۆنترۆڵکردن و بەیاساکردنی هەڵسوکەوتی مرۆڤ لەکۆمەڵگەدا.

ئەو گروپەی دەسەلاتی دەوڵەت دەگرێتەدەست دوو دەزگا دادەمەزرێنێت، یەکێکیان بۆ یاسادانان و ئەوی تر بۆ سزادان بۆ ئەو کەسانەی کە ملکەچ نابن.

ناوەکانی سیاسەت، سیاسەت کۆمەڵێك ناوی لێنراوە وەك، سیاسەتی پارێزگاریی، سیاسەتی ئازاد، سیاسەتی ڕاسترەو، سیاسەتی چەپرەو، سیاسەتی ئابووری، سیاسەتی کۆمەلایەتی، سیاسەتی جەنگ، سیاسەتی ئۆپۆزسیۆن... هتد[٩]

## گوتاری سیاسی و دیدگایەکی نوێ

ئەگەر پێشتر لەسەر باس و خواستەکانی گوتاری سیاسی بیروبۆچوون و سەرچاوەکانمان وەك خۆی گەیاندبێت، هیچ بیرو بۆچوونێکی نوسەر تێکەلاو نەبووە بەباسەکە، بەلام بۆ ئەوەی خوێنەر ئەو هەستەی لادروست نەبێت، کەتەنها لەم باسەدا دەمانەوێت ڕاو بۆچوونەکان بگوازینەوە کتێبێکی لێدروست بکەین، یا ماستەرنامەکە وانیشان بدرێت، کەئەکادیمیەو سەرچاوەی زۆری تێدا بەکارهاتووە، بەدڵنیاییەوە دەست بەستراو نەبووین لەسەرچاوە، بەلام بیروبۆچوونی نوسەر سەبارەت بەم باسە و ئیجتیهادی نوێ لەسەر ئەم باسە

[٩] مدخل لدراسة القانون -تعريف القانون- وخصائص القاعدة القانونية- دعبدالكريم الطالب .. ل١٦

خراوەتە ناو ئەم كتێبە، هەر بەندێك لەم پەرتووكە، كەكۆتایی دێت بۆچوونی نووسەر خۆی والا دەكات، وتەی تایبەتیمان هەیە لەسەر باسەكان، هزری ئێمە نمایش دەكات..

گوتاری سیاسی؛ ناسینی هەموو كەسێك و گەلێك و وڵاتێك و سەركردەیەكە، پاشان دەگوازرێتەوە بۆ حیزب و رێكخراوو ئەندامەكانی، كەپێكهاتووە لەسێ توخم، هەرسێكیشیان پەیوەستن بەیەكەوە؛

توخمی یەكەم: كەسایەتی بوونە

توخمی دووەم: نیشتیمانی بوونە

توخمی سێیەم: ناسنامەی بوونە

توخمی یەكەم: كەسایەتی بوون، هەموو گوتارێكی سیاسی رونكردنەوەو راڤەكردنی (تفسیر)ی ئەو كەسایەتیەیە، سەركردەیە، یاسەرۆكی وڵاتە، یان كاربەدەستە، كەكۆمەڵێك، یا رێكخراوێك بەرێوە دەبات هتد..

چەند نموونەیەكی مەیدانی:

جەمال عەبدولناصر: گوتاری سیاسی روون و ئاشكرابوو دژی ئیمپریالیزم و هەموو داگیركەرێكی ئیستعماری ئیستبدادی و نەتەوەیی بووە.

ئەنوەر سادات: گوتاری سیاسی زیاتر ئیسلاحی و هێمن و دروستكردنی پەیوەندیی بوو لەنێوان وڵاتاندا..

حوسنی موبارەك: گوتاری سیاسی پارێزەری هەبوو لەزانستی سیاسیدا پێی دەگوترێت سەرۆكی پاسەوان، ئەوەی هەیەتی نایەوێت لەناو بچێت و چالاكی نییە، نەزیاد دەكاو نەكەم.

لە عێراقدا سەدام گوتارێكی سیاسی مۆبۆكراتی هەبوو سەرۆكێكی مۆبۆكراتی بوو، واتە: دەسەڵاتێكی سەرسەریانەی هەبوو گوتارەكەی نادیارو شەڕانگێزی و فراونكردن بوو..

**ئێران: گوتاری سیاسی شیعەنشینی و پاوانخوازی و فراوانکردنە.**

**لە کوردستاندا بەگشتی:**

- پارتی دیموکراتی کوردستان: گوتاری سیاسی هێشتنەوەی بنەماڵەی بارزانیە وەك خاوەن شکۆیی، کەپەیوەستکراوە بەکوردستانەوە. واتە: گوتارە سیاسییەکەی نەخشاندنی بارزانی وەك کەسایەتیەکی ڕەمزی لەکوردستاندا بوونی ئەو گرێبەندە بەکوردستانەوە..

- پارتی کرێکارانی کوردستان: گوتاری سیاسی بێجگە لەخۆی بڕوای بەبوونی هیچ لایەکیتر نیە. ئەوانیتر دەبێت شوێنکەوتوی بن واتە: پاشکۆی بن. ئەو پێیوایە: ڕزگارکەرو مەسیحی کوردانە.

- یەکێتی نیشتیمانی کوردستان: گوتاری سیاسی لیبراڵە حەزی بەفراوانخوازی هەیەو دەیەوێت ئەجیندای خۆی بسەپێنێت. شەڕانیە..

وەك کەسایەتیش هەریەك لەسەرکردەی ئەو سێ حیزبە خاوەن گوتاری سیاسی تایبەتی خۆیانن..

بۆ نموونە: تاڵەبانی بڕوای بەبلۆکی شەرقی هەیە. گوتاری سیاسی ئەو خۆی وانمایش دەکات. کەکورد هاوپەیمانی ئێران و چین و روسیا بێت لەکۆتایدا گرموەکە دەباتەوە..

مەسعود بارزانی: پێچەوانەی ئەم گوتارە کاردەکات. بەئاڕاستەی ئەمریکاو ڕۆژئاوا بەگشتی

عەبدوڵڵا ئۆچئالان: گوتارێکی شۆڕشگێڕیی لەفەلسەفەی خوددا هەیە. کەناسراوە بەفەلسەفەی ئاپۆچی کە لەسەر خودو تاکی کۆمەڵگەی کوردی کار دەکات. تاڕادەیەك گوتارە سیاسییەکەی لەجیڤاراو کاسترۆ وە نزیکە.

لێرەدا باسی کەسایەتی ئیسلامی و حیزبەکانی ئیسلامی ناکەین لەبەندەکانی داهاتوودا لەناو باسەکانی گوتاری سیاسی ئیسلامیدا لەوێدا زیاتر شیدەکەینەوە بەپشتیوانی خوا.

توخمی دووەم: نیشتیمانی بوون، هەموو گوتاری سیاسییەك لەسەر بنەمای نیشتیمان و خاكێك خۆی دیاریدەکات و نرخ و بەهای ئەو نیشتیمانە گوتارە سیاسیەکە دیاریدەکات، هێزو توانای گەلەکە دەرئەنجامی گوتاری سیاسیەکان دەبێت، ئەگەر هەمەچەشنی ئایدۆلوژیاو بیروباوەڕی جیاواز بن، وەك وڵاتی سیستەمە دیموکراسیەکان..
ئەگەر خاك نەبێت لەسەر چ بنەمایەك کار دەکەیت؟ ئەوکات دەبێت لەجێی خاك، ئوممەت جێگرەوەی بێت، هەرچەندە ئومەتیش لەسەر بنەمای بیروباوەڕ خۆی نمایش دەکات وەك ئوممەتی ئیسلامی و ئوممەتی مەسیحی و جولەکە، کە لەئێستادا . ئەم کارە واقعی نیە لەناو ئاینەکانی تردا، تەنها لەئیسلامدا بوونی ماوە، کەتاڕادەیەك کاری لەسەر دەکرێت لەلایەن هێزە ئیسلامییە ئوصولیەکانەوە، ئەویش لەبەندەکانی تردا باسی ئەو گوتارە سیاسییە دەکەین.

توخمی سێیەم: ناسنامەیە، ئەویش کوردبوونە، یان تورکمان بوونە یان ئاشوری، یان هەر نەتەوەیەکی تر گوتاری سیاسی دیاری دەکات.
هەموو گوتارێکی سیاسی ئەگەر لاواز بوو، یاخود بەهێز بوو، ڕەنگدانەوەی ئەو گەلانەیەو هەمیشە گوتاری سیاسی بوونی هەیە، زۆرجار لەکەسایەتی سەرۆکدا خۆی نمایش دەکات، یان گەلەکە خۆی، زیاتر لەوڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناویندا لەکەسایەتی سەرۆك خۆی دەنوێنیت، کەئەمە زۆرجار کاریگەریی خراپی دەبێت و خەڵکی چاوەڕوانی ئاڕاستەی سیاسییە لەسەرۆکەکانی، لەڕۆژئاوا لە گەلەکەدا خۆی نمایش دەکات لەتوانا و هێزە دامەزراوەکانی..

گوتاری سیاسی ئەو واقیع و رەوشە پێچەوانە دەکاتەوە، کە گەل و دەسەلاتی سیاسی تێیدایەو تەرجومەی ئەو هەنگاوانەیە، کەسیاسی و حیزب و ناوەندەکانی بڕیار ئەدەن!
کەواتە گوتاری سیاسی بەرزو نزمی و بەهێزو لاوازی دەکات بەگوێرەی ناوەندی بڕیارو سەرۆکی وڵات، یاخود ئەو دامەزراوانەی کەبوونی هەیە لەدموڵەتێکدا.

لێرەدا پرسیار ئەوەیە، ئەگەر دموڵەتێك، یاخود لایەنێك گوتاری سیاسی لاوازبوو بۆ هەڵسانەوەی پێویستی بەچی دەبێت؟
لەوەلامدا، چەند خاڵێك دەستنیشان دەکەین بۆ نوێکردنەومو بەهێزکردنی گوتاری سیاسی لەکاتێکدا کەلاواز و پوکاوەیە..

خاڵی یەکەم: خوێندنەومو توێژینەوە لەسەر ئەو گوتارە سیاسییەی کەپێچەوانەی ئاراستەی سیاسی و مەنهجی کاری وڵاتەکەیە، یاخود حیزب و ڕێکخراوەکەیە.
بەو پێیەی تۆش ئاراستەی گوتاری سیاسی خۆت دەگۆڕیت، خاڵە لاوازەکانی بەرامبەر هەلاوێر دەکەیت، لەسەر بنەمای وەلامدانەوە چاکسازی بوونیادی گوتارێکی سیاسی نوێ دادەڕێژیت، سەرلەنوێ گوتارە سیاسییەکە ئەپدەیت دەکەیتەوە.

خاڵی دووەم: توێژینەومو گەڕانە لەسەر خاڵی هاوبەش بۆ بەهێزکردنی گوتاری سیاسی، واتە: دۆزینەوەی زەمینەی هاوبەش بۆ کارکردن، لەئێستادا تاکە سیستەمی سیاسی لەجیهاندا، کەنازناوی باشی هەیە دیموکراسیە، ئەگەر بڕوات بەدیموکراسیش نیە، پێویستە مامەڵەی لەگەڵ بکەیت، بەلام مەرج نیە تەبەنی بکەیت وەك یەکگرتوی ئیسلامی لەهەرێمی کوردستان، دەتوانرێت وەك بزوتنەوەی ئیسلامی مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت، هەڵگرتنەومو مامەڵەکردن دوو چەمکی جیاوازن، هەڵبەت ڕووی دەقەکان لەئیسلامیەکانە، کەبڕوایان بەدیموکراسی نییە، بەلام لەئێستادا هیچ حیکمەت و ئازایەتییەك نیە دژایەتی

بکەیت لەکاتێکدا کۆمەڵگای نێودەوڵەتی وەك ئەزموون هیچی تری لەبەردەستدا نیە بۆ مامەڵەکردن لەجیاتی دیموکراسی، واتە: (بەدیل)، کەواتە ئەم خاڵە گرنگە کەزەمینەی هاوبەش بدۆزیتەوە لەڕووی مافەکانی مرۆڤ و کاری مەدەنی و خاڵە هاوبەشەکانی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بەگشتی. دوو نموونەی باش هەیە لەجیهانی ئیسلامیدا، کەخۆیان گونجاندوە لەگەڵ کۆمەڵگای نێودەوڵەتیدا زۆر پێشکەوتوون لەڕووی گوتاری سیاسیەوە، ئێرانی شیعەنشین و تورکیای ئۆردۆغانی، کەهەردووکیان لەسەر ئیسلام ماڵن. پێچەوانەی ئەوانیش قاعیدە و تالیبان، کەگوتاری سیاسی ئەم ڕێکخراو و دەولەتانە زۆر توندمو دابڕاوە لەهەموو زەمینەیەکی هاوبەش، ئەویش هەر لەسەر ئیسلام ماڵە. هەروەها تاڕادەیەك ئیخوانی میسر لەڕێگای سەرۆکی پێشوی میسری محمد مورسی کە لە ڕێگای کودەتاوە لابرا، کەبەداخەوە پەلەیانکرد لەزەمینەی هاوبەش بۆ گۆڕینی دەستور لەمیسردا، بۆیە بەزوویی ئینقلابیان بەسەرداکرا، دیموکراتیەکەش لەو وڵاتەدا ئە تککرا.

هەمیشە گوتاری سیاسی دەبێت گوتارێکی ئەقڵانی بێت، بۆ دەرمووەی خۆت لەسەر بنەمای ڕێزبێت، گوتاری سیاسی لەسەر بنەمای خۆشەویستی و ڕۆمانسێتی دانامەزرێت، کەهەندێك پێیانوایە سیاسەت ڕۆمانسێتە، لەڕاستیدا نوسەر- پێیوایە هیچ پەیوەندی بەڕۆمانسیەتەوە نیە، چونکە زۆرجار سیاسەت هەڵگیرسێنەری شەڕو ئاژاوەیە، هەرچەندە ئەوە باسێکی دیکەیە تەنها ئاماژەیەی بۆکراوە، مەبەست لێرەدا ئەوەیە لەگوتاری سیاسیدا دەبێت بزانرێت، هەمیشە دۆست و نزیکەکان لەبیر بێت، نەك لەکاتی قەیراندا ڕوویان تێبکرێت ئەگەر هەڵەت لەبەرامبەرکردن، لەلات ئاسایی بێت داوای لێبوردن بکرێت، چونکە گوتاری سیاسی تۆ بەهێزدەکات، گوتاری سیاسی لەزانستی سیاسیدا هەندێکجار پێیدەگوترێت دبلۆماسیەتی گەل، وەك ئاماژەش بۆ ڕێزگرتن لەبەرامبەر لەزانستی سیاسیدا ئەوە بەڕەوشتی سیاسی ناسراوە، گوتارە سیاسیەکە بەهێزتر دەکات، دەبێت ڕەچاوی زەمینەی هاوبەش بکرێت، تەنها بەرژەوەندی خۆت لەبەرچاو نەگریت، سیاسەتی پراگماتیکی گوتاری سیاسی توشی لەرزۆکی و

هەڵدێری دەکات، دەبێت گوتارێکی زیرەکانە بێت و ڕەهەندەکانی کۆمەڵگای تێدا دەستنیشان کرابێت.

خاڵی سێیەم: بەکارهێنانی زمانی بێگانە بۆ گوتاری سیاسی، بۆ ناو گەلی خۆت بەکارهێنانی زمانی ناوخۆ (محەلی)، بۆ زیاتر تێگەیشتن لەسەر ئەم باسە بەنمونەیەکی مەیدانی نوسەر ڕوونی دەکاتەوە، لەمانگی مەی ساڵی ٢٠١٤ڕیپۆرتێکمان لەسەر ڕەوشی عێراق کرد لەگۆڤاری (بزاڤ) بەناونیشانی (عێراق و دیموکراسی خەیاڵ پلاون و دەرئەنجامەکەی سێ پارچەبوونە) لەوێدا باسی زمواجی سیاسی کوردو سوننەو شیعەمان کردبوو، ئەم دەستەواژەیە لەئەوروپادا دەستەواژەیەکی دروستە هەموو سیاسیەکان بەکاریدەهێنن، واتە: پەیوەندی هەمیشە، بەڵام لەناو کورددا وشەیەکی نامۆیە، بگرە بەبێئەدەبی و بەزمانی ناشرین هەژمار دەکرێت، لەڕاستیشدا ڕاپۆرتەکە ئاڕاستەی هەرێم بوو، نەك بەزمانی ڕۆژئاوا نوسرابێت، کەواتە لەدەرئەنجامی ئەم باسەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ، کەسیاسیەکان دەبێت بزانن ئاڕاستەی گوتاری سیاسی بۆ ناوخۆو دەرموە چۆن ئەدا دەکەن و چۆن دەیگەیننە زۆرترین خەڵك..

لێرەدا بەرپرسان، یاخود کۆمەڵ و ڕێکخراوو حیزبەکان دەبێت بتوانن، کەبەزمانی خەڵك بدوێن و بزانن چۆن ئاڕاستەی گوتارە سیاسییەکە دەکەن، بۆ نموونە لەمیسردا ئێستا دوو گوتاری سیاسی هەیە، گوتاری سیاسی ئیخوان موسلمین، کەبەتەواوی دژی گوتاری سیاسی دەوڵەتی میسرە، بگرە لەڕۆژئاوادا گوتاری سیاسی ئیخوان زۆر بەهێزترە لەدەزگاکانی دەوڵەتی میسر بەسەرۆکایەتی محەمەد عەبدولفەتاح سیسی، چونکە دوو جیلی ئیخوانی پەروەردە بوون لەڕۆژئاوادا بەئەقڵی ڕۆژئاوایی گوتاری سیاسی ئیخوانی دەگەیەنن، وەزیری دەرموەی میسر ئینگلیزیەکی باش دەزانێت لەڕووی ڕێزمانەوە، هیچ ناتەواوی پێوە دیار نیە، بەڵام ئەوەی لەمێشکیدایە بەعەرەبی دەیکاتەوە بەئینگلیزی ئەم زمانە لەناو زمانی سیاسی ڕۆژئاوادا هیچ مانایەکی نیە، بۆیە گوتارە سیاسییەکە بەلاوازی دەمێنێتەوە.

خاڵی چوارەم: دوورکەوتنەوە لەگوتاری «شیفۆنی» گوتاری شیفۆنی واتە: خۆتت پێ زاناترە لەهەموو گەلانیتر لەکاتێکدا هیچ بەرهەمێکت نیە. نموونەی گەلی کورد، ئەفغان، سۆماڵ.. هتد

ئێمەی کورد زۆرجار خۆمان پێ شارەزاترە لەتورك و فارس و عەرەب، هەرچەندە هۆکاری دەروونی ئەم بوارە دەگەڕێتەوە بۆ داگیرکردنی دراوسێکانمان، کەتەنراوین بەفارس و عەرەب و تورك، لەکاتێکدا ئەوان لەزۆر ڕووەوە لەکورد پێشکەوتووترن، هەرچەندە ئەم جۆرە گوتارانە کاریگەریی بۆ سەر تاك و کۆمەڵگە دەبێت و ئەنجامی باشی لێ دروست نابێت و تەندروست نیە، بەڵکو پێچەوانەکەی وایە، کەخەڵکی و خۆت بەکەم مەزانە، کەیەکێکە لەبنەماکانی لەگوتاری سیاسی، خوای گەورەش دەفەرموێت: لەقورئاندا هیچ کات کار و شتی خەڵکی بەکەم مەزانن (ولا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءهُمْ) ٨٥ الاعراف. بەداخەوە گەلی کورد ئەو گەلەیە کەزۆرترین شیعرو هۆنراوەو پەخشان و گۆرانی هەیە بۆ کوردو کوردستان، بەڵام هیچ کارێکی مەیدانی نیە بۆ گەلەکەی، کەکوردو کوردستانە، هەڵبەت بەشێوەیەکی گشتی باسی دەکەین، بەڵام نموونەی باشیش هەیە لەناو گەلی کورددا.

خاڵی پێنجەم: بەکارهێنانی تەکنەلۆجیای سەردەم بۆ پەرەپێدانی گوتاری سیاسی، کەبەداخەوە ئەمەش لەناو کورددا زۆر دواکەتووە بەگشتی لەناو جیهانی ئیسلامی بەشێوەیەکی بەرچاو دواکەوتووە، بەتایبەتتر لەناو ئیسلامیەکاندا.

بیڵ کلینتۆن: لەوتاریکی هەفتانەیدا بۆ ڕادیۆی واشنتۆن گوتی: ((هەمیشە لەنێوانی دوو ئەمریکیدا هیندیەك هەیە لەبوارەکانی ئایتی و دەزگاکانی ئینتەرنێتیدا)).

کەواتە دەبێت گوتاری سیاسی بچێتە ناو دنیای تەکنەلۆجیاو دەزگاکانی ئینتەرنێتیەوە لەو ڕێگایەوە بتوانێت بیگەیەنێت، چونکە ئێستا تەکنەلۆجیا زۆر دڕندەیە، ئەگەر فریای ئەو دڕندەییەی نەبیت دەتخوات، لەجیهانی خۆیدا

ناتهێڵێت، بۆ نموونە ئێستا ئیخوان موسلمین لەمیسردا توانیویەتی لەڕووی تەکنەلۆجیایەوە کاریگەریی باش دروستبکات لەشەقامی میسریدا، ئەگەر بەرپرسێك لێدوانیکی سیاسی، یاخود هەر لێدوانێك بدات، بەیەك جار پێنج بۆ دەهەزار کەسی ئیخوان وەڵام ئەداتەوە! واهەستدەکەیت، کەئیتر ئەوە رای شەقامی میسریە، بەو شێوەیە ئیخوان گوتاری سیاسی خۆی دەگەیەنێت، هەوڵدانە بۆ گەیاندنی گوتارەکەت لەڕێگای تەکنەلۆجیاوە.

شەشەم: گوتاری پلانگێڕان لەدژت (موئامەرە کردن )، ئەمە هەندێك کەس دەڵێن: ((هەمیشە ئیسلامیەکان بیریان لای بیری موئامەرەو پلاندانانە))، کەلەڕاستیدا بەشێکی قسەکە راستەو بەشێکیش چەواشەکارییە، لەبنەڕەتدا ژیان بۆ خۆی ململانێیە، لە تیۆری مارکسیدا ناوی نراوە ململانێی چینەکان، لە تیۆری فرۆیدیو درۆکایمیدا ((ململانێی سێکسە))، پاشان فرانسیس فۆکۆیاما و هامتنتۆنگ پێیان وایە ((ململانێی ژیارو شارستانیە و کۆتایی مێژووە ))، سەید قوتب ـ ڕەحمەتی خوای لێبێت پێی وایە: ((ململانێی نێوان کوفرو ئیمانە))، هەندێك گوتاری موئامەرە بۆ پشووی خۆی بەکاردەهێنێت، پێی وایە: «من هەمیشە موئامەرەو پلان لەدژم دەگێڕێت، چیبکەم دەسەڵاتم نیە؟»

ئیتر بەئیسراحەت پاڵی لێدەداتەوە ناجوڵێت، ئەمە لەڕاستیدا کارەساتە، ئەگەر تیۆری موئامەرە بەم شێوەیە ڕاڤەبکرێت ڕەخنەی لێبگیرێت ئەوە ڕاستە، گومانی تێدانیە خوای گەورە باسی ئەوە دەکات، کەدەفەرموێت: هەمیشەو بەبەردەوامی خەڵکی دژتان پلان و موئامەرە دەگێڕن و موئامەرەو پلانیان هەیە دژتان، ئەمەش بەبروای نوسەر کاریکی ئاساییە، چونکە دەبێت وابێت ئەگەر وانەبێت ژیان ناڕوات، ئەگەر خوای گەورە بەزەیی بەموسڵماناندا نەیەتەومو نەیانپارێزێت بەزاتی پیرۆزی خۆی ئەوا ئەوەندە بەهێزە پلانی دوژمنانی ئیسلام شاخ دەتوێنیتەوە دەقی ئایەتەکە دەفەرموێت: (وَقَدْ مَكَرُوا مَكْرَهُمْ وَعِنْدَ اللَّهِ مَكْرُهُمْ وَإِنْ كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ الْجِبَالُ) ٤٦ ابراهیم

واتە: بێگومان (خوانەناسان) پیلان و تەڵەکەی خۆیانیان گێڕا، فێڵ و فڕی زۆریان کرد، بەڵام هەموو پیلان و فێڵیان لای خوا ئاشکراو دیارە (بەسەر خۆیاندا دەشکێتەوە) هەرچەندە پیلان و فێڵیان کێوەکانیش لە بن بهێنێت.

هەیە پەیوەندی لەگەڵ هیچ لایەك نابەستێت دەڵێت: ((ئەو لایەنە ئەجێندای تایبەتی خۆی هەیە!)) لەڕاستیدا ئەوە داماوییە دەبێت ئەجێندای هەبێت، ئەی بەتەمای چی هەبێت؟ چونکە گوتاری سیاسی لەگەڵ بەرامبەردا لەسەر بنەمای بەڵێ و نەخێر دادەمەزرێت.

خاڵی حەوتەم: گوتاری ڕاستگۆیانە: دوور لەدرۆو چەواشەکاری، ئەگەر گوتارێکی سیاسی زۆر بەهێزبێت و لە٨٠٪ لەسەر بنەمای راستگۆیی بێت تەنها لە٢٠٪ درۆو چەواشەکاری بێت، ئەوا دڵنیابە هەمووی تێکەڵاوی درۆکە دەبێت و لەجیهانی ئەمڕۆدا هیچ بەهایەکی نامێنێت..
بەداخەوە جیهانی ئیسلامی بەعەلمانی و ئیسلامیەوە گەلێکی درۆزنن، لەکاتێکدا ئاینی ئیسلام زۆرترین جار باسی ئەوەی کردوە، کەموسڵمان نابێت درۆ بکات ، بەڵام بەداخەوە زۆرترین درۆ و چەواشەکاری لەجیهانی ئیسلامیەوە دەردەچێت، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ عەلمانی لەناو وڵاتانی ئیسلامیدا، چونکە خاوەنی گوتارێکی سیاسی ڕۆشن نیە تائێستاش لەناوچەکەدا.
گوتاری سیاسی پێویستی بەڕاستگۆیی و سەرڕاستی هەیە لەهەموو بوارەکانی ژیاندا لەمافەکانی مرۆڤدا، لەئازادیەکاندا، لەبژێوی ژیانی خەڵکیدا، لەمافی ئافرەتدا، ئەگەر گوتارێك لەناوخۆ ڕەوشێك و گوتارێك بێت لەدەرەوە وتارێك ئەوە جێگای گاڵتەجاڕیی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیە، بۆیە محەمەد عەبدە نوێکەرەوە ی فکری ئیسلامی لەدوو سەدەی ڕابردوو دەڵێت: ((چومە ئەوروپا ئیسلامی لێبوو بێ موسڵمان، لەجیهانی ئیسیلامیش موسڵمانی لێیە بێ ئیسلام))، چونکە لەفەڕەنسادا بینی هەموو کەس پابەندە بەمەوعیدو پەیمان و ڕاستگۆن، ئیتر زانی کەئەمە لای ئیسلام جوانترینی ڕەوشتەکانە لەجیهانی ئیسلامیش

موسڵمانان ڕەچاوی ناکەن، بەداخەوە خەڵکی وڵاتی ئێمە لەسەر بنەمای درۆی عەلمانی پەروەردە دەبێت، لەسەر پەیمانپێدانی کارەبای هەمیشەو موچەو قەیرانی ئاو.. سەدان قەیرانیتر، کەلەسەر بوونیادی درۆ بیناکراوە، لەکاتێکدا «ریچارد نیکسۆن» تەنها لەسەر درۆیەك دادگاییکرا، کەپرسیاری لێکرا درۆیکرد!!.. کلینتۆن نەیتوانی درۆبکات لەبەرامبەر کێشەی مۆنیکا لوینسکی، بەڵێ بەشاراوەی هێشتیەوە ماوەیەك، بەڵام لەکۆتایدا دانی پێدانا، هەروەها لەبەریتانیا سەرۆکی پارتی ئازادی کەماوەیەك وەزیری دەرموەی ئەو وڵاتە بوو نزیکی شاهی بەریتانیا بوو درا بەدادگا، ئەوکات نواوەر لەبەریتانیا بوو، واباسدەکرا گوایە هاوڕەگەزبازە! پێی وابوو لەسەر ئەوە دادگاییکراوە، پرسیاری کرد جاخۆ ئەوە لێرە ئاساییە؟! لەوەڵامدا بۆیان ڕونکردەوە کەبەهۆکاری درۆکردن دادگایی دەکرێت قسەیەکی کردوە درۆ دەرچووە، ئەگەر ئەم پێوەرە بگەڕێنینەوە بۆ هەرێمی کوردستان بڕوامان وایە: سیاسی لەکوردستاندا نامێنێت و دەبێت هەموو بارەگاکانیشیان بکەین بەزیندان بۆ ئەوەی جێگایان بێتەوە، پاشان دەبێت سیاسی قەرز بکەین، بەداخەوە سیاسیەکانی وڵاتی ئێمە لەسەر بنەمای چەواشەی حیزبایەتی گۆشکراون .

کەواتە درۆو چەواشەکاری لەگوتاری سیاسیدا گەورەترین تاوانە، هەموو ئیعتیبارێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و تەنانەت ئابووریش لەدەستدەچێت بەهۆکاری درۆ، ئەگەر هەر گوتاری سیاسیەك بەناوی دەوڵەت و حکومەتەوە نمایشکراو باسکرا نابێت بەهیچ شێوەیەك لەتە درۆیەکیشی تێدابێت، چونکە ڕە نگدانەوەی شەرەفی ئەو دەوڵەت و دەسەڵات و حکومەتەیە، چونکە بەو درۆیە ئەوەی کەوەستاوە و دەتەوێت بێت بەبەردەوامی دەیڕوخێنێت.

خاڵی هەشتەم: هێز پێویستە بۆ بەهێزکردنی گوتاری سیاسی.. تۆ نرخت بایی ئەوەیە کەدەیکەیت و کردارتە، نرخ دیاری ناکرێت بەگوتن و خۆ هەڵکێشان و دروشم، کەواتە هێز چەندە ئیحترام و ڕێزت زیاد دەکات، ئەوندەش گوتاری سیاسیەکەت بەهێز و باوەڕپێکراوت دەکات، ڕاستە هێز تەنها لەچەکی نەوەوی و

ئوسطولی گەورەدا نیە، چونکە زۆرجار هێز لەتەکنەلۆجیا و ئەلیکترۆنیات و پیشەسازیدایە..

تەنانەت گوتاری هێزی ئیسلامی و فەلسەفەی هێزی ئیسلامی.. چەندە گرنگی هەیە لەفکری سیاسی ئیسلامیدا، توخمێکی گرنگە، لەگەڵ ئەوەشدا پرۆژەی چاکسازی و مەدەنی زیاتر پاڵپشتی دەکات..

زۆرێك لەئیسلامیەکان لەدەرئەنجامی ستەمی عەلمانی و دەوڵەتەکانی و داگیرکەری ئیستبدادی بەرهەم هاتوون؛ وەك بزاڤێکی شۆڕشگێڕی و جیهادی لەناو شانۆی دنیای ئیسلامیدا پیادەی فکری سیاسی و بەرنامەی سیاسی خۆیان دەکەن، لەم ڕەوشەی ئێستا ئەوەی کەزۆر بەرەو دواوە ڕۆیشتوە فکری سیاسی ئیسلامییە.

لەناو فکری سیاسی ئیسلامیدا ـ هێز ـ فاکتەرێکی زۆر گەورەیە بۆ چەسپاندنی دەوڵەت و بانگەوازی ئیسلامی، چونکە زۆرجار هێز خەڵکی سەرسام دەکات بەئایدۆلۆژیاکەی، بەڵام ئەم هێزە ئەگەر خاوەنی فیکرو موفەکیرو مونەزیر نەبێت ئەوا هیچ کاریگەری نیە، تا دەتوانێت بانگەشەی لەفەرموودەی پێغەمەمبەر -صلى الله عليه وسلم- بکات و نموونەی (وأعدوا لهم ما استطعتم من قوة ألا إن القوة الرمي ألا إن القوة الرمي ألا إن القوة الرمي) بنێت، بەڵام کاریگەری ئەوتۆ دروست ناکات، تەنانەت خودی فکری سیاسی ئیسلامی لەسەردەمی پێغەمبەریشەوە لەسەر بنەمای تەنها وەحی دانەمەزراوە، بەڵکو وەحی ئاراستەی دەکردو لەمەیداندا خودی هاوەڵان و پێغەمبەرەکەشیان پیادەیان دەکرد، فەلسەفەی هێز لەکاری باشەو پرۆژەی باشەو داهێنانە لەبیرو هزری خەڵکیدا، بەداخەوە زۆرێك لەئیسلامیەکانی ئێستا ئەوانەی کەبزاڤانە هەنگاو دەنێن لەڕووی تیۆریەوە دەقی جوان و پوختیان لایە، بەڵام لەڕووی مەیدانیەوە زۆر لاوازن، یاخود پێچەوانەو ناواقیعانە هەنگاو دەنێت، هەموو جیهان دەکەنە دوژمنی خۆیان.

مانای وانیە هەموو خاوەن هێزێکیش دەتوانێت کاریگەری دروست بکات، هێز و فەلسەفەکەی ئەوەمان پێدەڵێت، کەوڵاتێکی وەك چین چەندە خاوەنی هێزە

کەمترین کاریگەریی هەیە لەسەر مرۆڤایەتی، ئەو وڵاتە ـ هێزی تەنها بۆ پاراستنی پەرژەوەندییە بازرگانییەکانیەتی ـ نەوەك ـ رژێمە سیاسیەکەی، یاخود وڵاتێکی وەك ڕوسیا هێزەکەی تەنها پاراستنی سەروەری خاکەکەیەتی هیچی تر، وڵاتێکی وەك پاکستان یەکێکە لەوڵاتە زۆر بەهێزەکان، بەڵام لەڕووی فکری و سیاسییەوە مردوە، هیچ گرنگی و کاریگەریی نیە.

ئەمەریکا لەڕووی هێزەوە چەندە بەتوانایەو تەکنەلۆجیای سەربازی بەهێزە؛ ئەوەندە گرنگیداوە بە- بەها مرۆیەکان و تیۆرە فکری و سیاسیەکان و مافەکانی مرۆڤ، ئەمە وایکردوە کەقسە رۆیشتووبێت لەجیهاندا، وڵاتێکی وەك فەرەنسا هەمان میکانیزمی کارکردنی هەیە لەهێزەکانیاندا، بۆیە نموونەی ئەم دوو وڵاتەمان هێنایەوە بڕبڕەی پشتی هەموو ڕۆژئاوای ئێستای لەسەر دامەزراوە.
هیچ کام لەدەوڵەتەکان لەسەر بنەمای هێز بەتەنها دانەمەزراوە، بەڵکو هێزی دەوڵەت نیسبییە لەڕووی سەربازی و تەکنەلۆجیاکەیەوە مەبەستمانە، بەڵکو ئەوەی هێزی گەورە ئەدات بەدەوڵەت بریتییە؛ لەسەرو ژێرخانی ئابووری، لەسەروەتی سروشتی، لەمەبدەئی کەبنەمایی گەورەی شارستانیەتیەت و زانست و زانیاریە، پاشان سەروەتی مرۆڤ کەزۆرێك لەئیسلامیەکان لەڕووی هێزەوە ئەمانەیان لەبەردەستدا بووە لەجیهانی ئیسلامیدا، بەڵام کاریان پێنەکردووەو پشتگوێیان خستووە تەنها یەك لایەن یان دوولایەنی ئەم فەلسەفەی هێزە گرنگی پێدراوە، بۆیە نەیانتوانیوە سەربکەون لەبوارەکانی دەوڵەتداریدا خاوەنی گوتاری سیاسی تەندروست نەبوون، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی دوو چەمکی گرنگ روون نەکراوەتەوە بۆ خەڵکی ناو ئەم بزاڤە ئیسلامخوازە، ئەو دوو قۆناغە بەجوانی و تەندروستانە نابڕێت، بۆیە تائێستا نەگەیشتونەتە ئامانج!..هەندێکیان باز هەڵەئەدەن بەسەریداو هەندێکی تریش تادێت بۆ دواوە دەگەڕێتەوە، کەسەرنەکەوتن و شکستیان خوارد یەکسەر موئامەرەی نێودەوڵەتی دەکەن بەبیانوو، هەڵەکانی خۆیان لەبیر دەکەن.

ئەو دوو قۆناغە برتیین لە:

**یەکەم: قۆناغی تێگەیشتن لەکاری بزاڤی ئیسلامی**

کاری بزاڤی ئیسلامی نەجێگای فتوادانی کۆمەڵگەکەیە واتە: (جماعە ئیسلامیەکەیە) نەخاوەنی یاسان، نەتوانای بڕیاردانی یاسایی و چەسپاندی شەریعەتیان هەیە، بەڵکو تەنها پڕۆژە فکریەکانی ئیسلام روون دەکەنەوە کەلەسەر بنەمای سێ چەمکە، یەکەم: بیروباوەڕو یەکتاپەرستی، دووەم: برایەتی و پیشکەوتن و شارستانیەتی، سێیەم: مرۆڤ و دەسەڵات و ژینگە و بەرنامەی سیاسی بۆ قۆناغی دووەم کەدەوڵەتداریە، راستە ئەمە بۆ خۆی گوتارێکی سیاسی ئیسلامییە، بەڵام ناتەواوە.

**دووەم: قۆناغی تێگەیشتنە لەکاری دەوڵەتداری ئیسلامی**

ئەم قۆناغە لەسەر دوو بنەمای گەورە دادەمەزرێت، ئەویش پێویستە بەرچاوڕوونی بدەنە خەڵکی بەنوسینەوەی دەستورو یاساو مافەکانیان و ئەرکی سەرشانیان ڕەچاوکردنی کەمە نەتەوەیی و ئاینەکانی تر وەك چۆن پێغەمبەری خوا - صلی اللە علیە وسلم- لەدەستوری مەدینەدا هەمووی دیاریکردو دانی بەمافی هەموولایەکدا ناوە، پاشان داننان بەخودی بیروباوەڕو ڕێزلێگرتنیان و مەمەڵەکردن لەگەڵیاندا هەروەك چۆن پێغەمبەر - صلی اللە علیە وسلم- مافی موشریك و جولەکەی دابینکردو مامەڵەی لەتەکدا کردن.

خاڵی نۆیەم: بریتیە لەپڕۆژەی خزمەتگوزاریی، پڕۆژەی خزمەتگوزاری پێداویستی خەڵکیە، خەڵك نانی دەوێت، ئەمانی دەوێت، ئاسایشی دەوێت، شەقام و جادەی قیرتاوی دەوێت، بازاڕی گەرمی دەوێت، کارەبای دەوێت، بەنزینی دەوێت.. هتد، ئەمەش کاری دووەمی پێغەمبەر -صلی اللە علیە وسلم- بوو لەمەدینە کەخەڵکەکەی ڕازیکرد بازاڕی دروستکردو ئاوی بۆ وڵات دابینکرد، ئینجا هەستا بەپاراستنی سنوری دەوڵەتەکەی، ئەوکاتە خەڵکی سنور دەپارێزێت و ناهێڵێت

بەرژەوەندیەکانی بکەوێتە مەترسیەوە. ئەمە گوتاری سیاسی ئیسلامی تەندروستە. بەڵام ئەوەی کەسەرنجدراوە لەئێستادا وادەزانرێت بەکوشتن و بڕین و هەڵکوتانە سەر مزگەوتەکان و کوشتن و بڕینی و سڕینەوەی یەکتری بەناوی دینەوە ئەم میکانیزمە ئیسلام بەرەو پێش دەبات. نەخێر بەڵکو دەبینین کەوا خەڵك بەفەوج دڵیان لەئیسلام ئەتۆرێت. ئەمەش پلانێکی نەخوازراوی نەزانی وبێئاگایی خۆمانە. بەڵام دوایی دەستە چەورەکەی خۆمان بەسەر دوژمن و نەیارەکانماندا دەسڕین و وادەزانین هەڵەمان نەکردوە. دەڵێین هەڵەی چی؟! بەڵام ڕاستی ناڵێین: کەدۆڕاین بۆ ئەوەی دۆڕانی خۆمان بشارینەوە ناچار قسەو بەهانەی زۆر دەهێنینەوە کە بوونی خۆمان لە گۆڕەپانی سیاسیدا بسەلمێنینەوە.

ئەم خاڵە ڕاستە تاڕادەیەك ڕەخنە ئامێز بوو لەدیدگای گوتاری سیاسی ئیسلامی نوێیەوە. بۆیە بەگشتی باسمان نەکرد. چونکە عەلمانیەکان لەم ڕووە بەهێزتر خۆیان نیشان ئەدەن لەگوتاری سیاسییاندا.

پەیوەندیە نیودەوڵەتیەکان لەسەر بنەمای هێزو تۆکمەیی تواناکان دادەمەزرێت نەخۆشەویستی تێدا کاریگەرە. نە ڕیز و ئیحترام. چونکە چەندە خاوەنی هێزو توانای بوارەکانی تر بێت ئەوەندە ڕێز بۆ خۆت و قورسایی بۆ خۆت دروستدەکەیت و گوتارە سیاسیەکەت بەهەند وەردەگیرێت. واتە: لەسەر توانای خۆت نرخت بۆ دیاری دەکرێت و مامەڵەی سیاسی و دبلۆماسیەتی لەگەڵدا دەکرێت و ئەویش لەڕێگای گوتارە سیاسیەکەوەیە. کەلەمەیداندا کاری پێدەکەیت و ڕەنگدانەوەی ناسنامەو کەسایەتی و نیشتیمانەکەتە.

خاڵی دەیەم: پێداویستی گرێدانەوەی بەشەکان بەهەمموو لایەنەکانەوە: واتە: ناکرێت هەندێك پرۆژەی سەرکەوتوو نیشان بدەیت. بەڵام دیدو بۆچوونەکانت بۆ خەڵکی ناوخۆو دەرموەی خۆشت دیاری نەبێت. دەبێت لەگوتاری سیاسیدا نیەت و کردارو هەڵسکەوت و بیرکردنەوە ئاراستە هەمووی دیاری بێت بۆئەوەی تەرەفی بەرامبەر بتوانێت مامەڵەت لەگەڵدا بکات. چونکە نیشاندانی بەشە بچوکەکانی

ناو گوتارەکەت کوشندەیە، ئەگەر نەیبەستیتەوە بەگوتارە سیاسیە گشتیەکان، ناکرێت لەدارستانێکدا بیت، تەنها لای دارێکی گەورەو بەهێزەوە وەستابیت دەبێت چاوێکی گشتی هەبێت بۆ هەموو دارستانەکە، کەواتە دیدو تێڕوانین بۆچونەکانت گشتی نیشان بدە، ئینجا دەتوانیت تایبەتی بکەیتەوە، ئەمەش یەکێکە لەبنەماکانی گوتاری سیاسی سەرکەتوو، چونکە بەو پێیە ستراتیژیە گەورەکەت دیاریدەکەیت و سیاسەتی بچوك و پلانی بەشەکانیش وەك فاکتەرێك و تاکتیکێك دەست پێدەکەیت بۆ گەیشتن بەئامانجەکەت.

ئەگەر بۆ ئەم خاڵە نموونەی ئێران و هیندستان بهێننیەوە بۆ ئەوەی لەڕووی مەیدانیەوە باشتر ڕوونی بکەینەوە، ساڵی (١٩٦٠) ئێران خاوەنی توانایەکی ئەوتۆ نەبوو بەرەچاوکردنی بەرامبەر بەمیسرو عێراق و لیبیا، ئێران بەگشتی گرنگیدا بە هەموو بەشەکانی کاریکرد بۆ پێشکەوتنی ئێران. ئەو وڵاتەیە لەدوای ئەو هەموو فشارە نێودەوڵەتیەوە توانی برەو بەپیشەسازی خۆی بدات هەرچەند ناهێڵن لەڕووی سیاسیەوە دەربکەوێت، بەڵام یەکێکە لەوڵاتە پێشکەوتووەکانی جیهان لەڕووی تەکنەلۆجیای مەدەنی و سەربازییەوە..

هیندستان لەساڵی (١٩٧٠)دا بەهاوبەشی لەگەڵ میسردا فڕۆکەی کشتوکاڵیان دروستکرد، ئەودەمە میسر پێشکەوتووتر بوو لەهیندستان ماتۆڕی فڕۆکەکەی دروستکردو هیندیش لاشەکەی، بەڵام میسر کەنزیکترە لەئەوروپاو هیندیش دوورتر، ئێستا هیندستان قسەی تایبەتی هەیە لەسەر چوونە ئاسمان و زانستەکانی ئایتی و دروستکردنی جۆری سەیارەو تەنانەت باشترین جۆری ئۆتۆمۆبیلی مارسدیس-بینز دروستدەکات لەبۆمبایی بەناوی کۆمپانیای تاتایی لەئەڵمان بەهێزتر دروستی دەکات.. ئەوە هۆکاری گەشتن بەپلانی ستراتیژی خۆیانەو وازهێنانیانە لەبەشەکان و گرنگیدانیانە بەلایەنە گشتیەکان، بۆیە گوتاری سیاسیان لەناوچەکەدا بەهێزە[١٠].

[١٠] گۆڤاری زانستی میسری بەناوی (العالم ژمارە ٣٥٦.. لاپەرە ١٢ ساڵی ١٩٩٥

خاڵی کۆتایی: پێداویستیت بەکەسانی تر بۆ تەواوکردنی کارەکەی تۆ ئەم گوتارە سیاسیە و فەلسەفی هەنگاو دەنێت. بۆ بەهێزکردن و نوێکردنەوەی گوتاری سیاسی بەتایبەت لەگوتاری سیاسی ئیسلامدا کەزۆر گرنگە. واتە: لەم گەردوونەی خوای گەورەدا مرۆڤ ئەوپەڕی تاوان دەکات. هەرچی بێئەمری خوای پەروەردگارە دەیکات. تۆبەش ناکات. بەڵام خوای گەورە نە لەکەونی خۆی دەریدەکات. نە لەناو خەڵکیشدا ناوی دەزڕێنێت و وەك کورد دەڵێت: ((حەیای دەبات))!.

مرۆڤ بەسروشتی خۆی ناتەواوە واتە: مێژووی مرۆڤ وا هاتووە کەبوونەوەرێکی نارێك و پێکە. پێداویستی زۆری ماوە بۆ ئەوەی دەستکەوتی خۆی دابین بکات. ئەمەش لەنیعمەتی خوای گەورەیە کەمرۆڤی بەوشێوە و مۆدیلە دروستکردوە. لەگەڵ ئەو هەموو پێداویستیانەیدا کەنوقسانە.. رێزی لەهەموو شتێك زیاترەو کردوێتیە جێنشینی خۆی. کەرامەتی پاراستومو رێزی لێناوە. خوای گەورە دەفەرموێت: (وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً) ٧٠ الاسراء

واتە: بەڕاستی ئێمە رێزمان لەنەوەی ئادەم گرتوومو بەسەر وشکانی و دەریادا (بەجۆرەها هۆکاری گواستنەوە) هەڵمانگرتوون. لەڕزق و ڕۆزی چاك و جۆراوجۆر بەهرەوەرمان کردوون (لەخۆراك و پۆشاك و ماڵ و ناوماڵ و ...هتد) بەڕاستی ئێمە ڕێزی زۆری ئەوانمان داوەبەسەر زۆربەی ئەو بەدیهێنراوانەدا کەدروستمان کردوون (لە هەموو ڕوویەکەوە).

کەواتە لەڕووی ئەو ناتەواوییەوە وایکردوە خوای بەرزو پیرۆز کەمرۆڤ پێویستی بەمرۆڤ بێت. واتە: بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی بێت. پێداویستی یەکتر تەواو بکەن. ئەمەش خوای موتەعال لەقورئاندا بۆمان باس دەکات و دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ) ١٣ الحجرات .

واتە: ئەی خەڵکینە ئێمە هەمووتانمان لە نێرومێیەك درسوتكردووە (كە باوكە ئادەم و دایكە حەوایە)، وە كردوومانن بە گەلان و تیرمو هۆزانی جۆربەجۆر، تا یەكتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بە یەكەوە..بەڕاستیی بەڕێزترینتان لای خوا ئەوەتانە كە زۆرتر لە خواترسە و فەرمانبەرداری خوایە، بێگومان خوا زاناو ئاگایە بە هەموان.

بەهۆكاری ئەوەیە كەمرۆڤ ناتەواوە خوای گەورە كردونیەتە هۆزو تیرە بۆ ئەوەی یەكتربناسن ناتەواوی یەكتر تەواو بكەن و پێداویستی یەكتر دابین بكەن جا ئەم كارە لەسەر بنەمای تاك، پاشان كۆمەڵ ئینجا دموڵەت، هەریەك لەمانیش بۆ تاكی بەرامبەرو كۆمەڵگەیەكی تر، گواستنەوەی كلتور و دموڵەتانی دراوسێ پێداویستی یەكتر دابین دەكەن بەهۆكاری ئەو ناسین و تەعاروفەی كەدەیكەن خوای گەورە لەسروشت و ناخی مرۆڤدا ڕواندویەتی، لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەورە مرۆڤی وا دروست كردوە، كەپێویستە هیچ كات بیرو بۆچوون بیركردنەوەیان وەك یەك نەبێت. خوای پەروەردگارو بالآ دەست دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلاَ يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ﴾ ١١٨هود

واتە: ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە هەموو خەڵكی دەكرد بەیەك تاقم و كۆمەڵ، بەڵام بەردموام ئەو خەڵكە جیاوازن لە نێوانی یەكتردا لە ئایین و بە رنامەو بۆچوون دا.

ئەمەش واتای ئەوە نیە هەندێك كەس بۆ تەلبیسكردنی هەڵخڵەتاندی خۆی ڕمواج بەناكۆكی و جیاوازی نێوان موسڵمانان بدات، پێویستە جیاوازی لەسەر بواری مرۆڤایەتی لەو لەسەدا حەفتایەی كەباسمانكرد هەبێت، بۆ ئەوەی ناسین و یەكترناسینەكە وەحدەتی ڕۆشنگەرایی دروستبكات نەك وەحدەتی بیروباوەڕ، وەحدەتی بیروباوەڕ لەسەدا سییەكەیە كەپێشتر ئاماژەی پێدراوە ئەویش لەسەر بنەمای تەوحیدە، كەلەناو كورددا ناسراوە بەیەكتاپەرستی..

كەواتە مێژووی مرۆڤ وا هاتووە كەپێداویستی بەمرۆڤی دیكە دەبێت، خوای گەورە وا باری هێناوە، ئەم بیرو بۆچوونەی ئێمەش لەسەر ئەو بنەمایە

دامەزراندوە کەخەڵکی ناتوانێت لەکایەکانی ژیاندا هاوکارو ناسراویی و دەستدرێژکردنی مرۆیی نەبێت بۆ مرۆڤەکانی تر وێڕای تێبینیت لەسەر ئاین و بیرو بۆچوونی.

هەر ئەم بیرو بۆچوون و باوەڕی ئیسلامییە وایکردووە کەئێمەی موسڵمانان ببینە باشترین ئوممەت، واتە: خوای گەورە باس و پێناسەی ئوممەتی محەمەد بەمشێوەیە دەکات و دەفەرموێت: (كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ.. ) ١١٠ ال عمران

واتە: (بەڕاستی) ئێتر ئێوەچاکترین ئوممەتێکن، کە(بۆ سوودی) خەڵکی هێنراونەتە مەیدانەوە، چونکە فەرمان بەچاکە دەدەن و قەدەغەی خراپەدەکەن و باوەڕی دامەزراوتان بەخوا هەیە..

ئەمەش هەروا سادە نیە، کەموسڵمان بگاتە ئەم ئیمتیازە کەخوای گەورە باسی دەکات، دەبێت ئەم موسڵمانە خاوەنی ئەم خەصڵەتانە بێت.. لەدوای مرۆڤبوونی بیرو باوەڕەکەی هەڵدەبژرێت...

بەداخەوە لەناو موسڵماناندا ناسنامەی ئیسلامی هەڵگرتووە، بەڵام ئەوەی پێی بڵێن مرۆڤ لەناو لاشەی ئەو کەسەدا نیە کەهەڵگری ناسنامەی ئیسلامەو تەنها ناوی بێناومرۆکە.

کەواتە باشترین خەڵك بۆ خەڵکی کەموسڵمانە دەبێت خاوەنی ئەم خاسێتانە بێت:

یەکەم: یەکتاپەرستە: ئەم یەکتاپەرستییەی وای لێدەکات، کەوەحدەتی بیروباوەڕی و برایەتی لەنێوانیاندا دروست ببێت، هەموو موسڵمانان کۆبکاتەوە لەسەر مەنهەجی قورئان و سوننەت..

دووەم: پەیام: ئەم پەیامە کە لە قورئانەکەوە سەرچاوە دەگرێت ئیسلام دەکاتە مەنهەج و ئایدۆلۆژیایەك و بزاڤێکی پێدروستدەکات لەسەر بنەمای بەرنامەی

سیاسی ئەو کۆمەڵە خەڵکەی کەلەو مەئوایەدا کار دەکەن، چونکە بەرنامەی سیاسی پشت بەواقیعەکە دەبەستێت..

سێیەم: ژیار-شارستانیەت: ئیسلام هاتووە بۆ ئاوەدانکردنەوە، ناسین و تەعاروفکردن لەگەڵ مرۆڤدا، هاوکاریکردنی مرۆڤایەتی، پڕۆژەی خزمەتگوزاری.. ئەم سێ چەمکەش باشترین پڕۆژەی دەسەڵات دروستدەکات و دایدەمەزرێنێت، کەمرۆڤەکان والێدەکات باشترین خەڵك بن و پێناسەکەی خوای گەورەو باڵا بەسەریاندا بسەپێنرێت، کۆمەڵ و دەستەکانیش بیکەنە پڕۆژەی کاری خۆیان بۆ ئەوەی کۆمەڵگەکان دەنگیان بدەنێ و لەم واقیعەدا زاڵبن بەسەر ئەو عەلمانیەتە وشك و برینگەی، کەئیستراد کراوە بۆمان ئەویش بنەما سەرەکییەکەی بریتین لە:

یەکەم: شارستانیەت و ژیاری ئیسلامە هەوڵی ئاوەدانکردنەوەی هەیە، ئەمەش دەیەوێت بوونیادبنێت نەك رووخێنەر بێت.

دووەم: چاودێری و مامەڵەی دروست و سەرپەرشتی بەسۆزی گەل بێ رە چاوکردنی دین و بیرو بۆچوونیان، بەڵام بەئاشکراکردنی ناسنامەی ئیسلامەتی خۆت تا زیاتر هەست بەئەمان بکەن.

سێیەم: پابەندی بەیاساوە کەناساندی شەریعەتە واتە: یاساکانی ناو ئیسلامە کەلەسەر بنەمای چاکە بۆ مرۆڤ دادەمەزرێت وەك نەگۆڕەکانی، گۆڕاوەکانیش خەڵکی لێزان و بەتوانا کاری تێدا دەکەن و هەموو پابەند دەبن بەیاساوە.

چوارەم: هاوکاریی دەسەڵاتی دادپەروەر و لەڕوو وەستانەوەی دەسەڵاتی زوڵم و زۆر، هاوکاریی حاکم لەسەر کاری چاکە، شۆڕشکردن بەسەریدا لەکاتی فەسادو گەندەڵی و یاخود راستکردنەوەی بەگوێرەی توانای گەل و چاودێرەکانی.

ئەم چەند باسەی کەکردمان بریتیە لەدیدگایەکی نوێی گوتاری سیاسی ئیسلامی لەڕووی مێژووی مرۆڤ و مرۆڤی موسڵمان بەگشتی لەجۆری ئالیەتی و سروشتی کارکردنی لەم هەسارەیەدا تا کۆمەڵگەیەکی بەختەوەر دروست بکرێت[11].

**گوتاری سیاسی ئیسلامی**

گوتاری سیاسی ئیسلامی پێناسەی زۆری بۆ کراوە لەسەردەمی نوێماندا لەبەناوبانگترینیان سێ پەرتوکە نایابەکەی دکتۆر (حاکم موطیریە) یەکێك لەو سێدانەیە م. (فاتح سەنگاوی) وەریگێڕاوە بۆ زمانی کوردی بەناونیشانی (مختصر اصول الخطاب السیاسي الاسلامي، القرانی والنبوي والراشدي) وەرگێڕدراوەکە (ئازادکردنی مرۆڤ و ڕاماڵینی ستەمکاری...) کەلەناو کتێبخانەی کوردیدا یەکێکە لەکتێبە باشەکان، بەڵام بەداخەوە لەبواری گوتاری سیاسی ئیسلامیدا کورد زۆر لاوازە لەو بارەیەوەو خاوەنی داهێنانێکی ئەوتۆ نیە لە بواری نوسیندا، پێناسەی حاکم موطیری بۆ گوتاری سیاسی ئیسلامی سەرەتا؛ بەپێناسەیەکی جیهانبینی ئیسلامی و تیکەڵ بەفکری سیاسی ئیسلامی دەست پێدەکات، پاشان لەمافەکان و ئەرکدا روونکردنەوەی زیاتر دەخاتە سەر ئەو چەمکانە لەنێوانی ئازادی و ئاشتیدا کۆتایی بەپەرتوکەکەی دێنێت بەدرێژکردنەوەی ئەکادیمیایەکی مێژوویی بۆ ڕووداوەکان[12]..

---

[11] (دکتور مصطفي الفقي ..تجدید الخطاب السیاسي.. الطبعة الثانیة، لبنان- بیروت) ل١٣٤

[12] مختصر أصول الخطاب السیاسي الإسلامي القرآني والنبوي والراشدي، د. حاکم المطیری ل٧- تحریر الإنسان وتجرید الطغیان، د. حاکم المطیری ل١١

ئیخوان موسلیمین[13] و سەلەفیە جیهادیەکاندا[14] وەك سەرچاوەی سەرەکی و مەرجەعێك بۆی دەگەڕێنەوە. ڕاستە پەرتوکی تریش لەوبارەیەوە هەیە، بەڵام بەبۆچوونی نوسەر باشترینیانە، ئەوەندەی کە نوسەر- پەیی پێبردوە لەبواری گوتاری سیاسی ئیسلامی.

[13] (ئیخوان موسلمین یان کۆمەڵەی برایانی موسوڵمان پارتێکی سیاسی ئیسلامی سونیە بنکەی لەزۆربەی وولاتێکی عەرەبی و جیهانیەکان هەیە ، پارتەکە لە مارسی ساڵی ١٩٢٨ لەلایەن حەسەن بەنا لە میسر دامەزراوە . پارتەکە لە میسڕ تووشی چەنگ و پەڵەمەی زۆر بوویەوە لەسەر دەستی سەرۆکەکانی میسرەوە بەتایبەتی جەمال عەبدولناسڕ و ئەنوەرسادات و حوسنی موبارەك کە ڕێگریان لێ دەکرا لە کارە سیاسیەکانیان وە لە سووریاش لەلایەن دوو براکە ڕەفعەت و ئەسەد تووچی چەندین کووشتار بوونەتەوە بۆیە زۆر جار پارتەکە لە ژێر ناوی جوودا دا بەشداری لە هەڵبژاردن و کارە سیاسیەکانی خۆی کردووە ، لە بیروباوەڕەکانی پارتەکە کارکردن لەسەر یاسای شەریعەت و دژە زایۆنیزم و کارکردن بۆ دەعوەی ئیسلامی.)

[14] سەلەفی جیهادی، سەلەفەیەت لەرووی زاراوەوە واتا : مەنهەجێکە کە سەرچاوەکەی لە پێغەمبەری نازادارە وە -صلی الله علیه وسلم - کە بە ئاراستەی وەحی و پاشان هاوەڵانی بەرێزی کە جیلێکی ناوازە بوون و هاوشێوەیان دروست نابێتەوە . پاشان ڕەوەندی دوای هاوەڵان کە پێیان دەوترێت تابعین و ڕەوەندی دوای تابعین کە پێیان دەوترێت تابعی تابعین .. ئەم کۆمەڵە پیاندەوترێت سەلەفی صالح
سەلەفی جیهادی : ئەم مەنهەجە لە خەتی عەبدولقادر عۆدە و عەبدوڵلا عەزام و ئوسمە بن لادن و ئەبو محمدی مەقدیسی و زۆرێکی تر لەم سەرکردانە سەرکردایەتی ئەم ڕێبازو قوتابخانەیە دەکەن..

## چەمکی گوتاری سیاسی ئیسلامی:

لەبەندی یەکەمدا تارادەیەك رۆشنبیریەکمان لەسەر گوتاری سیاسی خستە بەردەم خوێنەر، بەڵام لێرەدا بەدوو چەمك زیاتر شیدەکەینەوە ..

### چەمکی یەکەم: گوتار لەناو ئیسلامدا

تێگەیشتنێکی سادەو ساکاری هەیەو نەگۆڕە کوردو عەرەب و فارس.. بەشێوە یەکی گشتی هەموو نەتەوەکان گوتاریان لا ڕۆشن بووە، لەناو قورئان و سونەتدا، لەهەموو فەرهەنگەکاندا بەشێوەیەکی سادەو تەواو باسکراوە.

چەمکی دووەم: تێگەیشتن لەم چەمکە لەدنیای سیاسی و فیکری ئەمڕۆدا جیاوازترە، مانا و تێگەیشتنی و درك پێکردنی زیاتر بۆ داڕێژراوە لەڕووی فەلسەفی و رەهەندە سیاسیەکان و پێهەڵدان و راگەیاندنەکان، لەم بوارەدا تێگەیشتنی زیاتری بۆ دادەتاشرێت.

ئەم چەمکانەش لەدوو ڕوومەوە ماناو تێگەیشتنی لێوەردەگیرێت لەڕووی زمانەوانی و زاراوەییەوە، لەڕووی زمانەوانیەوە لەڕابردوودا باسمانکرد لەناو کوردو عەرەب و فارسدا نموونەی فەرهەنگی بەناوبانگی عەرەبمان هێنایەوە (لسان العرب) و لەڕووی زاراوەو مێژوو فەلسەفەی چەمکەکە، ئاماژەمان پێداوە لەبەندی یەکەمدا.

### گوتاری سیاسی ئیسلامی لەقورئاندا:

لەقورئاندا بەکۆی گشتی حەوت جار باسی گوتار کراوە، سێ جار راستەوخۆ وشەی گوتار بەکارهاتووە، نموونەی سورەتی (ص) ئایەتی ٢٠ ، خوای گەورە دەفەرموێت: وَشَدَدْنَا مُلْكَهُ وَآتَيْنَاهُ الْحِكْمَةَ وَفَصْلَ الْخِطَابِ.

ئێمە پاشایەتیەکەمان بەهێزکردو حیکمەت و دانایی و قسەو فەرمانی بەجێمان پێبەخشی.
ئەگەر وردبینەوە لەئایەتەکە باسی حیکمەت هاتووە لەنزیکی گوتار، ئیتر لێرەوە مانایەکی زۆر بەرفراوان ئەدات بەدەستەوە کەدەتوانرێت ئەوپەڕی قوڵبوونەوە شیکاری لەبوارەکانی فکری و فەلسەفی لەچوارچێوەی ئایەتەکەدا وەربگیرێت و ئەو چەمکی گوتارە ئەوەندە ماناو مەدلولاتی بەهێزی لێوەردەگیرێت، کەدەشێت بە چەند پەرتوك شیکاری بۆ بکرێت! لەڕووی زمانەوانیشەوە بەگوێرەی ئەو ڕستەو گوفتارانە ماناو چەمکەکانی لێوەردەگیرێت، ئەو ماناو تێگەیشتنە ئەوەندە بەرزدەبێتەوە لەڕووی قورئانیەوە، کەدەتوانرێت ڕاڤەی وا هەڵبگرێت کەجیاوازی لەنێوانی گوتار لەڕووی زمانەوانی و زاراوەییەوە، کەنزیکە بەحیکمەت ئەوەندە بەئاسانی بکرێت، کەسەردەستەی جیاوازی گوتاری سیاسی لەئیسلامدا دەردەخات پێش ئەوەی لەسەدەی چواردەوە ڕۆژئاوا پەی بەو وشە بردبێت..!

### گوتاری سیاسی ئیسلامی هاوچەرخ:

ئەو گوتاریە لەڕووی زاراوەی فەلسەفییەوە، نزیك لە(گوفتارە) فەلسەفیەکە ؛ کەبە گوتاری سیاسی کەسێك دادەنرێت، یاخود مەنهەجێك، یان هزرو تێگەیشتنێك و دیدێك لەڕاڤەو تەعبیری و وێناکردن کۆمەڵێك، یان کەسایەتیەك یاخود ڕەوتێك.. هتد، ئەم گوتارە کۆکە یاخود دژە لەگەڵ گوتاری فەلسەفی کەسێکی تردا، یان کۆمەڵ و حیزب و ڕەوتێکی تردا..
ئەم تێگەیشتنە لەفکری سیاسی هاوچەرخەوە وەرگیراوە، ئیتر ئەمە بۆتە گوتاری سیاسی، پێکهاتووە لەسیستەمێکی فیکرو ناوەرۆکێکی ئایدۆلۆژیایی، ئەم گوتارە ڕاڤەو ڕونکەرەوەی بیروباوەڕو مەزهەب و سیاسەت و تێگەیشتنەکانی دەستە و گروپ و حیزبێکە، لێرەدا کەباسی گوتار دەکەین بەواتای شێوەی گەیاندن و وتاردان نایەت، بەڵکو ڕێگاو ڕێڕەوێکە بۆ ڕاو بۆچوون و ئەو وێستگانەی کەخاوەنەکەی هەڵیدەگرێت، هەروەها تێگەیشتن و ڕاڤەو بیروباوەڕو فەلسفەو ڕوح و مەزهەب دەگرێتەوە.

هەموو ئەو ئاماژانەی کەدراون لەسەر گوتاری سیاسی هاوچەرخ، یەکانگیرە لەگەڵ گوتاری ڕۆشنبیری، گوتاری ئەدەبی، گوتاری هونەری، گوتاری ڕاگەیاندن، هەرچەندە گوتاری ڕاگەیاندن بەرفراوانترینە لەزەمینەی کارکردندا بەو پێیەی لەڕووی ناوەڕۆکەوە زوو وەردەگیرێت، چونکە لەڕووی وەرگرتنەوە گوتارەکە زووتر دەچێتە ناو خەڵکی، بۆیە باشترین گەیاندن بۆ گوتار لەڕێگای ڕاگەیاندنەوەیە، کەناونراوە بەگوتاری ڕاگەیاندنی ئاینی، یاخود گوتاری فەلسەفی و گوتاری ڕاگەیاندنی سیاسی.. هتد، ئەم ناوانەی بۆ داهێنراوە..

لێرەوە سەرنجمان بۆئەوە رادەکێشێت، کەگوتاری سیاسی ئیسلامی لەچوارچێوەی ئەو تێگەیشتنە نوێیە هاوچەرخەدایە بۆ گەیاندنی گوتاری ئیسلامی، کەوەسیلەیەکە موسڵمانان ئاڕاستەی جیهانی دەکەن، لەڕێگای ئەم تێگەیشتنەوە موسڵمانان دەیانەوێت سەرنجی ڕای گشتی جیهانی ڕابکێشن و کردارو ویستەکانی و بیروباوەڕی خۆیان زیاتر بۆ ڕای گشتی جیهانی بخەنەڕوو، ئەمەش لەڕێگای ئەو ڕاگەیاندە جۆراو جۆرانەوەیە کەئێستا لەجیهاندا بوونی هەیە.. وەك نوسراوو بیستراوو بینراو[١٥].

لەسەر بوونیادی ئەو ڕونکردنەوانەی کەئاماژەمان پێداوە بەکۆی گشتی، ئەم پێناسەمان دەستکەوتووە بۆ گوتاری سیاسی ئیسلامی ئەویش بریتیە لە: ((چوارچێوەیەکی فراوانی بانگەوازی ئیسلامی بەتێگەیشتنێکی قوڵ و ووردو گشتگیر.. واتە: ناساندی چەمکەکانی ئیسلامە لەهەموو ڕووەکانی سیستەمی کۆمەلایەتی و سیاسی و فەرهەنگی...هتد)).

[١٥] الخطاب الإسلامي بين الأصالة والمعاصرة، د. عبدالعزيز التويجري ل٢٢٩

## پێناسەی گوتاری سیاسی ئیسلامی:

بریتیە لەمەرجەعیەتی ئیسلامی لەئوصولی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم-. پاشان هەموو ئەو بەشە ئیسلامیانەی تر، بەشەکانی تر واتە؛ ئەو کۆمەڵ و دەستەو حیزبە ئیسلامیانە، یاخود ئەو دەزگاو رموت و کارە فەرمیە ئیسلامیانە ئەگەر ئەهلی و تەنانەت کەسایەتی تایبەتیش بێت، کەسەرچاوەکەی لەئوصولەکەوە وەرگیرابێ، بۆچوون و دیدگاو پێشنیارەکانی ئەوانیش دەبێتە ئوصوڵ، لەڕووی ئیدارەو ژیان و سیاسەت و کۆمەڵگەو ئابووری و رۆشنبیری و.. هەموو ڕووی ڕەهەندەکانی ژیان، کەتێکڵاو ئاڕاستەی ناسنامەی ئیسلامییەو لەڕووی ئوممەت و کارو بانگەوازەوە هەموولاکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە[16].

## بناغەی گوتاری سیاسی ئیسلامی:

ئەم گوتارە لەسەر چوار بناغە دادەمەزرێت[17]

یەکەم: دین ـ ئاین

دووەم: مرۆڤ

سێیەم: دەسەڵات

چوارەم: سەروەت و سامان و ئابووری

هەریەك لەم بناغانە ڕوونکردنەوەی تایبەتی دەوێت، هەریەکێکیان چەندین خاڵ و بەشی تری لێ جیادەبێتەوە، پێویستی بەڕوونکردنەوەیەکی زیاترە..

[16] الخطاب الإسلامي.. الماهية ودلالات التجديد ، وسام فؤاد ل ١٩٠

[17] مختصر اصول الخطاب السياسي الاسلامي، د.حاكم المطيرى... ل- ٢

**سەرەتا ئاین وەردەگرین:**

**یەکەم بناغەی: ئاین**

**ووشەی (ئاین ـ دین) وەك لەقورئان و فەرموودەو فەرهەنگەکانی زمانی عەرە بیدا هاتووە، بەچوار مانایە:**

یەکەمیان: ناسینی خوای خاوەن دەسەلات و هێزو دەسەلاتی کردگاریتی و خاوەن و توانای ژیاندن و مراندن و زیان و سوود گەیاندن و تەگبیرکردنی هەموو بوونە وەرە بەهەرچی تێیدایەتی.. ئیسلام لەم مانایەوە (عەقیدە) دادەرێژێت..

دووەمیان: بەپێچەوانەی ئەو واتایەیەی یەکەمە، بەمانای خۆ تەسلیمکردن و گەردنکەچی نواندن و وەرگرتنی فەرمانی ئەو خاوەن هێزو توانایە بەدەسەلاتەی کەخاوەن و توانای کردگاریتی و کارگێڕیی هەموو بوونەوەری هەیە، ئیسلام لەم مانای دووەمەوە (پەرستن)ی خوا دەچەسپێنێت.

سێیەمیان: بەمانای ئاراستەی خوایی ڕێبازەکەیەتی، بەواتای ئاراستەو وەرگرتنی فەرمان و بەرهەڵستکاریەکانیەتی، کەئەو ناوی لێناوە شەرع.. واتا: لەمانای سێیە می دیندا ئەوە دەسەلمێنرێت، کە تەنها خوای خاوەن دەسەلات و هێز کەهەموو دروستکراوان لەژێر دەسەلاتیدا مافی دارشتنی ڕێبازو یاساو ڕێسای هەیە واتە: (شەریعەت) هی خوایەو بەس..

چوارەمیان: دوای باوەڕبوون بەو سێ تەوەرە مانایەی (عەقیدە) و (پەرستن) و (شەریعەت) و پابەندبوون پێیانەوە، مانای چوارەمی وشەی ئاین دێت کە ڕۆژی دواییە!! چونکە ئەو ڕۆژە ڕۆژی پاداشتی ئەو پێوە پابەندبوونەیە، یان سزای باوەڕ

پێنەبوونێتی یان پێوەپابەند نەبوونێتی.. لەم ڕوانگەوە مانای (يومُ الدِّين) لەسەر سێ تەوەرە ماناکانی یەکەم و دووەم و سێیەم دادەمەزرێت..[18]

کەوابوو لەسەرەتاوە دەبێت ئەوەمان لەبەرچاو بێت کەمادام قسە لەسەر زاراوەی دین دەکەین و دەمانەوێت بزانین دین بەنەزەری ئیسلام خۆی چییە، زیاتر بەبەڵگەی قورئان و فەرموودەو زمانەوانی عەرەبی ڕوونی بکەینەوە:

هەموو تەوەرە مانای زاراوەی دین لەڕوانگەی ئیسلامەوە بەم مانایانەیە:

**مانای یەکەمی ئاین**

ئاین یاخود دین بەمانای: ناچارکردن و دەسەڵات و حوکمڕانی و فەرمان کردن، ناچارکردنی کەسێك بۆ گوێڕایەڵیکردن، هەروەها بەکارهێنانی هێزی ناچارکەر (Sovereignty) بەسەریداو کردنی بەبەندەو گوێڕایەڵ.

دەڵێن: (دانَ الناس) واتە خەڵکەکەی ناچارکرد بۆ گوێڕایەڵکردن، کەدەڵێن: (دِنتُهم فَدانُوا) واتە: ناچارمکردن و ئەوانیش گوێڕایەڵیانکردم، یان (دانَ الرجلُ) واتە: کابرا نەبووە خاوەن عیزەت و سەربەرز بوو، یان (دِنتُ الرجُل) واتە: پیاوەکەم ناچارکرد ئەو ئیشە بکات کەپێی ناخۆشە، (دُيِّنَ الرجُلُ) واتە: ناچار کرا ئیشێك بکات کەپێی ناخۆشە (دِنتُهُ): کاروباریم بەڕێوەبردو خستمەژێر ڕکێفی خۆمەوە. (دَيَّنْتُهُ القومَ) واتە: سیاسەت و کاروباری بەڕێوەبردنیانم خستەدەستی ئەوەوە. (الحُطيئه)ی شاعیر کەدایکی دەدوێنێت و دەڵێ:

**لقَـد دَيَّنْتِ أمرَ بَنيـكِ حَتَّـى تَرَكْتِهِمْ أدَقَّ مِن الطحِينِ**

واتە: سیاسەتی تۆ لەبارەی بەڕێوەبردنی کاروباری منداڵەکانت بەچەند شتێك بوو، کەوەختێك ئەوانت بەجێهێشت لەئارد ووردتر ببوون..

---

[18] جیهانبینی ئیسلام.. م. کرێکار لاپەڕە- ٢٤

خوای گەورە دەفەرموێت: (أَفَغَيْرَ دِينِ اللَّهِ يَبْغُونَ وَ لَهُ أَسْلَمَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ) ٨٣ ال عمران

واتە: مەگەر غەیری دەسەلاتداری خوای گەورەیان دەوێت؟! لەکاتێکدا کەهەرچی لەئاسمانەکان و زەویدایە، بەخۆشی خۆیان بێت، یان بەزۆر ـ ملکەچی خوای گەورەن و گوێڕایەڵی ئەون.

پێغەمبەریش صلی الله علیه و سلم دەفەرموێت:

(الكَيِّسُ مَنْ دانَ نَفْسَهُ وَعَمِلِ لِمَا بَعْدَ المَوتِ) فەرمودەیەکی لاوازە واتە: ژیرو زیرەك ئەو کەسەیە کەنەفسی خۆی زەبوون و ملکەچ بکات و باری بێنێ و ئیش بکات بۆ دوارۆژ.

هەر بۆیە بەکەسێکی زاڵ و دەسەلاتدار بەسەر ناوچەیەك یا نەتەوەیەك یا هۆزو عەشیرەتێك و حاکم بەسەریانەوە دەگوترێت: (دَيَّـان). بۆیە ئەعشا ئەلحەرمازی شاعیر کەپێغەمبەری دەدواند صلی‌الله علیه وسلم دەیووت: (یا سیدَ الناسِ و دَيَّانَ العَرَبِ) واتە: ئەی گەورەی هەموو خەڵکی و ئەی ئەو کەسەی بەسەر هەر هەموو عەرەبدا زاڵ بویت! لەسەر ئەم بنەڕەتە بە بەندەو کۆیلە دەگوترێت: (مَـدِين) بەکەنیزەکیش (ژنەکۆیلە) دەگوترێت: (مـدینه) و (ابن المدينه). (الاخطل)ی شاعیر دەڵێ:

رَبَـتْ ورَبَا فی حِجْرها ابنُ المَدینه [19]

واتە: کوڕی ئافرەتێکی کۆیلە لەباوەشیدا پەروەردە بوو. لەقورئانیشدا هاتووە، کە (فَلَوْلا إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ. تَرْجِعُونَهَا إِن كُنتُمْ صادِقِينَ) ٨٦ـ٨٧ الواقعه

[19] الكتاب : المصطلحات الأربعة في القرآن. أبو الأعلى المودودي. تقديم:محمد عاصم الحداد تخريج الشيخ الالباني. ل ٤٣٣)

واته: ئەگەر راستدەکەن ئێوە لەژێر هێزو دەسەڵاتی خوادا نین و دەربارەی کردە وەکانتان لێتان ناپرسرێتەوە. دەی کەوایە بۆچی گیان بەبەر ئەو مردووەدا ناکەنە وەو دەهێڵن بمرێت!

ئەمە یەکەمین مانای وشەی ئاینە لەزمانی عەرەبیدا. کەزیاتر بۆی ڕۆدەچێت هەموو ماناکانی عەقیدەو خواناسین لەمەوە وەردەگیرێت. بۆ نموونە کەدیراسەیە کی سیفەتی (خلق) یان (ملك) یان (ضرر) یان (نفع) دەکەیت بەرفراوانیەکی یە کجار زۆرت بۆ دەردەکەوێت بۆ نموونە بڕوانە ئایەتەکانی. ئینجا ئەگەر ئایەتی تر کەووشەی خالقی تێدایە یان خلائق، هەروەها وەرگێراوەکانی تری ڕەگی خلق دەبینیت پەیوەندیەکی زۆر قوڵی ئیمانیانە هەیە لەنێوان هەموو سیفەتەکاندا. پەیوەندی نێوان ناسینی خوای گەورە بەسیفەتێکی کەکردگاریتیە (کەیەکەمین مانای دین ڕوونی دەکاتەوە) لەگەڵ پەرستن (کەمانای دووەمی ووشەی دینەکەیە) لەم ئایەتەدا: (ذَلِكُمُ اللّهُ رَبُّكُمْ لا إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَاعْبُدُوهُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ) ١٠٢ الانعام

واتە: ئا ئەوە پەروەردگاری خاوەنتانە کە هیچ خوایەکی تر نیە شیاوی پەرستن بێت جگە لەو. ئەو کەکردگاری هەموو شتێکە. دەی بیپەرستن، خۆ ئەو ئاگادارو چاودێری هەموو شتێکە. لەمەوە هەست دەکەیت کەخوای گەورە کەکردگارە شایەنی پەرستنەکەیە. ئەوی کردگار نیە چۆن کراوە بەپەرستراو؟! ئەدی ئەوەی دەپەرسترێت بۆچی هیچ شتێك ناتوانێت دروستبکات.. بۆچی سێڵێکی پێ دروست ناکرێت؟!

وەك دەفەرموێ: (أَيُشْرِكُونَ مَا لاَ يَخْلُقُ شَيْئاً وَهُمْ يُخْلَقُونَ) ١٩١ الاعراف

واتە: شەریکی وا بۆ خوای گەورە دادەنێن کەهیچ شتێکی پێ دروست ناکرێت، خۆشیان دروست کراون !!

یان سەیری پەیوەستکردنەوەی ماناکانی خواناسی و ڕێبازەکەی بکەرەوە (کە مانای سێیەمی زاراوەی دینە. پاشان چۆن ڕاتدەکێشێتەوە بۆ مانای چوارەمی زاراوەی دین (کەڕۆژی دواییە کە ڕۆژی پاداشت و سزایە. وەك ئەم ئایەتە: (وَهُوَ

**الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ بِالْحَقِّ وَيَوْمَ يَقُولُ كُن فَيَكُونُ قَوْلُهُ الْحَقُّ وَلَهُ الْمُلْكُ يَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّوَرِ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ) ٧٣ الانعام**

واتە: هەر ئەوە کە ئاسمانەکان و زەوی بەهەقیانەت لەنەبوموە دروستکردووە، ئیدی ئەو ڕۆژەی کەدەفەرموێ ببەو دەبێت! فەرمایشتی هەقەو دەسەڵاتی ئەوێ ڕۆژێ بەتەنها هەر هی ئەوە کە فوو بەکەڕەنادا دەکرێت. ئەو زانای دیارو نادیارە و داناو شارەزایە.. لەسەرەتاوە باسی خەلق دەکات کەهێنانەبوونە لە نەبوومەوە، هێنانەبووی یەك شت و دوو شت نا، هی ئەو هەموو ئاسمانانەو زەوی و هەرچییان تێدایە! لەکەشکەشانی ئەستێرەی ئاسمانەکانەوە کەتا ئێستا ٦٤ ملیار کەشکەشان کەشفکراوە، هەریەکەیان ملیارات ئەستێرەی تێدایە! بۆ سێڵی لەش کەشەش ملیار سێڵە!! بۆ ئەلیکترۆنە بزواوەکانی دەوری ناوکی ئەتۆم، کەئە ژماردنی ئەستەمە!! ئەو کردگارەی ئەمانەی دروست کردوە دەسەڵات و تواناشی وایە کەبەوەی تەنها بیەوێت بفەرموێت: ببە، بووە، (بفەرموێت) و (بووە)ـە کە هەواڵی دوای بوونی ویستی خواو پەیدابوونەکانن!! راڤەیە بۆ تێگەیشتنی ئێمە، نەك بۆ دواکەوتنی زەمان!! بڕوانەبەشێوەی گیردان و تایبەتمەندێتی دەفەرموێ (**لَهُ الْمُلكُ**) دەشێت بفەرموێت (**الملكُ لَهُ**) بەپێشخستنی موبتەداکە (الملكە)، بەڵام (**لَهُ الْمُلكُ**) (**لَهُ**) لەزمانی عەرەبیدا وا ئیعراب دەکرێت کە (شبه الجمله من الجار والمجرور خبر مقدم) ئەمەش کاتێك دێت کەهەموو موڵکێتیەکە تایبەت دەکرێتە وە بەخوای کردگارەوە!! دوایی دەفەرموێ (**عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَه وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ**) واتە: زانا بەهەرچی دیارەو هەرچی لەئێوە نادیارە! نافەرموێت: دەزانێت، بەڵکو زانایە، چونکە یەکەمیان کردارەو دەبێت دووپات ببێتەوە، بەڵام دووەمیان (زانا) سیفەتێکی زاتیەو لەخودی خوای کردگار جودانیە، ئینجا کۆتایی بەوەدە هێنێت کەخوای گەورە دانایە، واتە هەموو شتێك لەکات و شوێن و بەپێی پێویستی ئەو شتە دەکات! وەك بەریزبەندیە جوانەکەی خۆی دەفەرموێ: (**الّذی خَلَقَ فَسَوَّى. وَالَّذِى قَدَّرَ فَهَدَى**) ٢-٣ الاعلى

واتە: سوپاسی ئەو خوایە بکە کەخەڵقی کردووە، ئینجا بەپێی پێداویستی زەمان و مەکان سازاندوێتی، ئینجا هەموو شتێکی بۆ تەقدیرکردووەو ڕێنمایی کردووە!!

هەموو شتەکانی بۆ گونجاندوە، یاساو ڕێسای خۆی وەك خەتی شەمەندەفەر بۆ دروستکردومو هێزی زاتی خۆی تێدا قایمکردومو نەخشەکەی داوەتێ و خستوێتیە گەڕ، ئیتر بەردموام بوون و ڕۆیشتنی بەپێی نەخشە خواییەکە بەرپرسێتی خۆیە تی، ئینجا دەفەرموێ؛ وەك دانایەو هەموو کارێك لەکات و جێی خۆیدا دەکات (خبیر)یشە، شارەزایە.. شارەزاییەکەی جەنابی ئەو خۆ لەئەزموونەوە نەهاتووە، ئەو ئەو زانیاریەی هەبوو پێش دروستکردنی زەمان و مەکان!!

ئاوا لەلێوردبوونەوە ڕاڤەکردن و ورد سەرنجدانی ئایەتەکانی خواناسی وەك باسە کانی (الخلق، الملك، الضرر، النفع، الاحیاء الإماتە، التسییر و التصویر و الاسقاء و الاطعام و..هتد) ڕوح و بیرو دەروون بەرەو ئاسۆیەکی تر دەشنێن و هەست بەمە ودایەکی تری جیهانی بەرفراوانی خواناسی ئیسلامەتی دەکەن[20].

**مانای دووەمی دین:**

دووەم؛ گوێڕایەڵی کردن و بەندایەتی و خزمەتکاری و ژێردەستەیی و بەقسە کردن و قبوڵکردنی فەرمان و ژێردەستەیی و ملکەچ بوون لەژێر دەسەڵاتیدا..

دەڵێن: (دِنْتُهم فَدانُوا) واتە: ناچار و ژێربارمکردن و ئەوانیش گوێڕایەڵییان کردم وە(دِنتُ الرجل): خزمەتی کابرام کرد لەفەرمودەی پێغەمبەریشدا صلی‌الله علیە وسلم هاتووە: (أُریدُ مِن قُرَیشٍ کَلِمَه تُدِینُ بها العرب) (فەرمودەکە بەلاوازی هاتووە لە سیرەدا) واتە: قسەیەکم لەقوڕەیش دەوێ کەعەرەب بۆی ملکەچ و گوێڕایەڵ بن و لەبەردەمی سەریان نەوی دەکەن. هەر بەم مانایە وشەی (دین) لەباسی خەواریجدا هاتووە، کە (یمْرُقُونَ مِن الدِّینِ مُرُوقَ السَّهْمِ مِن الرَّمِیَّه) واتە: خەواریجەکان زۆر خێرا لەگوێڕایەڵیکردنی پێشەوا دەردەچن بەچەشنێك کەتیر لە کەوان دەردەچێت[21].

---

[20] جیهانبینی ئیسلام.. م. کرێکار لاپەڕە ٢٧ – ٢٨

[21] هەمان سەرچاوە

**مانای سێیەمی دین:**

بەواتای شەرع و یاسا، دەستورو بەرنامە، ڕێگەو ڕێباز، باوو نەریت، کە دەڵێن: (مازال ذلك ديني ودَيدَني) واتە: هێشتا ئەوە خوو نەریت و عادەتی منە، یان کە بۆ کەسێك کە لەسەر خێرخوازیی ڕاهاتبێت، یان لەسەر شەڕخوازی ڕاهاتبێت دە ڵێن (دان).

خوای گەورە دەفەرمویَ: (إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ) ٤٠ یوسف

واتە: حوکمکردن و فەرمانڕوایی هەر هی خوای گەورەیەو بەس ئەو فەرمانی بەوەداوە کەغەیری ئەو نەپەرسترێت، ئا ئەمەیە بەرنامەو دەستوری ڕێکوپێك، یان: (أَمْ لَهُمْ شُرَكَاء شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ) ٢١ الشوری

واتە: چما ئەوانە سەرێکیان هەیەو بۆ خوایان دیاری کردووە تا یاساو ڕێسای وایان بۆ دارێژن کەخوای گەورە پێی ڕازی نییەو ڕێی پێنادات.

لەفەرمودەی پێغەمبەریشدا صلی‌الله علیه وسلم هاتووەکە: (كانت قُرَيشُ ومَنْ دانَ بِدِينِهم)

واتە: قورەیش و ئەوەی لەسەر ڕێگەو باوو نەریتی قوڕەیش بوو لەم مانایەوە کە لەوەسفی پێغەمبەردا صلی‌الله علیه وسلم هاتووە، کە (كانَ على دينِ قَومِه) واتە لەسەر عادەت و بارو ڕێ و ڕەسمی قەومەکەی خۆی دەڕۆیشت. ئەمەش ئاشکرایە کەژنهێنان و تەڵاق و هەڵوێست و سیاسەتیش دەگرێتەوە[٢٢].

[٢٢] جیهانبینی ئیسلامی.. م. کرێکار ل ٣١

**مانای چوارەمی دین:**

سزاو پاداشت دانەوە، خەڵات کردن و بڕیاردانی حوکم و لێپرسینەوە:

لەپەندی پێشینانی عەرەبدا هاتووە: (كَمَا تُدِينُ تُدانُ) واتە: چی بەسەر خەڵکیدا بێنیت، هەر ئەوەت بەسەردا دێننەوە.

خوای گەورەدەفەرموێ: (مالِكِ يوْمِ الدِّينِ) ٣ الفاتحه. واتە: خاوەنی ڕۆژی پرسینە ومو سزاو پاداشت. یان کەقورئانی پیرۆز گوفتارو قسەی بێ باوەڕان ـ بەم مانایەـ دەگێڕێتەوە کەدەفەرموێ: (أإنَّا لمَدِينونَ) واتە: ئایا ئێمە لێمان دەپرسرێتەومو سزای خراپەکاریمان هەیە؟!

لێرموە وشەی (الدَّيَّان) بەمانای قازی و داوەری دادگا دێت، بۆیە کەلەیەکێك لە زاناکانیان دەربارەی سەیدنا عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب پرسی، لەوەلامیدا گوتی: (انه كان ديان هذه الامه بعد نبيها) واتە: ئەو گەورەترین قازی ئەم ئوممەتەبوو دوای پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه وسلم.

کەوابوو دین لەدیدی ئیسلامدا بریتییەلەلایەنێکی تیۆری: کە لەسێ زاراوەدا دەردەکەوێت: (باوەڕ، خواپەرستی، شەریعەت) کەدەبێتە بناغەی دامەزراندنی لایە نە عەمەلییەکەی ئیسلام لەسەری، کەبریتییە لەدارشتنی عەمەلی موسڵمانان و ئاراستەی کۆمەڵکارییان و پیادەکردنی دینەکەیان لەژیان و قەوارەیەکی سیاسی کۆمەڵایەتی واقیعیدا. ئەمەش ناسین و شارەزابوونی سێ زاراوەی تر دەخوازێت کە بریتین لە (ئیسلام، ئوممەت، بزاف)[٢٣].

هەموو گوتارێکی ئاینی چەند خاڵێك لەخۆی دەگرێت، هەریەك لەو خاڵانە وەڵامی کۆمەڵێك پرسیاری فەلسەفی و فکری ئەداتەوە کەلەناو خودی ئاینی ئیسلامەوە سەرچاوەیان گرتوە.. هەریەکێك لەو وەڵامانە ناخی تاك و کۆمەڵگاو تەنانەت دەسەڵاتیشە، سەرەکیترینیان ناسینی خوای پەروەردگارە، هەرچەندە زۆرێك لەو بیرمەندو سیاسیانەی کەلەبواری زانستە سیاسیەکاندا کاریانکردوە

---

[٢٣] جیهانبینی ئیسلامی.. م. کرێکار ل ٣١

کەسیان باسیان لەگوتاری ناسینی خوای پەروەردگار نەکردوە، بەڵکو ڕاستەوخۆ باسی یەکتاپەرستی خواو پەروەردگاریتی خوای موتەعالیان کردوە، کەنوسەر - پێی وایە، پێش ئەوەی لاپەڕەیەکی نوێ لە سەر گوتاری یەکتاپەرستی.. پێویستە ناسینی خوا ڕوونبکرێتەوە پاشان ناساندی خوای پەورەردگار، ئینجا شیکاری بۆ بکرێت لەڕووی یەکتاپەرستییەوە - کەواتە، پێویستە بزانین خوا چیەو چۆن بیناسین..

## خاڵی یەکەم: گوتاری خواناسی:

خواناسی بەسێ شێوەو یاخود سێ تێگەیشتن دەتوانی خوا بناسین، ئاینی پیرۆزی ئیسلام و لەڕێگای بیروباوەڕەوە (العقیدە). ئەم سێ بەشەی لەناو بیروباوەڕیدا جێگاکردۆتەوە کەبریتین:

١- خواناسی بەناخ و دڵ و دەروون، لەدیندا بەفیطرەت ناونراوە، واتە، مرۆڤ بەسروشتی خۆی واهەڵکەوتووە واتە، خۆرسك، (مەبەست بەسروشتی خۆی خۆرسکە) کەخواناس بێت واتە، حەزی پەرستنی هەبێت، چونکە مرۆڤ بوونەوەرێکی ديندارە لەدێر زەمانەوە.. ئەگەر ئاینی پێنەگەیشتبێت ئەوا خۆی بۆخۆی ئاینی دروستکردووە، وەك هیندییەکان و ئەسکەندیناڤیا و باکووری ڕوسیاو هیندیەسورەکانی ئەمریکا.. تاد.

٢ - خواناسی بەدروستکراوەکانی خودی زاتی پەروەردگار خۆی، کەلەزمانی ئایندا بەقورئانی گەردوون ناسراوە (القران الكوني، كتاب الله المقروء).. ئەم هۆکارەیان زیاترَ دەبێتە ناساندنی خوای پەروەردگار لەئاینەکەدا، کەناسراوە بەگوتاری ئاینی، لەڕووی بانگەوازی ئاینەکەوە بۆ زانستی گەردون و مرۆیی و تەندروستی..هتد.

پێش ئەوەی باسی نموونە بکەین پێویستە خوێنەر لەوە ئاگادار بێتەوە، کەئاین واتە، دینی ئیسلام، زانست نییە، بەو مانایەی زانستێکی معریفی ڕوت بێت،

چونکه زانست شتی کۆنکریتیەو چەسپاوە.. ئاین بەرزترە لەزانست و لەفیکرو لەفەلسەفەش، چونکە زۆر پرسیار هەیە هەرگیز زانست ناتوانێت وەڵامی بداتەوە.. ناچار فیکر وەڵامی بۆ دەستەبەر دەکات، هەندێك پرسیاری دیکەش هەیە، کەفیکر ناتوانێت وەڵامی بداتەوە فەلسەفە بۆی دەستەبەردەکات و فەلسەفەش ناتوانێت وەڵامی هەموو پرسیارێك بداتەوە، ئاین وەڵامی هەموو پرسیارێك ئەداتەوە.

کەواتە ئاین دەبێت وەك خۆی تەماشا بکرێت، کەئاینێکە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە هاتووە، ئەو بیردۆزە زانستی، یاخود ئەو موعجیزە زانستیانەی کەتێیدایە، تەنها بۆ سەرنجڕاکێشانی گوتاری ئاینیەو بۆ ناسینی خوای بەرزو باڵایە بۆ ئەوەی زیاتر ئیمان و باوەڕ بداتە ئەو کەسانەی، کەلەگومان و دوودڵیدان.

نموونەی زانستی لەقورئان و سونەتدا زۆرن، لێرەدا پێویست ناکات شیکاری بکرێت لەسەر ئیعجازە زانستیەکان، باسی ئێمە نیە لەم پەرتوکەدا، بەڵکو تەنها ئاماژەی پێ دەدرێت لەوانە: زانستە گەردوونیەکان کەئاینی ئیسلام لەقورئان و فەرموودەدا ئاماژەی بۆ کردووە، زاستە تەندروستی و مرۆیەکان، زانستە جیۆلۆجیەکان، زانستە مێژوویەکانی گەلانی پێش خۆمان.. هتد، مەرج نیە مرۆڤ پەی بەرێت بەهەموو ئەو باسانەی قورئان کردویەتی، زۆرجار لەڕێگای خودی زانستەکانەوە مرۆڤ خوای پەروەردگار دەناسێت و خواناسی لەدڵ و دەرونیدا برەو پێئەدات و دوای دەگەڕێت بەشوێن ئەوەدا چۆن لەخواناسینەوە خواپەرستی بکات.

٣ ـ ناسینی خوای پەروەردگار لەڕێگای قورئانەوە، کەناسراوە لەگوتاری قورئانی (کتاب الله المنظور) لەڕێگای ئەو ئایەتانەوە کەخوای گەورە خۆی پێناساندووە بۆ بەندەکانی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم- ڕۆشنکردۆتەوە بۆ شوێنکەوتوانی ئاینی ئیسلام. لێرەدا لەوانەیە خوێنەر بڵێت: ((ئەگەر گوتاری خواناسی بوونی هەبێت لەگوتاری سیاسی ئیسلامیدا بەش بەش کردنی و پۆلێکردنی بۆچیە؟))

لەوەلاَمدا دەڵێین: ((ئەگەر سەرەتایەك نەدەین لەڕووی خواناسی دوای ئەوە تێگەیشتمان نیە لەڕووی خاڵبەندیەوە بۆ ناسینی خوا چونکە لەخاڵی دووەمدا باسی ناساندنی خوا دەکەین کەخوا چۆنەو چیەو چۆن پێناسەی زاتی پیرۆزی خۆی کردوە، کەگوتاری ئاینی ئیسلام سەرەکیترین گوتاری یەکتاپەرستیە، ئەمەش دەبێتە هۆکاری ناساندی زاتی خوایەتی و پەروەردگاریتی و لەگەڵ ناوە پیرۆزەکانی. کەزانای پایەبەرزی ئیسلام ئیبنو تەیمیە پۆلێنی کردووە بۆ سێ بەش، بۆئەوەی زیاترو زوترو ئاسانتر موسڵمانان وەریبگرن.

**خاڵی دووەم: گوتاری یەکتاپەرستی:**

خوای پەروەردگار تاکە، یەکتاپەرستیش سەرچاوەکەی لەتاکی خوای گەورەوە هاتووە کەنەهاوبەشی هەیەو نەهاوکارو نەیارمەتیدەرو نەپێویستی بەهیچ خوایەکی تر هەیەو نە پێدوایستی هەیە بەهیچ لەدروستکراوەکانیەتی.

ئەم گوتاری یەکتاپەرستیە دەسەلاَت و فەرمانڕەوای و یان جوانتر بڵێین هەموو سیستەمەکانی ژیانی لەسەر دادەمەزرێت، کەکرۆکی بیروباوەڕی ئیسلامیە وەك لەخاڵی یەکەمدا ئاماژەی پێکراوە، ئەویش پێکهاتووە لەسێ بەش خوایەتی و پەروەردگاریتی و ناو و سیفاتە پیرۆزەکانی.

١ ـ یەکتاپەرستی خوایەتی: ئەم بەشە گرنگترین بەشی ژیانی مرۆڤە کەدێتە ناو ئیسلامەوە، تەنانەت هەموو پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێت، خوا تەنها بۆ ئەوە ناردونی بۆ سەرگەل و نەتەوەکانی خۆیان تاکو پێیان بڵێن: اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ. ٦١ هود

واتە: هاتوون تاکو خوا بەتاك و تەنها و بێ هاوتا بەیەکتاپەرستی خوایەتی بە گەل و نەتەوەکانیان بناسێنن.

کەواتە خوای گەورە پێغەمبەرانی ناردووە بۆ ئەوەی گەلانی تر لەشیرك و هاوەڵدانانەوە بەرەو ناسینی خوای تاك و تەنها بەرن.

واته کەوتوونەتە شیرك و هاوەڵگیری بەندایەتییەوە، بەندایەتی جگە لەخواو هاوارکردن جگە لەخوا، داوای کۆمەك و فریاکەوتن جگە لەخوا، ئومێدی زیانگە یاندن و سوود پێبەخشین جگە لەخوا، سەربڕین بۆ جگە لەخوا، نەزرکردن بۆ جگە لەخوا، باوەڕبوون بە کەسێکی تر جگە لەخوا -سبحانەو تعالی - پەنهان دەزانێت یان هیچ کاروبارێکی ئەم بوونەی بەدەستە، شیرك و هاوەڵگیریی لەم بابەت و مەسەلانەدا دروستبووە، کاتێك خەڵکی پاش دە سەدە تەوحیدو یەکخواپەرستی، کەوتنە شیرکەومو هاوبەشیان بۆ خوا بڕیاردا وەك خوای گەورە دەفەرموێت: كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فَبَعَثَ اللَّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ ٢١٣ البقرة.

واتە: (لە سەرەتای پەیدابوونی خەڵکی دا، دوای تۆفانەکەی نوح) خەڵکی، یەك ئوممەت بوون و خاوەنی بیروباوەڕی یەکتاناسین بوون، (بەڵام بەرە بەرە لایان دا) خوایش وتڵی نەکردن و پێغەمبەرانی ڕموانە ، تا مژدە دەر و ترسێنەر بن بۆیان،

دە سەدە لەسەر یەکتاپەرستی بوون و بەتەنها خوایان دەپەرست، هەتا شەیتانە کان هاتن و لەئایینەکەیان دەریان هێنان، لەیەکتاپەرستی و خواناسییەوە بەرمو شیرك و هاوەڵگیریی لایاندان و گۆڕیانن، ئیتر بەمشێوەیە یەکەم گەلێك لە نەوەی ئادەم تووشی شیرك هاتن و وازیان لەتەوحید هێنا گەلی نوح بوو سە لامی خوای لێ بێت، ئەویش کە بەهۆی بەگەورەگرتن و پیرۆزکردنی ئەولیاو د ۆستانی خواوە بوو، کەخەڵکی گومانی خێر و چاکەی پێیان هەبوو، ئەمە بووە هۆی پاساو و ڕێگەیەك بۆ کەوتنە ناو شیرك و لادان لەیەکتاپەرستی.

قورئان بۆمان باس دەکات کەئەو گەلە پیاوچاکەکانی خۆیان وەك (وەدو سواع و یەغوس و یەعوق و نەسرا) وەك خوایەك دەپەرست و لەخواری خواوە هاواریان لێ دەکردن، ئەمانە پیاوچاکانی گەلی نوح بوون، هەروەك لەو فەرموودەیەدا هاتووە کەئیمامی بوخاری لەصەحیحەکەیدا هێناویەتی، شەیتان کەویستی گەلی نوح گومڕا بکات پێی وتن: لو صورتم هَؤُلاءِ وعملتم لهم التماثيل لتذكرتم عبادة

**هَؤُلاءِ لله، وتذكرتم قربهم من الله تَبَارَكَ وَتَعَالىَ، فعبدتم الله ـ سُبْحَانَهُ وَتَعَالىَ ـ مثل ما يعبده هَؤُلاءِ..**[٢٤]

ئەگەر وێنەی ئەمانەتان بکێشایەو پەیکەرتان بۆ داتاشینایە ئەوە یادتان دەهاتەوە کەئەوانە چۆن بەندایەتییان بۆ خوا دەکرد. وە یادی نزیکی ئەوانەتان دەهاتەوە لەخواوە. ئەوکات وەك ئەوان چۆن بەندایەتییان کردووە. ئێوەش ئاوەها خواتان دەپەرست و لێی نزیك دەبوونەوە. ئیتر ئا بەم جۆرە شەیتان لەسەرەتادا ئەم کارەی لا جوان و شیرین کردن. پەیکەرەکان دانران تاکو تەنها بیری بەندایە تیکردنی خوایان بێتەوەو بەس.

پاشان چەند وەچەو نەوەیەك بەدوادا هاتن. عیلم نەما و زانست نەسخ بۆوە. وازیان لەخواپەرستی هێنا و کەوتنە پەرستن و هاوارلێکردنی پیاوچاکەکان. ئیتر هەر بەمجۆرەیە نەریت و باوی نەتەوەکان. پاش تێپەڕبوونی چەند وەچەو نەوەیەك مەبەستی سەرەکی کە لەپێناویدا بیدعەکە داهێنراوە یان پەیکەرەکە داتاشراوە لەبیرئەچێتەوە. ڕاستەوخۆ دەچنەناو مەبەستەکەومو وێنەکەیان پەیکە رەکە دەکەنە خوایەك و هاواری لێ دەکەن و لەخواری خواوە دەیپەرستن.

ئەم پیاوچاکانە کرانە خواو پەرستران و یەکخواپەرستی لەبیرچوومومو هاوەڵ و هاوەڵگیری باڵی کێشا بەسەر گەلی نوحدا سەلامی لێبێت. جا ئەمە یەکێکە لە هۆکارەکانی ڕوودانی شیرك لەنەوەی ئادەمدا. ئەوەش ئەوەیە. کە خوا ـ سبحانەو تعالی ـ باسیکردوە لەهاوسەنگیکردن و یەکسانیکردنی کەسانی دیکەیە لەگەڵ خوادا کەخوای گەورە لەبارەیەوە دەفەرموێت: (**الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ ثُمَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ**) ١الأنعام

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایە کەئاسمانەکان و زەوی دروستکردوە. تاریکی و ڕووناکی فەراهەم هێناوە کەچی لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە بەهێزو سەرسام

---

[٢٤] رواه عبد بن حميد كما ذكره السيوطي في الدر المنثور (٨ /٢٩٤) من حديث محمد بن كعب.

ئاوارانەدا، پاشان ئەوانەی بێباوەڕ بوون بەپەروەردگاریان یەکێك لەدروستکراوەکانی خوا دەکەنە هاوتای خوا.

وە لەئایەتێکی تردا لەگێڕانەوەی بارو گوزەرانی هۆزو گەلانی ئاگر کە لەدۆزەخدا سەرکردەو دەمڕاستەکانیان دەڵێن: دەفەرموێت: ( تَاللَّهِ إِنْ كُنَّا لَفِي ضَلالٍ مُبِينٍ * إِذْ نُسَوِّيكُمْ بِرَبِّ الْعَالَمِينَ). ٩٧ ـ ٩٨ الشعراء
واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە لەگومڕاییەکی ئاشکرادا دەژیاین کاتێك کە ئێوەمان دەبردە ڕیزی پەروەردگاری جیهانیانەوەو یەکسانمان دەکردن لەگەڵ یەکدا..!

ئەوانەی کەسانی تریان کردۆتە هاوشانی پەروەردگار، لەو باوەڕەوە نەبووە، کە کەسێکی تری جگە لەخوا بتوانێت دروستبکات، یان ڕۆزی بدات، یاخود سوود بگەیەنێت، یان زیندوو بکاتەوە، یان بمرێنێت، یاخود کارەکان ڕێکبخات، یان باران ببارێنێت، بەڵکو شیرکی ئەوانە لەخۆشەویستی و بەگەورەو پیرۆزگرتندا بووە، کە سانی دیکەیان لەمانەدا کردۆتەهاوشان و هاوتای خوای پەروەردگار، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَتَّخِذُ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَنْدَاداً يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبّاً لِلَّهِ ..) ١٦٥ البقرة

واتە: (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە ئاشکرایانەدا) هەندێ کەس هەیە لەجیاتی ئەوەی کە خواپەرست بن، شتی تر دادەتاشن بۆ خۆی و (شوێن ڕینمەنیەکانی خوا ناکەوێ و) خۆشەویستی و سۆزی دەدا بەو بت و بەرنامۆلکەو تولە ڕێگایانە و خۆشی دەوێت، بەڵام ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە خوایان زۆر زیاتر خۆش دەوێ (هەر بەراورد ناکرێت) جا ئەوانەی کە ستەمکارن کاتێ کە ڕووبەڕووی سزا دەبنەوە.....

کە ئەمە لەگەورەترین و ترسناکترین دەرگاکانی شیرکە..

لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە ئاشکرایانەدا.. هەندێ کەس هەیە لەجیاتی ئەوەی کە خواپەرست بن، شتێ تر دادەتاشن بۆ خۆی و شوێن ڕێنماییەکانی خوا ناکەوێ، خۆشەویستی و سۆزی دەدا بەو بت و بەرنامۆلکەو تولە ڕێگایانە و خۆشیدەوێت لەجیاتی خوای پەروەردگار، بەڵکو زیاتریش.

کەواتە یەکتاپەرستی خوایەتی لەگوتاری سیاسی ئیسلامیدا ئەوە ڕوون دەکاتەوە کەبێجگە خوای بالآ هیچ پەرستراوێك نیەو هیچ کەس هاناو هاوار جگە لەخوای پەروەردگار بۆ هیچ دروستکراوێکی تر نابات بەناوی پیاوچاك و عابدو خواناسەوە...

لەپێویست ڕاگرانی ئەم یەکتاپەرستیە ئەوەیە: کە هاوەڵگیرانی ڕابوردوو هەرچەندە لەکاتی خۆشی و گوشادیدا هاواریان لەپیاوچاکان و پێغەمبەران و نزیکانی لای خوا دەکرد، بەڵام کاتێك سواری کەشتییەك ببوونایە لەهەموو لایە کەوە باو بۆران بەرەو ڕوویان بهاتایەو شەپۆل گەمارۆی بدانایە، یان تووشی تە نگەشەیەك بهاتنانە، دەگەڕانەوە دڵسۆزانە پەنایان بۆ خوا دێناو، بەکوڵ هاواریان دەکردو داوای کۆمەك و دەربازبوونیان دەکرد، ئەمە بەپێچەوانەی شیرك و هاوە ڵگیری پاشینەکانە، ئەبینن کە تەنانەت لەکاتی تەنگەشەو نارەحەتیشدا هەر هاوار جگە لەخوا دەکەن و لێیان دەپاڕێنەوە.

ئەمەش کە گەورەترین و سامناکترین بەڵاو موسیبەتە ئەم ئوممەتە تێی کە وتووە، ئەوەیە کە باوەڕیان وایە، کە جگە لەخوا کەسێکی دیکە دەستی هەیە لە پەروەردگارێتی و بەڕێوەبردنی بوونەوەردا، لەخوا داواکارین لەسەری هەڵگرێت و لەناویاندا نەمێنێت، هاوەڵگیرانی سەردەمەپێشووەکان بەمشێوە نەبوون و باوە ڕیان وا نەبووە، ئەوان باوەڕیان وابوو کە خواکانیان تەنها تکاکارو نێوەندن لە نێوان ئەوان و خوادا، لەخوا نزیکیان دەکەنەومو خۆیان هیچیان بەدەست نیە، بەڵام هاوبەشدانەرە پاشینەکان بەجۆرێك باوەڕیان بە خواکانیان توندە کەتوانای دروستکردن و مردن و ژیان و ڕۆزیدانیان هەیە، ئەمەش بەڵگەی داڕوخان و پلە نزمیی و بێ ئەرزشییانە، چونکە بەڕاستی هەرچەندە مرۆڤایەتی بەرەو دواتر

بێت لەپەیام و هیدایەتی پێغەمبەران دوورتر دەکەوێتەوەو شیرك و دارمان و وێرانبوونی زیاد دەکات پەنا بەخوا.
بەداخەوە گەورەترین و ئاستەمترین و نەهامەتیش ئەوەیەکە ئەم هاوبەشدانانە لەناو گەلێکدا ڕوویدات کەخۆیان بەئوممەتی محەممەد دەزانن (صلی الله علیه وسلم)، کەسانێك باوەڕیان وایە کە قوتبەکان یان نەجیب و خانەدانەکان یان ئە بدالەکان یان ئەولیاو پیاوچاکەکان سوودو زیان و دروستکردن و ڕۆزیدان و دە ستێوەردانیان لەکاروباری بوونەوەردا بەدەستەو لەسەر ئەم کارانە کاریگەرییان هەیە، لافی ئەوە لێدەدەن کە خوای گەورە کاری دەستێوەردانی بوونەوەری داوە تەدەستی ئەوانە، بەئارەزوی خۆیان دەست ئەخەنە کاروباری بوونەوەرەوە، جا بۆئەوەی چاوبەستی لەخەڵکی بکەن کاتێك پێیان بگوترێت: هەر خوایە کاروباری بوونەوەری بەدەستەو جگە لەو کەسی تر ئەو مافەی نییە، دەڵێن: بەڵێ، کاروباری بوونەوەر بەدەستی خوایە، بەڵام خوا هەرکەسێکی بووێت پێی دەبە خشێ و دەتوانێت لەموڵکی خوادا چی بووێت بیکات و بۆی بەجێ بێت، ئەمەش لەخراپترین و بەتاڵترین نارەوایە، چونکەخوای گەورە ئەگەر ڕێز لەیەکێك لەبە ندەکان یان پیاوچاکان بگرێت، مانای ئەوەنیە کە هیچ تایبەتمەندییەکی خوایەتی دەداتە ئەو بەندەیە، ئەوە تەنها مافی خوایە هیچ کەسێکی تر بەشدارنییە تێیدا، هەر لەپێناوی ئەوەدا ئاسمانەکان و زەوی دروستکردوە، فریشتە نزیکەکان و پێغە مبەران و نێردراوەکان، پاشانیش لە دوای ئەوان بەندەکانی خوا و هەموو خەڵکی بەگشتی خواپەرستی دەکەن و ڕوودەکەنە خواو کارو پیشەیان بەندایەتییە، بە هیچ شێوەیەك و بەهیچ جۆرێك ڕەوا نییە هیچ کەسێك تایبەتمەندییەکانی ئولوهییەتی پێبدرێت و بەشداربێت تێیدا.

بەڵکو ئەمە بەدرۆخستنەوەیە بۆ ئەوەی لەقورئان و سوننەتداو لەسەر زاری هەموو پێغەمبەران بەگشتی هاتووەو جێگیر بووە کە بەتەنها هەر خوا مافی خوایەتی و ئولوهییەتی هەیەو هیچ کام لەدروستکراوەکانی بەشداری و هاوبەشی نین.

خۆ ئەگەر وتیان، خوا خۆی مافی دەستێوەردانی داوە بەو ئەولیاو دۆستانەی خۆی لەبوونەوەردا، تواناى زیندوکردنەوەو مراندن و ژیان ڕۆزیدانی پێداون.. ئەمە ئیتر لەڕووکەشترین بەتاڵ و نارەواییە کەموسڵمان بەفیترەی خۆی دەزانێت کارێکی بەتاڵەو ڕەتکردنەوەی بەڵگەنەویستە، چونکە زانستی دڵنیا بەخشی هەیە کە خوای گەورەپێغەمبەرانی پێشوو و پێغەمبەری خۆشمانی تەنها بۆ ئەوە ناردووە تاکو بە تەنهاو بێ هاوەڵ زاتی خوا بەخەڵکی بناسێنن و لە ئولوهییەتیدا بەتاك بگیرێت. وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: (وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولاً أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ..) ٣٦ النحل

واتە: دەی چۆن ئیتر خوای گەورە کەسێکیتری جگە لەخۆی ئەکاتە هاوەڵ و هاوشانی خۆی و وەك تاغوت و لە سنوردەرچویەك ڕێی پێ دەدات خەڵکی بیپەرستن و هاواری لێ بکەن؟!

لە کۆتایدا ئەم خاڵە هەرچەندە باس و خواست و زیاتر شی بکەینەوە گرنگی و تایبەتمەندی خۆی هەیە، وەك ئاماژەم پێدا هەموو سیستەمەکانی ژیانی لەسەر دامەزراوەو پەنا بەخوا لەبچوکترین هاوبەشدانانەدا هەموو کارو فەرمانی مرۆڤ پوچ دەبێتەوەو لای خوای پەروەردگار ئەرزشی نامێنێت.

کاری دەسەڵاتی سیاسی ئیسلامی ئەوەیە کەیەکتاپەرستی بچەسپێنێت و شۆڕشی لەپێناودا بکات وەك شۆڕشەکەی محەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب ڕەحمەتی خوای لێبێت[٢٥]

٢ ـ کەیەکتاپەرستی پەروەردگارێتییە، وەك دانپێدانان بەوەی کەخوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە، وە بۆ ئەم جیهانە دوو دروستکەری هاوشێوەنین لەسیفات و کردەوەیاندا، ئەم تەوحیدەش هەقەو هیچ گومانی تێدا نییە، کۆتا مەبەستی زۆرێك لەئەهلی کەلام و تێڕوانین و کۆمەڵێك لە سۆفیەکانە، ئەم یەکتاپەرستیە

---

[٢٥] شرح العقيدة الطحاوية التوحيد الألوهية، الشيخ الدكتور سفر بن عبدالرحمن الحوالي ـ وەرگێرانی، باوکی محمد ل١٠٥

هیچ کۆمەڵێکی دیاریکراو لەنەوەی ئادەم نەهاتوون هەڵیوەشێننەوەو باوەڕیان پێینەبێت، بەڵکو دڵەکان بەفیطرەی خۆیان خۆرسك کراون لەسەر دانپێدانان و باوەڕپێهێنانی زیاتر بەزاتی خوا لەوەی کەداڕێژرابن لەسەر دانپێدانان بە جگەلەو لەدروستکراوەکانی دیکە، وەك پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) کەقورئان لەسەریان دەگێڕێتەوە، ڕوومو گەلەکانی خۆیان وتویانە: (قالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي اللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ....) ١٠إبراهيم

واتە: پێغەمبەرانیان وتیان: باشە، ئاخر گومان لە چی دەکەن؟ ئایا لە خوای پەروەردگاردا گومان هەیە؟! بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی؟!.....

بەناوبانگترین کەسێك کە بەنکۆڵیکردن و گوێخەفاندن بەرامبەر بەپەروەردگاری ناسرابێت فیرعەون بووە، بێگومان کهئەویش لەناوەوەی دەروونیدا دڵنیایی بە بوونی پەروەردگار هەبووە، وەك موسا سەلامی لێبێت پێیدەڵێ: (لَقَدْ عَلِمْتَ مَا أَنزَلَ هَؤُلاءِ إِلَّا رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ بَصَائِرَ وَإِنِّي لأَظُنُّكَ يَا فِرْعَوْنُ مَثْبُورًا ...) ١٠٢الإسراء

واتە: موسا وتی: ئەی فیرعەون تۆ چاك دەزانی کەئەو موعجزانە کەس ئاوا پێشی ناهێنێ جگە لەپەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی، تا بەرچاو ڕوونکەرموەبن و خەڵکی بەڕۆشنی حەق و بینین و لەیەکی جیابکەنەوە، من دڵنیام ئەی فیرعە ون کەتۆ تیادەچیت و لەناودەبرێیت (ئەگەر هەر ئاوا بیربکەیتەوە).

خوای گەورە سەبارەت بەو و بەگەلەکەی دەفەرموێت: (وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنْفُسُهُمْ ظُلْماً وَعُلُوّاً) ١٤النمل

واتە: ئەوانە هەر ڕق ئەستووریان کرد و باوەڕیان پێی نەبوو، بە زۆرداری و خۆبە زلزانی، لە کاتێکدا لە ناخی دەروونیانەوە هەستیان دەکرد کە حەقیقەتەو ڕاستە، دە تەماشا بکەو سەرنج بدە بزانە سەرئەنجامی تاوانباران و گوناهکاران چۆن بوو

وە لەبەرئەوە لەڕووی ئینکاریکردنەوە وتی: (وَمَا رَبُّ الْعَالَمِينَ) موسا پێی وت: (رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا إِنْ كُنْتُمْ مُوقِنِينَ * قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُ أَلا تَسْتَمِعُونَ * قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ آبَائِكُمُ الْأَوَّلِينَ * قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ الَّذِي أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ * قَالَ رَبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَا إِنْ كُنْتُمْ تَعْقِلُونَ) ٢٤ ـ ٢٨ الشعراء..

واتە: موسا وتی: ((پەروەردگار بەدیهێنەری هەموو ئاسمانەکان و زەوی و هەرچیش وا لەنێوانیاندا هەیە ئەگەر ئێوە بڕوادەکەن و دڵنیا دەبن)).
فیرعەون بە لەخۆبایبوونێکەوە بەوانەی دەوروبەری وت: ((خۆ گوێتان لێیە چەندە قسەکانی گەورەن)).
موسا ڕووی کردە خەڵکەکەو وتی: ((خوای جیهانەکان پەروەردگاری ئێوەش و پەروەردگاری باوانی دێرینیشتانە)).
فیرعەون بەگاڵتە پێکردنەوە وتی: ((بەڕاستی وادیارە ئەو پێغەمبەرەی، کە بۆ ئێوە ڕەوانەکراوە شێتە!!))
بەڕاستی کۆمەڵێك لافی ئەوەیان لێداوە، کەپرسیاری فیرعەون لەموسا سەبارەت بەخوا بۆ تێگەیشتن بووە لەماهیەت و چۆنیەتی خوا سبحانەو تعالی، کاتێکیش کەپرسیار لەسەرکراوە کەماهیەت و چییەتی نەبووە ئیتر موسا بێتوانا بووە لەوە لامدانەوە، کەئەمەش هەڵەیە، بەڵکو ئەمە پرسیاری ئینکاری و دانپێدانەنان (جحود)ە وەك هەموو ئایەتەکان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە فیرعەن ملینەداوە بۆ پەرومردگاری و کوفری جحودی بووە (ڕاستی و حەقیقەتەکەی زانیوە، بەڵام هەر ملهوڕی و بێباوەڕی هەڵبژاردووە)، ئەوە نەبووە بوونی خوای سەلماندبێ، داوای شارەزایی لەچییەتی و چۆنێتی خوای لەموسا کردبێ، لەبەر ئەوە موسا بۆی ڕوون کردمەوە، کە ئەوە زانراوە ئاشکرایە، بەڵگەو نیشانەکانی پەروەردگاریێتی ڕۆشنترن و بەناوبانگترن لەوەی کەپرسیاری سەبارەت بکرێت بەوەی کەچییە؟

بەڵكو ئەو زاتە سبحانەو تعالى زانراوترو دیارترو ڕۆشنترە لەوەی کەنەزانرێ و نە ناسرێ، بەڵكو زانینی ئەو لەفیترمو خۆڕسکی مرۆڤدا دامەزراوترمو گەورەترە لە ناسینی هەر ناسراوێك.

لە هیچ تایەفەو کۆمەڵێکەوە نەزانراوە کە وتبێتی: جیهان دوو دروستکەری هاوشێوەی هەیە لەسیفات و کردەوەدا، ئەوەتە دووخواییەکان (الثنوية) لە مەجووسیەکان، مانەویەکان کەدەڵێن، دوو ئەسڵ و بنچینەهەن بۆ ئەم جیهانە، ڕۆشنایی و تاریکایی، دەڵێن کەجیهان لەو دووانەوە دەرچووە و هاتۆتە بوون، ڕێکن لەسەر ئەوەی، کە ڕۆشنایی چاکترو باشترە لەتاریکایی، کە ئەویش خوای سوپاسکراوە، تاریکایی خراپ و شەڕەنگێزو سەرزەنشتکراوە، لەسەر مەسەلەی تاریکاییەکەش لەململانێ و مشتومردان، کەئایا کۆنە یان تازەیە؟ (واتە: هەر بووەیان هاتۆتە بوون).

کەواتە دوو پەروەردگاریی هاوشێوەیان جێگیر نەکردو نەیانسەلماندوە، بەڵام نەسرانییەکانیش، کەبەسێ خوایی دەڵێن، ئەوە بەهیچ جۆرێك سێ خوایان بۆ جیهان نەسەلماندوە، هەندێکیان لەوەیتریان جوداو لێکپچڕاو بن، بەڵكو کۆکن لەسەر ئەوەی کە دروستکەری جیهان یەك دانەیە، دەڵێن: ((بەناوی باوك و کوڕو ڕوحی پیرۆزەوە)) کەیەك خوان، وە ئەو قسەیەشیان کەباس لە لە (ئاوێتە بوون[٢٦] )

دەکات خراپترو بێکەڵکترە، لەبەئەوە لەتێگەیشتن و گوزارش لێکردنیدا هەمیشە لەدڵەڕاوکێ و شێرزەیی و پەشۆکاویدان و نازانن چۆن گوزارشی لێبکەن، لەوە نیە یەکێکیان بتوانێت بەمانایەکی مەعقول گوزارشی لێبکات، لەوەنییە دووانیان

---

[٢٦] ئاوێتە بوون بۆ دیزاینەری بەڕێز بۆی زیاد بکە .. ئاوێتە بوون . جۆرێکە لە بیروباوەڕی هەندیك فەلسفەی ئاینی وەك مانی و صەنوصیەکان و هەندێکیش لە سۆفیگەریەکانی کۆنی هیندستان . کە پیان وایە خوا لەگەڵ لاشەی مرۆڤدا ئاوێتەدەبێت و یەك دەگرێت.بەوە دەوترێت حلوول

لەسەر یەك مانای هاوشێوە بەیەك پێك بێن، ئەوەتە دەڵێن: یەکێکە بەخود، سێیانە بە ئەقنوم..

ئوقنومەکانیش جارێك بەتایبەتمەندی وەسفی ئەکەن و جارێکیش بەوەی کە سیفاتییەتی، جارێکیش بەکەس و خەڵکی، لەڕاستیدا خوا بەندەکانی خۆڕسك کردوە لەسەر تێگەیشتن لە خراپی و بێکەڵکی ئەم قسانە دوای ئەوەی بەتەواوی بینیشیان کردوە، بەگشتی ئەوانە ناڵێن، بەوەی کە دوو دروستکەری هاوشێوەی هەیەو ئەوە بۆ خوا ناسەلمێنن.
مەبەستیش لێرەدا: لەناو گرۆپەکاندا نییە کەدوو دروستکەری هاوشێوە بۆ ئەم جیهانە بسەلمێنێت و باوەڕی پێی هەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆرێك لە ئەهلی کەلام و تێڕوانین و فەلسەفە ماندوبوون لەسەلماندن و جێگیرکردنیدا، هەشیانە کە دانی بە ناتەواوی ئەوەداناوە، کە بتوانێت لەڕێی ژێرییەوە ئەوە بسەلمێنێت و لافی ئەوەی لێداوە، کەلەرێی بیستنەوە وەریگرتووە.[٢٧]

٣ ـ یەکتاپەرستی ناوو سیفاتە بەرزەکانی خوای پەروەردگار: ناوو سیفاتی پیرۆزی پەروەردگار وەك خۆی تەماشا دەکرێت و هاوەڵگیری بۆ دانانرێت و تەئویل و تعطیل ناکرێت و تەشبیهی سیفاتی پیرۆزی ناکرێت وەك ئەقڵگەوار و کەلامیەکان دەیکەن، کەیفیەت و چۆنیەتی بۆ دیاری ناکرێت، نموونە لەسەر خوای پەرومردگارو سیفاتی پیرۆزی نایەتەوە، راستەوخۆ بیشوبهێنیت.. تا ناشوبهێنرێت بەهیچ دروستکراوێکی، وەك ئەوە باس دەکرێت کەخۆی باسی زاتی پیرۆزی خۆی کردووە لەقورئانداو پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم- هەواڵی پێداوین، دان دەنێین بەناوو سیفاتە پیرۆزەکانیدا ئەوەی کەهاتووە

---

[٢٧] دکتور سفر الحوالي شرح العقیدة الطحاویة التوحید الربوبیة، وەرگێرانی باوکی محمد ل٦٧.. (جۆریکە لە زمانی سریالی کۆن بۆ لاهوتی مەسیحی بەکاردەهێنرێت واتا سیفاتی خوا و کەسایەتی و خوا و سروشتی خوا ..لەهەر مەزهەبێك مەسیحیدا جۆرێك پێناسەدەکریت).

لەقورئان و سوننەتدا, نەفی و ڕەتی هەموو ئەوانە دەکەینەوە کەخوای گەورە نەفی و ڕەتیکردوە لەسیفات و ناوە بەرزەکانیدا, یاخود پێغەمبەر کەنەفیکردوە لەهەموو عەیب و نوقسانێك لەخوای موتەعال بۆ کۆی گشتی.. ئەمەش کورت و پوخترین پێناسەیە کەوەرگیراوە لەباوەڕبوون بەناوو سیفاتە پیرۆزەکانی خوای پەروەردگار[٢٨]. چارەسەری کێشەی نێوان مرۆڤ و خوای پەروردگار لێرەوە سەرچاوە دەگرێت بەبۆچوونی –نوسەر- ئەویش لەفەرموودەیەکی خۆشەویستمانەوە دەست پێدەکات و خوای پەروەردگار لەقورئاندا باسیکردوە بەناڕاستەوخۆیی.. پێغەمبەر خوا - صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت؛ خوای گەورە (٩٩)ناوی هەیە هەرکەس بیانژمێرێ ئەوا دەچێتە بەهەشت.. (روى البخاري (٢٧٣٦) ومسلم (٢٦٧٧) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ لِلَّهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ اسْمًا مِائَةً إِلا وَاحِدًا مَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ)

خوای پەروەردگار بەهەزارەها ناوو سیفاتی پیرۆزی هەیە, یاخود کۆمەڵێك لەزانایان دەفەرموون ناوو سیفاتی خوای گەورە لەبژارە نایەت هەر ناوێك جوان و بەرزو سیفات باڵابوو ئەوا تایبەتە بەپەروەردگار.
کەواتە خوای پەروەردگار هەر ناوێك جوان بێت و هەر سیفاتێك بەرزبێت لایەقی پەروەردگارە, بەڵام بۆ لێرەدا باسی نەوەدونۆ ناوکراوە, زانایان دەفەرموون؛ لەناو ـ ناوە پیرۆزەکان و سیفاتەکانی خوای موتەعال هەر کەس نەوەدر نۆ ناوی لەبەر بکات و بیانژمێرێت ئەوە دەچێتە بەهەشت..
لێرەدا کێشەیەکی تر دێتە پێشەوە؛ ئایا هەر لەبەری بکەیت وەك شیعرێك و بیڵێیتەوە, یان وەك جەدوەلی زەرب لەبەریکەیت؟ ئایا بەمە دەچیتە بەهەشت؟

[٢٨] منهاج المسلم؛ ابوو بکر جابر الجزائری ل-١٥

زانیان دەڵێن: ((ژماردن بەواتای ئەو لەبەرکردنە نیەو نایەت. بەڵکو جیاوازی هەیە لەنێوانی وشەی احصی و عدد.. ئەگەر ماناکەی بە(عدد) هاتبێت.. واتە: تەنها ژماردنە. بەڵام ماناکە بە(احصی) هاتووە. وشەی (احصی) بەرفراونترە لەتەنها ژماردن، بەڵکو کۆکردنەوەی زانیاریشە لەسەر هەر ژمارەیەك کەکۆیدەکەیتەوە.. بۆ نموونە ئەگەر ژمێریاری (احصی) شوێنێك بکەیت دەبێت زانیاری لەسەر ماڵەکانیان و جێگاو جوگرافیا و مێژوو و زمانیان.. هتد کەواتە: ژمێریاری بەواتای ژماردن نایەت بەتەنها، بەڵکو واتاکەی لێکۆڵینەوەیە لەنەوەدونۆ ناوەکە، کەهەڵیدەبژێریت و بۆئەوەی پێی برۆینە بەهەشت.

**ئایا ناوە گەورەکانی خوای موتەعال کامانەن (اسم الاعظم)؟**

زانایان هەندێکیان لێهەڵبژاردوە، بۆ نموونە (الرحیم، الرحمان، العزیز، ذو الجلال والإکرام)... هتد

بەڵام هەندێك لەزانایانی تر وەك ئیبنوقەیم دەفەرموون مرۆڤ بەهەر ناوێکی پەروەردگار پێویستی بەخودای گەورەبوو بەو ناوە بانگی بکات ئەوا ئەو ناوە دەبێتە ئیسمی ئەعزەم، بۆ نموونە پێویستت بەورزق و رۆزییە، بەناوو سیفاتی الرزاق داوا بکەیت. یاخود پێویستت بەهێزو توانایە، بەناوی القوي بانگی بکەیت ئەو ناوانە دەبێت بە ئیسمی ئەعزەم.

یەکەم سیفات و ناوی پیرۆزی خوای پەروەردگار کەهاتە سەر زەوی ناوی ئەکرام بوو (الاکرام) لەرێگای وەحییەوە لەیەکەم سورەتدا لەسێیەم ئایەتیدا خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

**بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ**

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾**

(ئەی محمد صلی اللەعلیەو سلم) بخوێنە بەناوی ئەو پەروەردگارەتەوە

(کەهەموو شتێکی) دروستکردووە.

خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾

ئادەمیزادی لەچەند خانەیەکی خۆهەڵواسەر (لەناو منداڵاندا) دروستکردووە

اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ﴿٣﴾

بخوێنە، پەروەردگاری تۆ خاوەنی ڕێزو بەخششی بێ سنورە.

الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ﴿٤﴾

ئەو زاتەیە، کە بەهۆی قەڵەمەوە زانست و زانیاری فێردەکات.

عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴿٥﴾

ئادەمیزاد فێری ئەو شتانە دەکات کەنایزانێت و بێئاگایە لێیان.

لێرەدا گەڕانە بەدوای دوو زانستی گرنگدا دەردەکەوێت..

گەڕانە بەدوای دروستکراوەکانی خوای پەروەردگاردا، دووەمیان گەڕانە بەدوای سوپاسگوزاریی و شوکرو عیرفاندا، کەواتە ئەوە لێرەوە سەرچاوە دەگرێت، گوتاری ئیسلامی لەسەر بنەمای یەکتاپەرستی بۆ پاراستنی کەرامەتی مرۆڤە.

لە کۆتایی گوتاری ئاینی پرسیارێك روومان تێدەکات یاخود دروست دەبێت، دەڵێت: ((باشە گوتاری ئاینی تەنها مەبەست لەبیروباوەڕە کەسێ چەمکە؟))

لە وەڵامدا دەڵێین: ((ئاین وەك لەپێناسەکەیدا ڕوونمانکردەوە ماناو مەدلولاتی زۆری هەیە، بەڵام کەدەڵێین: گوتاری ئاینی لەگوتاری سیاسی ئیسلامیدا، تەنها خۆی لەسێ بەشدا دەبینێتەوە، ئاین بەتێگەیشتنە فراوانەکەی واتە: هەموو ڕەهەندەکانی ژیان و سیستەمەکانی، هەرچەندە ئەگەر وورد تەماشای ئەو سێ چەمکەش بکەین لەخوایەتی و پەروەردگاریتی و ناوو سیفاتە بەرزەکانی سیستەمەکانی ژیانی تێدا دارێژراوە، بنەڕەتی ئەم باسە دەسەڵاتی خوای پەروەردگارە، ناسراوە بەحاکمیەت لەباسەکانی تردا زیاتر ڕووندەکرێتەوە، لێرەوە کۆتایی بەم باسە دێنین و دەچینە سەر سەنتەری وەرگری ئاین کەمرۆڤە.

## کێشەکانی مرۆڤ لەگەڵ بیروباوەڕداو دەرئەنجام:

مرۆڤ بوونەوەرێکی خاوەن هەستەو خوای گەورە ژیری پێبەخشیوە لەسەردەمی ئادەمەوە، گومانی تێدا نیە زۆرێك لەزانایانی سەردەم دەڵێن: ((کەپێش ئادەم مرۆڤ بوونی هەبووە لەسەر زەویدا، بەڵام باوکە ئادەم یەکەم مرۆڤە کەمەلەکەی ژیری و ئەقڵی پێبەخشراوەو لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەورە پەرتوکی ئاسمانی بۆ ناردوە بۆ هەردوو کوڕەکەشی کەلەسەردەمی خۆیدا بەیەکەوە ژیاون، واتە: بۆ شیثی کوڕی ئادەم و ئیدریسی کوڕی ئادەم کەهەردووکیان چاویان بەباوکە ئادەم کەوتەوە، (شیث) پەنجا پەرتوکی ئاسمانی بۆ هاتووە، ئیدریسی براشی سی، هەندێك را دەڵێن: لاوازە، بەڵام بەهەردووکیان هەشتا پەرتوکیان بۆ هاتووە، چونکە سەرەتای دەستپێکی ژیریی بووە، مرۆڤەکان زیاتر پێویستیان بەزانیاری هەبووە لەسەر چواردەورو گەردوون و ژیان و دەسەڵات و مرۆڤ و تەنانەت خودی خوای موتەعالیش.

بەم پێیە خوای گەورە پلەی مرۆڤی بەرزکردۆتەوە بەهۆی هەستەکانی و ئیدراکی لەژیری و لەبیرکردنەوە..تاد.

خوای گەورە هەموو مرۆڤێکی خۆشدەوێت، کەلەنەبوونەوە هێناویەتە ئەم بوونە، چونکە مرۆڤ کەوجودی نەبووە لەعەدەمدا خوای پەروەردگار ئیجادی کردووە ئەوە بۆخۆی نیعمەتێکی زۆر گەورەیە، کەلەم بوونەدا بەئەبەدی دەمێنێتەوە.

دیسانەوە بەم پاوپێوەندە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کەپەروەردگاری بوون مرۆڤی لەنەبوونەوە هێناوەتە بوون، دەبێت شتێکی پێببەخشیت بۆ ناسینی زاتی پیرۆزی خۆی..

ئەویش سێ مەعەریفەی گرنگە، یاخود سێ زانستی بنچینەییە، کەمرۆڤ دەتوانێت خوای پێبناسێنێت[29].

---

[29] کتێبی موسوعة الأسماء الحسنى، ثلاثة مجلدات... بەرگی یەکەم .. ل ١٨

مەعریفەی یەکەم: زانستی مەخلوقاتی خوای پەروەردگارە: ئەم زانستە هەموو کەس دەتوانێت تێیدا بەشداربێت، گەرانە بەدوای نهێنیەکانی ئەم بوونە لەهەموو زانستەکانی کەبریتیە لەزانستەکانی پزیشکی و گەردوونی، ئەندازیاریی، فیزیایی، کیمیایی، ئەدەبی، میکانیکی...هتد.
بەواتای مرۆڤی خاوەن ژیری لەرێگای ئەم دروستکراوانەوە دەگاتە ئەوەی، کەئەم بوونە خاوەنی پەروەردگارێکە کەحەتمییە، بەلاّم ئەم زانستە گشتیە، کافرو موسلّمان و دیندارو بێدین تێیدا بەشدارن، دەگەنە ئەو باوەرەی، کەخالق هەیە، بەلاّم هەریەکە بەژیری و ئیدراك و ئەقلّی خۆی پێناسەی دەکات، زۆرێکیان لەرێگادا بەجێدەمێنن و ناگانە ئامانج، خەلّکانێکی زۆر کەم و شاز لەم جیهانەدا مولحیدن، واتە: بروایان بەوجودی خالق نییە، بۆیە زۆرینەی خەلّکی سەر ئەم هەسارەی ئێمە باوەرِدارە.. لەرێگای ئەم زانستانەوە گەیشتووە بەباوەرِ..

مەعریفەی دووەم: زانستی فەرمانی خوای موتەعالە: ئەم زانستە تایبەتە بەپابەندانی ئاینە ئاسمانییەکان، لەناویاندا ئیسلام، کەلێرەدا باسی زانستی فەرمانی خوایی دەکەین ئەویش بریتیە: لەهەموو ئەو بەندایەتیانەی کەناسراون بەعیبادات و موعامەلات. ئەم زانستە پەیوەندی هەیە بەئاکارو رەوشتی مرۆڤەوە واتە بەندایەتیە دروشمیەکان واتە عیباداتی شەعائیری قبولّ نابێت ئەگەر بەندایەتی کردارو رەفتاری لەگەلّدا نەبێت، واتە موعامەلاتی، گریمان کەسێك با نوێژ بکات، بەلاّم ئەگەر مالّی خەلّکی بخوات لەقیامەتدا با بەندایەتی نوێژەکانی بەقەدەر چیایەك بێت پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم- دەفەرموێت: دەبێت بەتەپ و تۆز، یان کەسێك با بەرِۆژو بێت، گەر باسی خەلّکی بکات و بوختان و زەم و ملی خەلّکی بشکێنیت لێی قبولّ ناکرێت پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم- دەفەرموێت: تەنها خۆی تینوو برسی دەکات، واتە خۆی ماندوو دەکات و هیچ پاداشتێکی نیە، ئەو کەسەی کەبەپارەی حەرام دەچێت بۆ حەج، خوای گەورە تەلبیەکەی دەگەرێنێتەوە و دەفەرمووێت: حەجەکەت قبولّ نیە، هەروەها زەکات، خوای گەورە لەقورئاندا دەفەرموێت: بەویستی خۆیان و

بەزۆریش بیدەن خوای گەورە لێیان قبوڵ ناکات، تەنانەت شایەتومانیش ئەگەر حەقی خۆی نەدرێتێ بەکردار ئەوا بەووتنی تەنها چەند وشەیەکە لەدەم دەردەچێت، بۆیە لەفەرموودەیەکدا خۆشەویستمان - صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: حەقی شایەتومان جێبەجێکردنی مافەکانیەتی.

کەواتە مەبەستمان لەبەشی دووەمدا ئەوەیە مەرج نیە هەرکەس نوێژو ڕۆژو و بەندایەتی کرد پێی بوترێت خواناس و خوای ناسیوە، هەیە مونافیقە، هەیە فێربووە وەك کلتورێك، هەیە وەك دابوونەریتە، هەیە چەواشەکاریە..هتد.

یاخود هەیە زانایە بەم باسانەی عبادات و موعامەلات، بەڵام فاسقە.. یان کاسە لێسی بەردەمی سوڵطانەکانە..

بەڵام زۆرێك لەمرۆڤەکان لەم ڕێگایەوە دەگات بەناسین و خۆشەویستی خوای پەروەردگار.

بۆ باسی ناسینی پەروەردگار دەکەین، چونکە ئەصڵی دین بۆ ئەوە هاتووە کەخوای پەروەردگار بناسیت..

کەواتە یەکەم زانست ئاماژەمان پێدا زانستی مخلوقاتی (الله)یە دووەم زانستی ئەمری (الله) یە سێیەمیان زانستی ناسینی خودی زاتی (الله)یە

مەعریفەی سێیەم: زانستی خواناسییە لەڕێگای ناو و سیفاتە پیرۆزەکانی زاتی پیرۆزی (الله)

ئەم سیفات و ناوانە ئەگەر بەزانستی و ئەکادیمی ناسیت ئەوە کاریگەری ئەو سیفاتانە لەسەر مرۆڤ دروست دەبێت و مرۆڤ بەرمو کامڵ بوون دەبات، ئەگەر ئەو دوو زانستەی کەئاماژەمان پێداوە نەیتوانی کاریگەری لەسەر دڵ و دەروونت دروستبکات وەك گوتاری ئاینی، ئەوا بەدڵنیاییەوە ناوو سیفاتە پیرۆزەکانی خوای گەورە کاریگەریی تەواوەتی دروستدەکات لەسەر دڵی موسڵمان و کافرو دیندارو بێدین و زەردەشتی و بوزی و مەسیحی و جولەکەش..

ئەمەش ئامانجی ئەم باسەیە بۆ ئەوەی هەموومان خوای پەروەردگار بناسین.

کێشەی گەورەی مرۆڤ لەگەڵ خوای پەروەردگاردا ئەوەیە، کەنایناسین وەك زاتی خۆی، خەڵکانیك خوایان لەمێشکی خۆیاندا داتاشیوە نەك وەك ئەوەی بەزانست خوا بناسن لەکاتێکدا ناسینی خوا دەبێت هەر بەزانست بێت. بۆیە خوای پەروەردگار جەخت لەسەر ناسینی زاتی پیرۆزی دەکاتەوە بەزانست و دەفەرموێت: (فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ) ١٩محمد

**بناغەی دووەم: مرۆڤ**

لەڕاستیدا دیدگای ئیسلام بۆ مرۆڤ تەواو جیاوازە لەدیدگاکانی تر، ئیسلام تەماشای مرۆڤ ناکات لەسەربنەمای ئاین و شێوەو ڕەنگ و ڕەگەزو کارو یاخود ئەو هۆکارە جیاوازانەی کەمرۆڤی پێ جیادەکرێتەوە، بەڵکو ئیسلام بەچاوێکی دادپەروەرانە تەماشای مرۆڤ دەکات، نەفی مافی مرۆڤێکی تر ناکات لەسەر هۆکارەکان بەهیچ شێوەیەك، چونکە مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی خاوەنی کەرامەت و ڕێزێکی گەورەیە بەتەواوەتی، کەسازشی لەسەرناکرێت بەهیچ جۆرێك لەئیسلامدا، ناشکرێت جیابکەیتەوە بەهۆکاری ڕەگەزو ئاین و شێوەو ڕەنگی، خوای گەورە لەقورئاندا دەفەرموێت: (وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا..) ٧٠ الإسراء

واتە: بەڕاستی ئێمەڕێزمان لەنەوەی ئادەم گرتووەو بەسەر وشکانی و دەریادا (بە جۆرەها هۆکاری گواستنەوە) هەڵمان گرتوون، لەڕزق و ڕۆزی چاك و جۆراوجۆر بەهرەوەرمان کردوون (لەخۆراك و پۆشاك و ماڵ و ناوماڵ و ...هتد) بەڕاستی ئێمە ڕێزی زۆری ئەوانماندا‌وە بەسەر زۆربەی ئەو بەدیهێنراوانەدا کەدروستمان کردون، لەهەموو ڕوویەکەوە)

کەواتە، خوای گەورە ڕێزی مرۆڤی گرتووە بەموسڵمانان و ناموسڵمان، پەروەردگار ڕۆزی هەموویانیداوە لەهەموو جۆرە ڕۆزییەك، هیچ جۆرە فەزڵ و چاکەیەك نیە لەنێوانی ڕەگەزی مرۆڤەکاندا..

ئەم جۆرە دیدو تێڕوانینە لەواقعی پێغەمبەردا -صلی الله علیه وسلم- دەردەکەوێت لەو هەڵسوکەوت و ڕەفتارەیدا لەگەڵ مرۆڤەکاندا بەگشتی؛ تەنانەت هەموو دەقە شەرعیەکان بەڕیزو پاراستنی کەرامەت و سۆزو میهرەبانی ڕەحمەت ئاماژەی بۆ هەڵسوکەوتی مرۆڤ کردووە لەگەڵ مرۆڤدا، تەنانەت لەگەڵ دوژمنیشدا، بەهیچ شێوەیەك ڕێگە نادرێت لەئیسلامدا دەستدرێژی و زوڵم بکرێتە سەر مرۆڤ، یاخود مافی زەوت بکرێت، یان لەشان و شەوکەتی کەم بکرێتەوە، ئەوەش دەقی ئایەتی قورئان و فەرموودەو ژیانی خۆشەویستمان پێغەمبەر -صلی الله علیه وسلم- ڕوونکراوەتەوە بەئاشکرا مافەکان دیارە، بەڵام لەجاڕنامەی گەردوونی مافی مرۆڤدا کەلەسەدەی ڕابردوودا نوسرایەوە؛

جاڕنامەی گەردوونی مافی مرۆڤ لە١٠ی دیسەمبەری ساڵی ١٩٤٨ لەکۆبوونەوەی گشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا پەسندکرا بەندەکانی هەموو جوانن، بەڵام ناگات بەئیسلام، ئاساییە، کەنەگات بەئیسلام، چونکە مافی مرۆڤ لای خوای گەورە بێ کەموکورتیە، بەڵام لەئاینەکانی تر یاخود بەرنامە دەستکردەکاندا کەموکورتیە.

چۆن؟ لەجاڕنامەکەدا هاتووە کەمرۆڤ مافی خۆیەتی هاوسەرگیری بکات..!

بەڵام مافی ئەوەی نەداوە، کەمرۆڤ دەتوانێت جیابێتەوە، لەم ساڵانەی دوایدا بۆی زیادکرا بەکەموکورتی..[٣٠]

ئەوەش کێشە نیە..

---

[٣٠] محاضرة " قيم إنسانية أم سنن إلهية " - م. فاضل سليمان)
https://www.youtube.com/watch?v=vXoOZZF88IM

لەم جارنامەیەدا: مافی خۆپاراستنی تێدانیە، ئەوەی کەهێرش دەهێنێتە سەرت مافی ئەوەت نیە، کەنەهێڵیت دەستدرێژی بکاتە سەرت و حەقی ئەوەی نەداوە، کەوەڵامی دەستدرێژکەران بدەیتەوە، واتە پارێزگاری لەخۆت بکەیت!

ئەوە کەموکوڕی ئەقڵی مرۆڤە پێوەر ناکرێت، لەگەڵ مافی گەردوونی ئیسلامی، کەپەروەردگار دایڕشتوە.

لەشەریعەتی ئیسلامدا بەهەموو شێوەیەك زوڵمکردن لەمرۆڤ ڕێگری لێکراوەو ڕێگای لێگیراوە، بەسەدان ئایەت و فەرموودە لەو بوارەدا هەیە، تا ڕۆژی قیامەت حەرامکراوە، خوای پەروەردگار لەقیامەتیشدا دەفەرموێت: (وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا...) ٤٧ الأنبياء

واتە: ئێمە تەرازووی پێوەری دادپەروەریی لەڕۆژی قیامەتدا دادەنێین، هیچ کەس بەهیچ شێوەیەك ستەمی لێ ناکرێت.

ئەگەر تەماشای ئایەتەکە بکەین دەبینین بەڕەهایی باسیکردوە، تەنانەت ڕۆژی قیامەتیش هەر جۆرە مرۆڤێك بێت، دەبێت بەدادپەروەرانە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، جا موسڵمانە، یان نەسرانییە، یاخود یەهودییە لێکدانەوە بۆ میللەت و ڕەگەز و نەتەوە ناکرێت، خوای گەورە زۆر ڕقی لەزوڵم و ستەم و زۆرداری دەبێتەوە، تەنانەت لەسەر خۆشی حەرامی کردوە زوڵم و ستەم کردن، پێغەمبەری خوا -صلی الله علیه وسلم- لەخوای خۆیەوە گێڕاویەتیەوە واتە فەرموودەی قودسیە دەفەرمووێت: ئەی بەندەکانم من زوڵم و ستەمم لەسەر خۆم حەرام کردوە، لەنێوانی ئێوەشدا قەدەغە و حەرامکراوە، دەی ئێوەش زوڵم و ستەم مەکەن.

دەقی فەرموودە قودسیەکە: (عن أبوو ذر ـ رضي الله عنه ـ عن النبي صلى الله عليه وسلم فيما روى عن ربه تبارك وتعالى أنّه قال: «يَا عِبَادِي إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّمًا فَلَا تَظَالَمُوا. رواه مسلم . رياض الصاحين)

لێرەوە دەقە شەرعیەکان وریامان دەکەنەوە و ئاماژە بەوە ئەدەن کەنابێت دەستدرێژی بەهیچ شێوەیەك بەرامبەر ناموسڵمانەکان بکرێت، خوای پەروەرذگار لەقورئاندا ئاماژە بەوەدەکات، کەنابێت بەهیچ نەفسێك، واتە: هیچ مرۆڤێك جا

موسڵمانە، یان ناموسڵمانە و هەر دین و مەزهەبێکی هەیە کوشتنی حەرامە بەبێ هۆ.. «وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ» ٣٣ الاسراء
واتە: کەسێ نەکوژن کە خوا کوشتنی حەرام کردبێت مەگەر بە (بەهۆی تاوانێکەوە شایستە بێت) و کوشتنی ڕەوابێت.

واتاکەی بەرفراوانە هەموو مرۆڤ دەگرێتەوە و گوتارە ئاینیەکە مرۆڤایەتیە، گوتاری دادپەروەری بەشێکی گرنگە بەهیچ شێوەیەك جیانابێتەوە لەگوتاری سیاسی ئیسلامی، هەروەها پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم- لەفەرمووده پیرۆزەکانیدا ئاماژەی پێکردوە دەفەرموێت: هەر کەس بەناحەق ناموسڵمانێك کەهاوپەیمانەو هیچ تاوانێکی نەکردوە بیکوژێت ئەوا بەهەشتی لەسەر حەرام کراوە! دەقی فەرموودەکە: (مَنْ قَتَلَ مُعَاهِدًا فِي غَيْرِ كُنْهِهِ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ).
یەکێك لەهەرە وێستگە بەرزەکان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، جەنازەیەکی یەهودی بەلایدا تێپەڕبوو، خۆشەویستمان هەڵسا لەبەر تەرمەکەی، لەوکاتەدا دوو هاوەڵی بەڕێزی لەگەڵیدا بوون بەناوی قەیسی کوڕی سەعد و سەهلی کوڕی حەنیف، پرسیان ئەوە تەرمە جولەکەبوو، پێغەمبەری خوا فەرمووی بۆ مەگەر مرۆڤ نییە؟ ئەوە لەڕووی مەیدان و لەڕووی پیادەکردنەوە فێرمان دەکات، کەدەبێت مرۆڤی موسڵمان ڕێز لەمرۆڤبوونی بەرامبەر بگریت، هەر بۆیە لەجەنگی قادسیەدا ئەو دووهاوەڵە - ڕەزامەندی خوایان لێبێت - تەرمی مەجوسیەك بەلایاندا تێپەڕی کرد هەردووکیان لەبەر ئەو مرۆڤە ئاگرپەرسەتە هەڵسانەوە، ئەوە کاریگەریی پێغەمبەرە - صلی اللەعلیە و سلم- بەسەر شوێنکەوتوانیەوە، دەقی فەرموودەکە: (روى الإمام مسلم عن ابن أبي ليلى أَنَّ قَيْسَ بْنَ سَعْدٍ وَسَهْلَ بْنَ حُنَيْفٍ كَانَا بِالْقَادِسِيَّةِ، فَمَرَّتْ بِهِمَا جَنَازَةٌ، فَقَامَا، فَقِيلَ لَهُمَا: إِنَّهَا مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ، فَقَالا: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم مَرَّتْ بِهِ جَنَازَةٌ فَقَامَ، فَقِيلَ: إِنَّهُ يَهُودِيٌّ، فَقَالَ: «أَلَيْسَتْ نَفْسًا؟).صحيح البخاري» كتاب الجنائز» باب من قام لجنازة يهودي

ئەمەش تیۆرێکی ئیسلامیە بۆ مرۆڤگەرایی.. لەڕاستیدا پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه و سلم ـ بەو کارەی دەیەوێت ئەوە لەناخی موسڵماناندا بچەسپێنێت، کەڕێزگرتن و بەبەزەیی بوون لەمرۆڤ دەبێت لەناخی موسڵماناندا ڕەنگدانەوەی هەبێت خۆیشی لەمەیداندا پیادەیکردوە.

هەر بۆیە لێرەوە ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت ڕەگەزپەرەستی و دەمارگیری لەناو ئیسلامدا بوونی نیە، بەبەڵگەی ئەوەی بەدرێژایی مێژوو جولەکە کوفریان بەپێغەمبەر کردو زۆر ئازاریانداوەو بەدرۆزن لەقەڵەمیانداوە، بڕوایان بەپێغەمەبەرایەتی نەبووە، حاشای سەروەری مرۆڤایەتی محەمەد ـ صلی الله علیه وسلم ـ هەمیشە لەپلانگێڕیدا بوون بۆ لەناوبردن و کوشتنی خودی پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم- چەند جارێك و هەروەها کوشتنی موسڵمانانیش بەگشتی!

لەگەڵ ئەو هەموو ئازارو کردەوە ناشرینانەی جولەکە، پێغەمبەری خوا لەبەر تەرمی یەهودیەك هەڵساوە، ئەو کەسەی نەناسیوە، بەڵکو ڕێزو کەرامەتی مرۆڤایەتی کەسەکەی لا گرنگە، نەوەکو ئاین و ڕەگەزو چ گەل و هۆزێك بوو، واتە فێری هاوەڵان و ئێمەش دەکات، بەپێناسەی مرۆڤ، مرۆڤ نەناسین کەچییە و چۆن بیر دەکاتەوە، بەڵکو بەمرۆڤبوونی بیناسین، ئەمەش لەسەرەتای هاتنی ئیسلامەوە خوای گەورە باسی پاراستینی کەرامەتی مرۆڤ دەکات لەگەڵ دابەزینی یەکەم ئایەتی قورئانە لەسورەتی علق-دا باسی پاراستنی کەرامەتی مرۆڤ دەکات، بەهۆکاری زانست و زانیارییەوە، لەپاشاندا کردویەتیە جێنیشین لەسەر زەویدا.

بەدەیان ئایەت و فەرموودە ئەوەیان سەلماندوە، کەلێرەدا ئاماژە بەهەندێکیان دەکەم.

**خوای گەورەی موتەعال بەمشێوە باسی مافی مرۆڤ دەکات:**

سەرەتا ڕێزی مرۆڤ دەستنیشان دەکات وەك یاسایەك دەیچەسپێنێت و مادەی لێدروست دەبێت وەك سەرەتاترین مافەکانی مرۆڤ..

لە یاساکانی ڕێزی مرۆڤ بریتین لەم یاسایانە...

دروست کردنی مرۆڤ بەجوانترین شێوە، ڕەچەڵەکی هەر مرۆڤە ناچێتەوە سەر هیچ ئاژەڵێك! ( لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ) ٤ التين

واتە: ئێمە ئینسانمان لە جوانترین شێومو ڕێك و پێك ترین شێوازدا دروست کردووە لە هەموو ڕوویەکەوە

قال ابن كثير فى تفسره: إنه تعالى خلق الإنسان في أحسن صورة وشكل، منتصب القامة، سَوِيَّ الأعضاء حسنها

- خوای گەورە لەڕوحی خۆی بەشی مرۆڤی داوە بۆیە بەخلودی دەمێنیتەوە، لەگە ردوونی خوای گەورە هەرگیز مرۆڤ لەناو ناچێت!

تێبینی: ئەگەر لەسەر ئەو ڕێساو سیستەمە ڕۆشت، کەخوا بۆی دابین کردوە بە خلودی لە بەهەشتدایە، خۆ ئەگەر سەرپێچیکرد و لەسیستەمی خوای گەورە دە رچوو هەر بەخلودی لەجەهەنمدایە، واتا مرۆڤ بەخلودی دمێنێتەوە لەڕوحی خوای گەورە بەشێکی دراوەتێ، خوای گەورە دەفەرموێت: (ثُمَّ سَوَّاهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ). ٩ السجدة

پاشان (ئادەمیزادی) بەڕێك و پێکی ڕێکخست، لەڕوح و گیانێك (کە خوا خاوەنیەتی) فوی پیاکرد، ئینجا دەزگای بیستن و بینین و لێکدانەوەی پێ بە خشیون، بەڵکو سوپاسگوزاربن.

(فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ ) ٢٩ الحجر

واتە: کەڕوحێك خۆم خاوەنیم و فوم پێدا کردوە بەفریشەتەکانم ووت هەموو ڕێزی لێبگرن سوجدەی ڕێزی بۆ بەرن.. فریشتەکانی ئاسمان سوجدەی ڕێزیان برد بۆ مرۆڤ کەلەوان بە بەرێزتر دانرا.

(وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلاَّ إِبْلِيسَ أَبَىَ وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ..) ٣٤ البقرة

واته؛ هەروەها یادیان بێنەوە کاتێك کە بەفریشتەکانمان ووت، سوجدە بەرن بۆ ئادەم (ئەڵبەتە سوجدەی ڕێز، بەفەرمانی خوا) هەموویان بێ ماتڵی، بێ دوو دڵی سوجدەیان بردو فەرمانی خوایان بەجێهێنا جگە لەشەیتان نەبێ کەسەرپێچی کردو خۆی بەگەورە زانی و خۆی خستە ڕیزی کافرانەوە. فێرکردنی مرۆڤ هەر لە سەرەتایەوە بەزانست بۆیە فەزڵی مرۆڤ هەیەلەسەر زەویدا، خوای گەورە دەفەرمویێت، (وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلائِكَةِ فَقَالَ أَنْبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَؤُلاَءِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ (٣١) قَالُوا سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ (٣٢)) البقرة

واته، ئەوسا ئیتر خوا ویستی توانایی و لێهاتویی ئادەم بۆ فریشتەکان ڕوون بکاتەوە، ناوی هەرچی پێویستی دەوروبەر هەیە فێریکرد، لەوەودوا نیشانی فریشتەکانیشی دا و پێی فەرموون، ئادەی ئێوە ناوی ئەو شتانەم پێ بڵێن، ئەگەر ڕاست دەکەن و توانای ئاوەدان کردنەوەی زەویتان هەیە؟

"فریشتەکان وتیان، پاکی و بێ گەردی و ستایش هەر شایستەی تۆیە، ئێمە نازانین هیچ بڵێین، ئێمە تەنها ئەوەدەزانین کەتۆ فێرتکردوین، بەڕاستی تۆ پەروەردەگارێکی زۆر زانا و دانایت".

خوای گەورە مرۆڤی کردوەتە جێنشینی یاساو ڕێسای خۆی لەسەر زەوی..

{وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلائِكَةِ إِنِّيَ جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً} ٣٠ البقرة

واته، (بیریان بێنەوە) کاتێك کە پەروەردگارت بەفریشتەکانی وت، من لەزەویدا جێنشینێك دادەنێم (تا زەوی ئاوەدان بکاتەوە).

ئیبنو عاشور دەڵێت، ئەم ئایەتەی خوای موتەعال لەفریشتەکان بوو بۆ ئەوەی قەدری مرۆڤ بزانرێت، کەبەهۆی زانستەکەیەوە خوای گەورە ئەو شێوە

باشترینەی پێبەخشییوومو توخمی مرۆڤ جیاوازە لەتوخمەکانیتر، کە دروستکراون[٣١]

قال ابن عاشور: وقول الله هذا موجَّهٌ إلى الملائكة على وجه الإخبار؛ ليسوقهم إلى معرفة فضل الجنس الإنساني، على وجهٍ يزيل ما علم الله أنه في نفوسهم من سوء الظن بهذا الجنس (تفسيروڕئانی ابن عاشور ... التحرير والتنوير)

ـ مرۆڤ لەزۆربەی دروستکراوەکان بەڕێزتر و فەزڵی زیاد ترە.. (وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ واته: فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً) ٧٠ الإسراء

بەڕاستی ئێمە ڕێزمان لەنەوەی ئادەم گرتووەو بەسەر وشکانی و دەریادا (بە جۆرەها هۆکاری گواستنەوە) هەڵمان گرتوون، وە لەڕزق و ڕۆزی چاك و جۆراوجۆر بەهرەوەرمان کردوون (لەخۆراك و پۆشاك و ماڵ و ناوماڵ و...هتد) بەڕاستی ئێمە ڕێزی زۆری ئەوانمان داوەبەسەر زۆربەی ئەو بەدیهێنراوانەدا کەدروستمان کردوون (لەهەموو ڕوویەکەوە).

شوکانی دەڵێت: ((خوای گەورە باسی زۆربەی جۆرەکانی مەخلوقاتی خۆی نەکردوە، بەڵام مرۆڤ لەزۆربەیان باشترە، وە ووشەی باشترە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ڕێزی مرۆڤی گرتوە، مرۆڤیش لەسەریەتی کەسوپاس گوزاری بێت دوربێت لەکوفرکردن بەرامبەر بەخوای موتەعال))

شەوکانی دەڵێت: ((أجمل سبحانه هذا الكثير ولم يبينّ أنواعه، فأفاد ذلك أن بني آدم فضلهم سبحانه على كثير من مخلوقاته... والتأكيد بقوله {تَفْضِيلاً} يدل على عظم هذا التفضيل، وأنه بمكان مكين، فعلى بني آدم أن يتلقوه بالشكر، ويحذروا من كفرانه))[٣٢].

---

[٣١] تفسير التحرير والتنوير.. بەرگی یەکەم ل ٤٠٠

[٣٢] فتح القدير..بەرگی ٣ ل ٢٤٤ و٢٤٥

هەموو شتێك فەراهەم هاتووە لەبەر خاتری مرۆڤ لەبەردەستی مرۆڤ ئاسانکراوە لەلایەن خوای موتەعال.. {وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا مِنْهُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ}١٣ الجاثية

واتە: هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدا هەیە بۆ ئێوەی ڕامهێناوە. بۆ خزمەتگوزاری ئێوە فەراهەمی هێناوە. هەموویشی تێکڕا بەخششن لەلایەن ئەو زاتەوە. بە ڕاستی ئا لەو بەخشش و دیاردانەدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێك کە بیربکەنەوەو تێفکرن.

ئیبن سەعدی دەڵێت: ((ئەم ڕامهێنانە گەرچی لەئاسمان و زەویدایە و بۆ خاتری مرۆڤە. ڕۆژ مانگ ئەستێرەکان بۆ خاتری مرۆڤ دروست کراون گەڕۆك وەستاوە کان هەر بۆ مرۆڤن هەموو جۆرە ئاژەڵەکان جۆری دار و درەخت لە میوەهات و بە روبوم کانزاکان هەر بۆ پێداویستی مرۆڤە))[٣٣].

ئیبن سەعدی دەڵێت: ((وهذا شامل لأجرام السموات والأرض، ولما أودع الله فيهما من الشمس والقمر والكواكب والثوابت والسيارات وأنواع الحيوانات وأصناف الأشجار والثمرات وأجناس المعادن، وغير ذلك مما هو مُعَدّ لمصالح بني آدم، ومصالح ما هو من ضروراته)) تيسير الكريم الرحمن، ل ٧٧٦

ئەم هەموو ڕێزە لەلایەن خوای گەورەوە بۆ مرۆڤەکان فەراهەم هاتوە چۆن دەبێت مرۆڤ هەست بەو ڕێزە نەکات. لەهەمانکاتدا خۆی بەکوڕی مەیمون و زەڕافە بزانێت. ئەم مافانە خەڵکی فەراهەمی نەهێناوە. بەڵکو خوای موتەعال بەخشیویەتی. کەواتە: وەك ئەوە نابێت کەخەڵکی بڕیاری ڕێز بۆ تۆ بدەن کێ دەبێت ڕێز لە مرۆڤ بگرێت ئەوکەسەی کەخاوەنیەتی.

تایبەتمەندیەکانی مافی مرۆڤ لەئیسلامدا پابەندبوون بەبیرو باوەڕی ئیسلامەوە. سەرەتای ئەم دینە بەڕاستکردنەوەی بیروباوەڕو فکر دەستی پێکرد. لە ماوەی سیازدە ساڵ سەروەرمان - صلى الله عليه وسلم- لەمەککەدا خەریکی

---

[٣٣] تيسير الكريم الرحمن، ل ٧٧٦

ئەوکارە گەورە بوو مانای یەکتاپەرستی و شیکردنەوەی (لا إله إلا الله) چونکە ئەوە لۆژیکی مافی مرۆڤە وە دەستەبەر کردنی هەموو ئازادیەکانی مرۆڤە، لەبەرئەوەی خوای گەورە مرۆڤەکانی بە ئازادی دروستکردوە، خوای پەروەردگار خۆی بێنیازە لەکارو کردەوەی مرۆڤ، هەموو بوونەوەرێك لەم گەردوونەدا، ئەمری پێکردون، کەشەرعی خوا بپارێزن بۆ ئەوەی ستەم لە یەکتری نەکەن، پابەند بن پێیەوە، پاشان کۆشش و خەبات بکەن لەپێناوی بەدەستهێنانی مافەکانی مرۆڤ، کەمرۆڤەکان دەستدرێژی نەکەنە سەریەکتری مافەکانی یەکتر پێشێل نەکەن، خوای گەورە زۆر باسی کۆشش و خەباتی کردوە بۆمان لەقورئاندا.

مافی کەرامەتی مرۆڤ و ئابڕووی: خوای گەورە مافی ئابڕو کەرامەتی مرۆڤی دەست نیشانکردوە کەکەس دەستدرێژی ناکاتە سەری..

جنێودان بەمرۆڤ و ناو و ناتۆرەی ناشرین بە لەقەبی نەشیاو، خوای گەورە لە مبارەوە دەفەرموێت: (وَلاَتَنَابَزُوابِالأَلْقَابِ) ١١ الحجرات، (چونکە لەوانەیە گاڵتەپێکراوەکان لای خوا لە گاڵتەپێکەرەکان چاکتربن، سوکایەتیی بەخۆتان مەکەن و یەکتری عەیبدار مەکەن، چونکە سوکایەتی بەیەکتر سوکایەتییە بە خۆتان، هەروەها ناو و ناتۆرەی ناشرین بۆ یەکتر دامەتاشن. حەرام کردنی باسی یەکتری (تحريم الغيبة) خوای گەورە لەمبارەوەدەفەرموێت: (وَلاَ يَغْتَبْ بَعْضُكُم بَعْضًا) ١٢ الحجرات (لەپاش ملەباسی یەکتری مەکەن، وە ناوی یەکتری بەخراپە مەبەن)

پێغەمبەری سەروەرمان (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئایا دەزانن غەیبەتکردن چیە؟ هاوەڵانی بەڕێز فەرمویان خواو پێغەمبەر دەزانن، فەرمووی: ئەگەر شتێك لە براموسڵمانەکەتدا بێت و باسی بکەیت ئەوە غەیبەتە، خۆ ئەگەر تێیدا نەبوو ئەوە بوهتانە؟

(وعن أبي هريرة رضي الله عنه أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: "أتدرون ما الغيبة؟" قالوا: الله ورسوله أعلم. قال: "ذكرك أخاك بما يكره". قيل: أفرأيت إن كان في أخي ما أقول؟ قال: "إن كان فيه ما تقول فقد اغتبته، وإن لم يكن فيه فقد بهته) (أخرجه مسلم في البر والصلة والآداب) گاڵتەکردن بەمرۆڤ و ڕابواردن پێی

بۆ هیچ کەسێك نیە کە گاڵتە بەمرۆڤێکیتر بکات و سوکایەتی پێبکات، خوای گەورە دەفەرموویت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ يَسْخَرْ قَوْمٌ مِنْ قَوْمٍ عَسَى أَنْ يَكُونُوا خَيْرًا مِنْهُمْ وَلاَ نِسَاءٌ مِنْ نِسَاءٍ عَسَى أَنْ يَكُنَّ خَيْرًا مِنْهُنَّ) ١١ الحجرات

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە هیچ کەس و هیچ هۆزێك گاڵتە بهکەس و هۆزێکی تر نەکات، چونکە لەوانەیە گاڵتەپێکراوەکە لەلای خوا گەلێ چاکتر بێت لە گاڵتەکارەکان، ژنانیش باگاڵتە بە یەك نەکەن، چونکە لەوانەیە گاڵتەپێکراوەکان لای خوا لە گاڵتەپێکەرەکان چاکتر بن، سوکایەتیی بە خۆتان مەکەن و یەکتری عەیبدار مەکەن، چونکە سوکایەتی بەیەکتر سوکایەتیە بە خۆتان، هەروەها ناو و ناتۆرەی ناشرین بۆ یەکتر دامەتاشن، ئەوە ڕەفتار و شتێکی ناشرین و نابەجێیە لەدوای باوەڕهێنان و موسوڵمان بوون، ئەوەی تەوبە نەکاو پەشیمان نەبێتەوە لە گوناهەکانی، ئەو جۆرە کەسانە خۆیان خستۆتە ڕیزی ستەمکارانەوە.

ئەوانەی ئاماژەمان پێداوە هەمووو ڕاستی ئەو دیدو بۆچونانە دەردەخات کەڕێزگرتن و سەرووەری دانان و تەقدیر کردنی مرۆڤەکانە بەگشتی..

ئەم باگراوندە لەبیروباوەڕی موسڵماناندا چەسپیوە، کەنێوانی خەڵکی هەمیشە جیاوازی هەیە، چونکە خوای گەورە مرۆڤی دروستکردوە هیچی لەیەکتری ناچێت، هەریەکە بەکەسایەتی و بالاو شێوەی تایبەتی خۆی هەرگیز هیچیانی کۆنەکردۆتەوە لەسەر یەك بیرو بۆچون هەمیشە جیاوازی لەنێوان مرۆڤەکاندا هەبووە، خوای گەورە دەفەرمویت: (وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلاَ يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ) ١١٨ هود

واتە: ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە هەموو خەڵکی دەکرد بەیەك تاقم و کۆمەڵ، بەلام بەردەوام ئەو خەڵکە جیاوازن لەنێوانی یەکتردا لەئایین و بەرنامە و بۆچووندا.

هەر بۆیە خوای پەروەردگار موسڵمان فێردەکات بەشێوەیەکی زۆر سروشتی و سادە لەگەڵ خەڵکێکی خاوەن بیروباوەڕ جیاوازدا بژیت و هیچ بەریەککەوتنێکیش نەبێت لەنێوانی مرۆڤەکاندا لەسەر بیروباوەڕ بەتایبەتی لەئیسلامدا ئالیەتی

جیاوازیی هەیە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ هەموو بیروباوەڕ و ئاینە جیاوازەکاندا کەسیش ناتوانێ لەناو ئیسلامدا بیروباوەڕی خۆی بەزۆر بسەپێنێت بەسەر خەڵکی نا موسڵماندا، خوای گەورە دەفەرموێت (وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَنْ فِي الْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ) ٩٩ یونس

واتە: خۆ ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە دەیتوانی بەزۆر و بەناچاری هەر هەموو دانیشتوانی سەر زەوی باوەڕ بێنن، بەڵام پەروەردگاری مەزن ڕێزی بۆ ئادەمیزاد داناوە و سەرپشکی کردوە، ئایا تۆ ئەی پێغەمبەر صلى اللەعلیەوسلم ڕەوایە زۆر بۆ خەڵکی بێنی هەتا باوەڕ بهێنن؟!

کاری موسڵمانیش تەنها گەیاندنی بانگەوازی ئیسلامیە بەشێوەیەکی پاك و بێگەرد، ئیتر لەسەر ئەو کەسە نیە کێ موسڵمان دەبێت یان نا، یاخود کێ وەریدەگریت، تەنها گەیاندن لەسەری پێویستە، نابێت لێپێچینەوەو لێپرسینەوە لەگەڵ خەڵکیدا بکات لەسەر وەرگرتنی ئاین، خوای موتەعال دەفەرموێت: (وَإِنْ جَادَلُوكَ فَقُلِ اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ * اللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كُنْتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ.. ) ٦٨،٦٩ الحج

واتە: خۆ ئەگەر موجادەلەت لەگەڵدا بکەن ئەوەتۆ موجادەلە مەکە، بەڵکو بڵێ: ((خوا خۆی چاك زانایە بەو کارو کردەوانەی کەئەنجامی دەدەن)).

هەر خوا خۆی لەڕۆژی قیامەتدا دادوەری دەکات لەنێوانتاندا لەسەر ئەو شتانەی کە ئێوە کێشەو جیاوازیتان لەسەر دەکرد، لەوێ ڕاستیەکان بەتەواوی دەردەکەوێت)).

لەبواری یەکترناسینەوە ئیسلام بەمشێوەیە باسی لێوەکردووە لەقورئاندا خوای گەورە دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ}١٣ الحجرات

واتە: ئەی خەڵکینە ئێمە هەمووتانمان لە نێر و مێیەك دروستکردوە (کە باوکە ئادەم و دایکە حەوایە)، کردومانن بەگەلان و تیرەو هۆزانی جۆربەجۆر، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بەیەکەوە، بەڕاستیی بەڕێزترینتان لای خوا

ئەوەتانە کە زۆرتر لەخواترسە و فەرمانبەرداری خوایە، بێگومان خوا زاناو ئاگایە بەهەموان.
بەهۆکاری ئەوەیەکە مرۆڤ ناتەواوە خوای گەورە کردونیەتیە هۆز و تیرە بۆ ئەوەی یەکتربناسن و ناتەواوی یەکتر تەواو بکەن و پێداویستی یەکتر دابین بکەن.
ئەم کارە لەسەر بنەمای تاك، پاشان کۆمەڵ ئینجا دەوڵەت، هەریەك لەمانیش بۆ تاکی بەرامبەرو کۆمەڵگەیەکیتر گواستنەوەی کلتور و دەوڵەتانی دراوسێ پێداویستی یەکتر دابین دەکەن بەهۆکاری ئەو ناسین و تەعاروفەی، کەدەیکەن خوای گەورە لەسروشت و ناخی مرۆڤدا ڕواندویەتی، لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەورە مرۆڤی وا دروست کردوە کەپێویستە هیچ کات بیرو بۆچوون بیرکردنەوەیان وەك یەك نەبێت، پێشتریش ئاماژەم بەو دەقە قورئانیانە داوە، کەباس لەجیاوازیی نێوان مرۆڤەکان دەکات بەگشتی..
هەروەها خوای پەروەردگار ئەم گەردون و زەوی و کانزاو پێداویستیەکانی مرۆڤی بەگشتی دروستکردوە تەنها بۆ موسڵمانان تایبەت نەکراوە، پەروەردگار دەفەرموێت: **(أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي الْأَرْضِ وَالْفُلْكَ تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَيُمْسِكُ السَّمَاءَ أَنْ تَقَعَ عَلَى الْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِ إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَحِيمٌ) ٦٥ الحج**
واتە: ئایا بەچاوی خۆت نەتبینیوە چۆن خوای گەورە هەرچی لەزەویدا هەیە بۆ ئێوەی ڕام هێناوە، هەروەها کەشتیەکانیش، کە لەدەریاکاندا دەڕوات بە فەرمانی ئەو زاتە، ئاسمانیش ڕاگیر دەکات لەوەی کەبکەوێت بەسەر زەویدا مەگەر بە ویست و فەرمانی خۆی، بەڕاستی خوا بۆ خەڵکی زۆر بەسۆز و میهرەبان و لێخۆشبوو و بەخشندەیە.
ئەم بەخشیشە لەمافی مرۆڤ خوای گەورە بەخشیویەتی بەمرۆڤەکان، نەك مرۆڤ بەخشیبێتی بەمرۆڤ، کەواتە کەس خاوەنی نیەو بەخشیشێکی خوایە کەس ناتوانێت زەوتی بکات لەکۆمەڵانی خەڵکی، کەواتە هیچ مرۆڤێك بەهەر ناو و بیروباوەڕێکەوە بۆی نییە مافی کەسیتر زەوت بکات بەهیچ بیانویەك.

لەبارەی لێخۆشبوون و میهرەبانبوون بەرامبەر بەمرۆڤ لەهەر پلەو پایە و جێگایەکی کۆمەڵایەتیدا بێت، یاخود هەر چین و توێژێك بێت لەئیسلامدا لێخۆشبوون و میهرەبانی یەکێکە لەنیشانەکانی موسڵمانبوون و مرۆڤی موسڵمان بەرامبەر بەهەموو ئادەمیزاد..

خوای گەورە دەفەرموێت: (وَسَارِعُوا إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ * الَّذِينَ يُنْفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ) ١٣٣،١٣٤ آل عمران

واتە: پەلە هەوڵبدەین بۆ بەدەستهێنانی لێخۆشبوونی پەروەردگارتان و بە هەمووشتێك کەپانتاییەکەی ئاسمانەکان و زەوی گرتۆتەوەو ئامادەکرا، کە بۆ پارێزکاران، پێغەمبەریش سەلامی خوای لەسەر بێت، دەفەرموێت: مەنزڵگای هەندێك دەبینن وەکو چۆن ئەستێرەی گەش دەبینن لەدورەوە، فەرموویانە: ئەی پێغەمبەری خوا، ڕەنگە ئەوانە مەنزڵگای پێغەمبەران بن، فەرموویەتی: نەخێر، بەڵکو مەنزڵگای کەسانێکن کەباوەڕیان بەخواو پێغەمبەرەکی هێناوە، جا ئێستا و لەم سەردەمانەی دوایدا زانراوە ئەستێرەی چەند گەورە گەورە هەیە، کەڕۆژ لە ئاستیدا زۆر بچووکە جا چ جای زەوی!!).١٣٣ ئەوانەی کە لەخۆشی و ناخۆشیدا، لەهەرزانی و گرانیدا ماڵ و سامانیان دەبەخشن، ڕق و کینەی خۆیان دەخۆنەوەو خۆدەگرن، لەخەڵکی خۆش دەبن و چاوپۆشییان لێدەکەن، دیارە کەخوای میهرەبان چاکەکارو چاکەخوازانی خۆش دەوێت. ١٣٤

ئەم لێخۆشبوون و میهرەبانیە تەنها بەرامبەر بەموسڵمان نیە، چونکە ئەگەر تەماشا و وردبوونەوە لەئایەتەکە بکەی بەشێوەیەکی گشتی باسی دەکات و تایبەت نیە بەموسڵمانانەوە، هەروەها لەژیانی پێغەمبەری خوادا ڕەنگدانەوەی هەیە، لەمێژووی موسڵمانانیشدا ڕەنگدانەوەی هەبووە.

تەنانەت لەڕووی دادپەروەریشەوە ڕاستی ووتن تەنها پەیوەست نیە بەموسڵمانانەوە وەك ئاینی یەهودی، لەناو ئاینی جولەکەدا دادپەروەری تەنها بۆ یەهودیە، بێجگە یەهودی دادگەری لەگەڵ کەسی تردا پێناکرێ، بەڵام

لەئیسلامدا بەرفراوانتر تەماشا دەکرێت و دادپەروەری و ڕاستی شمولیە و هەموو مرڤایەتی دەگرێتەوە. خوای گەورە دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ لِلَّهِ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَىٰ أَلَّا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ} ٨ المائدة

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، هەمیشە و بەردەوام پابەندی فەرمانەکانی خوا بن، وە شایەتی دادوەرانە ئەنجام بدەن، وە دوژمنایەتی هیچ کەس و هیچ لایەك واتان لێنەکات کە لەدادپەروەری لابدەن، بێگومان دادپەروەری نزیکترە لە تەقوا و خواناسیەوە، دەی کەواتە لەخوا ترس و پارێزگار بن، چونکە بەڕاستی خوا ئاگادارە بەکارو کردەوەتان.

### مافەکانی مرۆڤ لەگوتاری ئیسلامدا گشتگیرە:

مافەکانی مرۆڤ لەم ئیسلامەدا ئەوەیە کەگشتگیرە لەهەموو مافەکان تری دەست نوس و دەستکردی مرۆڤدا، لە هەموو فەرهەنگەکاندا، ئەگەرچی مافی ڕۆشنبیری بێت، یاخود سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی..هتد.

ئەم مافانە هەموو کەسێك دەگرێتەوە، لەموسڵمان بێجگە لە موسڵمانیش، ئەگەر لەژێر سایەی پەیڕەو و پرۆگرامی ئیسلامدابن، بێ بیرکردنەوە لەوەی کە ئەو مرۆڤە چ جۆرە پێویستییەکی هەیە، یاخود خاوەنی کام زمانە یان چ ئاینێکی هەڵبژاردووە بۆ خۆی، مافەکان وەك یەکە بۆ هەموو لایەك بەیەکسانی ئەمە دروشم نیە، لای هەمووان ئاشکرایە کەمێژووی ئیسلام ئەوەی سەلماندووە لە هەموو جیهانی ئیسلامی بەدرێژایی هەزار و چەند ساڵەی دەسەڵاتی نەخاوەنی ئوتێل بووە نەپاسپۆرت! خەڵکی بەگشتی ئازاد بوون لەهەموو ڕوویەکەوە لەناو دەسەڵاتی موسڵمانان، مەسیحی و یەهودی و مەجوسی و یەزیدی و تەتاری و بوزی..هتد ژیاون بەیەکەوە مافەکانیان پارێزراو بووە.

مافەکان لەئیسلامدا ناگۆڕێن و کەم ناکرێتەوەو لانابرێت لەڕووی یاساییەوە، واتە: بەهیچ شێوەیەك ئاڵوگۆڕی بەسەردا نایەت وەك خۆی مافەکانی مرۆڤ دەمێنێتەوە (ثابتة ولا تقبل الإلغاء أو التبديل أو التعطيل)

وە لەم تایبەتمەندیاندا ئەوە دەردەکەوێت کەئەم مافانە بەهیچ شێوەیەك ئاڵوگۆڕی بەسەردا نایەت نە لەکاتی جەنگ و نە لەکاتی ئاشتی، چونکە ئەم مافانە شەرعی خوای گەورەیەو شەرعی خوای گەورەش بەهیچ جۆرێك ناگۆڕێت، ئەو دایناوە بۆ مرۆڤەکان، ئەم وەك دەستوری مرۆڤ نیە کەدایدەنێت بۆ مرۆڤەکان بەئارەزو ویستی خۆی جیاوازیی لەنێوان زمان و پێستی خەڵکی راقی ئەرستۆکراتی و چینایەتی بکات، بەڵکو کەماف دانراوە بۆ گشت خەڵکیە بێ جیاوازی، بۆیە ئیسلام و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کۆتا ئاین و کۆتا پێغەمبەرە تا زەوی و ئاسمان بمێنێت ئەم ئاینە بەردەوامە و گۆڕانکاریی بەسەردا نایەت.

لەئیسلامدا مافی کۆمەڵ پێشل ناکرێت، لەبەرئەوەی تاکەکان پێکهاتەی ئەو کۆمەڵەن، ئەمە جیاوازییەکی زۆر گەورەیە لەنێوانی مافەکانی مرۆڤ کە نەتەوە یەکگرتووەکان دایانناوە بۆ مرۆڤ، ئەوەی تاك ویستی خۆیەتی لەزینا و لەسێکسی شاز وەك حەزی پیاو لەپیاو پێچەوانەکەی ئافرەت لەگەڵ ئافرەت یان ئاژەڵ لەگەڵ مرۆڤ کە لەگەڵ فیترەتی مرۆڤی ساغ ناگونجێت، کۆمەڵگا بەرەو گەندەڵی نابات، بەهۆکاری ئەوەی کەرەغبەتی تاکهکەس بێتەدی مافی کۆمەڵگا پێشێل بکرێت یاخود پێچەوانەکەی دەبێت هەموو پابەند بن بەشەریعەتی خوای موتەعال، کە ئەمە ڕویدا مافی مرۆڤەکان پارێزراوە کەسی تێدا ئیستیغلال ناکرێت[٣٤].

---

[٣٤] کتێبی مافی مرۆڤ لەئیسلام دا لەنوسینی دکتۆر سلێمان حەقیل لەلاپەڕە ٥٣ باس کراوە.. (أخلاقيات الحروب في السنة النبوية) للدكتور راغب السرجاني. ل ٢٥٥

**مافی ژیان:**

خوای گەورە مافی ژیانی وەك سەرەتاترین ماف باسکردوە لەپەیامەکەیدا کە ناردویەتی بۆ پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) دەبێت هەموو مافی ژیانیان هەبێت لەم سەرزەوییەدا..

ئەمە پەیوەستیشە بەمافەکانی ژینگەوە، چونکە ئەوە دەگەیەنێت، کە دەبێت ژینگە بپاریزرێت بۆ ئەوەی مرۆڤەکان توشی کارەساتی سروشتی نەبن و دەستەبەری خواردن و ئاوی پاك و داو دەرمان بۆ مرۆڤەکان لەکاتی نەخۆشییاندا، پاراستنی خەڵکی لەدەستدرێژی خەڵکانی چەتون و خوێنرێژ.

مافەکانی ژیان بۆ مرۆڤ خوای گەورە بەمجۆرە باسیکردوە لەیاساکانی خۆیدا یاخود بەدوو شێوە بەگشتی باسی لێوەکردووە هەرچەندە لقی تری لێدەبێتەوە بەڵام باسێکی دەکەین بۆ بەرچاو ڕوونی..

قەدەغەکردنی کوشتنی مرۆڤ واتە: (حرام کردنی کوشتنی مرۆڤ): ( وَلاَ تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ) ١٥١ الأنعام

واتە: هیچ کەس بەناحەق مەکوژن، ئەمە ئامۆژگاری پەروەردگارە بۆ ئێوە، بەڵکو ژیرو هۆشمەند بن.

لەباسی ئەم یاسایەدا ئیبن سعدی دەڵێت: ((مەبەستی ئەم ئایەتە گشتگیرە هەموو مرۆڤێك دەگرێتەوە، واتە: موسڵمان، کافر، پیاو، ئافرەت، منداڵ، پیر، لاو، بەندە، ئازاد، لەهەموو سەردەمێکدا)).

ئیبن سەعدی دەڵێت: وهذا شامل لكل نفس حرَّم الله قتلها من صغير وكبير، وذكر وأنثى، وحرٌّ وعبد، ومسلم وكافر له عهد[٣٥]

ڕێگرتن لەکوشتنی مرۆڤ نەهێشتنی تاوانی کوشتن بۆ ئەم باسە چەند لقێکی تری لێدەبێتەوە، یان بەچەند خاڵێکیتر دەبێت دەستنیشانی بکەین بۆ ئەوەی

[٣٥] تیسیر الكريم الرحمن (ص ٤٥٧)

باشتر لەم باسە تێبگەین، چونکە زۆرن، ئەوەی کە ئیسلام بەخوێنڕێژ ناوزەد دەکەن.

یەکەم: حەرامکردنی چەك هەڵگرتنی موسڵمان لەدژی موسڵمان.
پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: هەر کەسە چەك بەرامبەر موسڵمان هەڵبگرێت ئەوە لەموسڵمانان نیە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (من حمل علينا السلاح فليس مِنَّا (أخرجه البخاري في الفتن، باب من حمل علينا السلاح (٧٠٧٠) من حديث ابن عمر رضي الله عنهما.)
دووەم: حەرامکردنی جنێو بەموسڵمان و کوشتنی موسڵمان.
پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت جنێودان بەموسڵمان دەرچوونە لە فەرمانی خوای گەورە (فاسق) وە کوشتنی موسڵمان کوفرە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم
دەفەرموێت: (سباب المسلم فسوق، وقتاله كفر) (أخرجه البخاري في الإيمان، باب خوف المؤمن أن يحبط عمله وهو لا يشعر (٤٨)، ومسلم في الإيمان (١١٦) من حديث ابن مسعود رضي الله عنه)
لەمبارەوە زانایان فەرمویانە: کە گوایا مەبەست بەدەرچون نیە لەئیسلامەکە بە تەواوەتی کافربێت و لە ئۆمەتی موسڵمانان دەربچێت، بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە کە ئاگادارکردنەوەیەتی لەوەی کەسەر دەکێشێت بەرمو دەرچون لە ئوممەتی موسڵمانان..
(قال الحافظ ابن حجر: «لما كان القتال أشد من السباب؛ لأنه مفضٍ إلى إزهاق الروح عبرَّ عنه بلفظ أشد من لفظ الفسق وهو الكفر، ولم يرد حقيقة الكفر التي هي الخروج عن الملة، بل أطلق عليه الكفر مبالغةً في التحذير)..[٣٦]

٣٦ فتح الباري بەرگی ١ ل ١٣١

سێیەم: وەرگرتنەوەی تۆڵە و مافەکان لەڕێگایی دەسەڵاتەوە

لەدیاریکردنی ئەم یاسایەی خوای گەورە ئەوەمان بۆ دەردەخات، کە مرۆڤەکان بە ئارەزوو ویستی خۆیان تۆڵە لەخەڵکی وەرناگرن، تا یاسای دارستان دروست ببێت هەرکەسە بۆ خۆی ببێتە دەسەڵاتدار، بۆیە خوای گەورە ئەم یاسایەی بۆ دەستنیشانکردوین، کەدەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأُنثَى بِالأُنثَى فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاء إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ ذَلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ فَمَنِ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ)١٧٨ البقرة

واتە: (ئەی ئەوانەی کەباوەڕتان هێناوە، لەسەرتان نوسراوە و کراوە بەئەرکی سەرشانتان تۆڵەسەندنەوە بۆ کوژراوەکان، کەسێکی سەربەست بەکەسێکی سەربەست، وە بەندەش لەجیاتی بەندە، وەئافرەت لەجیاتی ئافرەت (واتە هەر کەسێك بەتاوانی کوشتن هەستا دەبێ بکوژرێتەوە)، بەڵام ئەوەی چاوپۆشی لە براکەی کرد، با بکوژەکە چاك ڕەفتار بێ، وەبا کەسوکاری کوژراوەکەش چاك ڕەفتار بن، بکوژەکە بەجوانی خوێنبەهای کوژراوەکە بدات، ئەم ئاسانکردنە لەلایەن پەروەردگارتانەوە (کەلەجیاتی کوشتنەوە خوێنبەهای وەرگیرێت) ڕەحمەت و میهرەبانیە، ئەوسا ئیتر ئەوەی لەوەودوا دەستدرێژی بکاو لەسنور بترازێت سزای بەئێشی بۆ ئامادەکراوە)

هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێت: (وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَا أُولِي الأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ) ١٧٩ البقرة

واتە: ئەی هۆشمەندەکان لەتۆڵەسەندنەوەدا (لەو کەسانەی کەخەڵکی بەناحەق دەکوژن) ژیان هەیە بۆ کۆمەڵ بەگشتی، وەترساندنی ئەو کەسانەیە کەنیازیان خراپە، بەڵکو تەقوا و لەخوا ترسان ببێتە پیشەتان و خۆتان لەدەستدرێژی و تاوان بەدوور بگرن.

قەتادە دەفەرموێت: ئەم تۆڵەسەندنەوە بۆ ئەوەیە کەخەڵکی دەست درێژی نەکەنەسەر یەکتری و مافەکانی یەکتری پێشل نەکەن، کە وەك لەسەردەمی

جاهیلیدا دەبووە هۆکاری کوشتاری خەڵکێکی زۆر ئەم یاسایە بۆ ئەوەیە کەمافی مرۆڤ تێیدا پارێزراو بێت...

قەتادە دەفەرموێت: (جعل الله هذا القصاص حياة ونكالاً وعظة لأهل السفه والجهل من الناس، وكم من رجل قد همَّ بداهية لولا مخافة القصاص لوقع بها، ولكن الله حجز بالقصاص بعضهم عن بعض، وما أمر الله بأمر قَطُّ إلا وهو أمر صلاح في الدنيا والآخرة، ولا نهى الله عن أمر قَطُّ إلا وهو أمر فساد في الدنيا والدين، والله أعلم بالذي يصلح خلقه)[٣٧]

چوارەم: حەرامکردنی خۆکوژی (الانتحار):

پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) لەمبارەیەوە دەفەرموێت: کە ئەبوو هورەیرە ڕەزامەندی خوای لێبێت دەگرێتەوە: هەرکەس لەشاخێکەوە خۆی فڕبداتە خوارەوە بەخلودی

لە جەهەنمدا دەمێنێتەوە, واتە: هەتا هەتایی, هەر کەس ژەهر بخواتەوە خۆی بکوژێت بەهەمیشەیی لەدۆزەخدا دەمێنێتەوە, یاخود هەرکەس بەچەقۆ خۆی بکوژێت کەئیبن کەثیر دەڵێت: ئەو ئاسنە, مەبەست بەخەنجەر و چەقۆیە.

(عن أبي هريرة رضي الله عنه، عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: «من تردَّى من جبل فقتل نفسه، فهو في نار جهنم يتردى فيه خالدًا مخلدًا فيها أبدًا، ومن تحسَّى سُمًّا فقتل نفسه فسمُّه في يده يتحساه في نار جهنم خالدًا مخلدًا فيها أبدًا، ومن قتل نفسه بحديدة فحديدته في يده يَجَأُ بها في بطنه في نار جهنم خالدًا فيها أبدًا أخرجه البخاري في الطب، باب شرب السم والدواء به (٥٧٧٨)، ومسلم في الإيمان (١٠٩).) (قال ابن الأثير: «يقال: وجأته بالسكين وغيرها وجْأً، إذا ضربته بها» النهاية في غريب الحديث (٥/ ١٥٢)

---

(٢٨) جمع البيان بەرگی ٢ ل ١١٩

پێنجەم: بۆ ئەوەی مرۆڤ بژی هەندێك قەدەغەكراو ڕێگای پێ دەرێت (إباحة المحظورات للضرورة)

خوای گەورە لەمبارەوە دەفەرموێت (إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللَّهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ)١٧٣ البقرة

واتە: (خوای پەروەردگار تەنها مردارەوە بوو، خوێن، گۆشتی بەراز، ئەو مالاتانەی بۆ غەیری خوا سەردەبڕرێن حەرامیكردوە لێتان، بەلام ئەگەر كەسێ ناچاربوو بە بێ زیادەخۆری و لەسنور دەرچوون، ئەوە گوناهی ناگات، چونكە خوا لێخۆشبوو و بەبەزەیی و دلۆڤانە.

شەشەم: كوشتنی منداڵ لەناو ڕەحمی دایكدا:

خوای گەورە بۆ دەستەبەركردنی مافی منداڵ و مافی ژیان بۆی، یاسای بۆ داناوین دەفەرمووێت:

(وَلاَ تَقْتُلُوا أَوْلاَدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلاقٍ نَحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْئًا كَبِيرًا)٣١ الإسراء

واتە: (نەكەن منالەكانتان لەترسی گرانی و برسێتی بكوژن، چونكە پەروەردگارتان ڕۆزی بەخش و میهرەبانە، ئێمە ڕزق و ڕۆزی دەبەخشین بەوانیش و بەئێوەش، چونكە بەڕاستی كوشتنی ئەوان گوناه و تاوانێكی زۆر گەورەیە)

هەروەها دەفەرموێت:

(يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَنْ لاَ يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا وَلاَ يَسْرِقْنَ وَلاَ يَزْنِينَ وَلاَ يَقْتُلْنَ أَوْلاَدَهُنَّ وَلاَ يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلاَ يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ)١٢ الممتحنة

واتە: ئەی پێغەمبەر صلی اللەعلیەوسلم ئەگەر ئافرەتانی ئیماندار هاتن بۆلات و پەیمانیان پێدایت كەهیچ جۆرە هاوەڵێك بۆ خوا بڕیار نەدەن، دزی نەكەن، زینا نەكەن، ڕۆڵەكانی خۆیان نەكوژن، هیچ جۆرە بوختانێك نەكەن لەنێوان دەست و

پێی خۆیاندا (واتە دوورە پەرێزبن لە هەموو جۆرە خیانەتێك)، وە فەرمانبەردار بن لە هەموو چاکەیەکدا و یاخی نەبن، ئەوە تۆ پەیمانیان لێوەرگرە و لەخوا داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکە، چونکە بەڕاستی خوا لێخۆشبوو و میهرەبانە.

**مافی ئازادی مرۆڤ:**

هەموو مرۆڤەکان خوای گەورە دروستیکردون مافی ئازادییان هەیە، شێخ الاسلام لەمبارەوە دەفەرمویت: ((هەموو بەندەکان خوای گەورە دروستیکردوون، بۆ هیچ کەس نیە مافی ئەویتر پێشێل بکات بەناوی ئەوەی کەئەم بەندەیە موسڵمانە یاخود بێ باوڕە، یان بەناوی ئەوەی کە ئەم بەندەیە بەهەشتییە یان ئەو بەندە یەییتر دۆزەخیە، ئەم میتۆدە تەنها خوای گەورە دەستنیشانی دەکات کەس بۆی نیە مافی بەرانبەرەکەی بەو بیانوانە پێشێل بکات و بۆ نمونەی ئەم وتەیەی خۆی ئەم ئایەتە دەکاتە بەڵگە، وەك یاساو ڕێسایەك بۆ مرۆڤایەتی خوای گەورە دەفەرمویت: (أَفَغَيْرَ دِينِ اللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ) ٨٣ آل عمران

واتە: ئایا ئەوانە بێجگە لەئاینی خوا شتێکی تریان دەوێت؟! لەکاتێکدا کەهەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە تەسلیم و ملکەچی پەروەردگارە بەرەزامەندیی بێت، یان بەناچاری، هەموانیش هەر بۆلای ئەو دەگەڕێتەوە.

ئیبنو تەیمییە ئاماژەی پێداوە: ((خوای گەورە خۆی مرۆڤەکانی دروستکرد و ڕۆزی داوە، مافی ژیانی پێبەخشیوە، هەر خوا خۆی خاوەنی مرۆڤەکانە بۆ هیچ کەس نیە کەمافی ئازادی ئەو مرۆڤە پێشێل بکات، ئەگەرچی ئەو کەسە ئینکاری لە بوونی خوا بکات یان بڕوای بەئاینی پیرۆزی ئیسلامیش نەبێت.))

(قال شيخ الإسلام: "إن العبد يراد به المعبَّد الذي عبَّده الله فذَلَّله ودبَّره وصرفه، وبهذا الاعتبار المخلوقون كلهم عباد الله من الأبرار والفجار والمؤمنين والكفار وأهل الجنة وأهل النار، إذ هو ربهم كلهم ومليكهم، لا يخرجون عن مشيئته وقدرته وكلماته التامات التي لا يجاوزهن بَرٌّ ولا فاجر، فما شاء كان وإن لم

يشاءوا، وما شاءوا إن لم يشأه لم يكن، كما قال تعالى: {أَفَغَيْرَ دِينِ اللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ} [آل عمران: ٨٣]، فهو سبحانه رب العالمين وخالقهم ورازقهم ومحييهم ومميتهم ومقلب قلوبهم ومصرف أمورهم، لا ربَّ لهم غيره، ولا مالك لهم سواه، ولا خالق إلا هو، سواء اعترفوا بذلك أو أنكروه، وسواء علموا ذلك سأو جهلوه، لكن أهل الإيمان منهم عرفوا ذلك واعترفوا به، بخلاف من كان جاهلاً بذلك أو جاحدًا له، مستكبراً على ربه لا يقرُّ ولا يخضع له، مع علمه بأن الله ربه وخالقه)[٣٨]

**مەبەست لەئازادی چیە؟**

ئازادی بریتیە لەوەی کەمرۆڤ خۆی خاوەنیەتی کاریگەری لەسەر خەڵکانیتر نیە، خۆی خاوەنی دەسەڵاتە بەسەر ئەوەی خاوەنیەتی، کەهەیەتی کەس بۆی نیە ئەو مافەی لێ زەوت بکات، مرۆڤ بەفیترەتی خۆی بەئازادیی لەدایك دەبێت، کە س ناتوانێت دیلی بکات یاخود دەست بەسەری بکات، ئەوەی کە لەتواناو مێشکی خۆیدا ئەنجامی ئەدا، ئەوە هیچ هێزێکی دەرەکی بۆی نیە شتی بەسەردا بسەپێنێت کە لەتوانایدا نیە، نابێت مرۆڤەکان کۆیلە بکرێن لەپەرستش، چونکە تەنها خوای گەورە مرۆڤی دروستکردوە ئەویش ئازادیکردون و بە ئازادیی بەرهەمی هێناون و دەبێت بەئازادی بژی.
زۆر لەو زانایانە باسیان لەم پێناسانە کردوە ئەوەی کە جێگایی سەرنجی نوسەر بوو وە نزیك بوو لەدید و تێڕوانینی، ئەم زانا پایەبەرزە ناودارەیە زوحیلییە کە دەڵێت: ((فالحرية: هي حرية الإنسان تجاه أخيه الإنسان من جهة، وبما يصدر عنه باختياره من جهة أخرى))
یەکسانی مرۆڤەکان لەڕووی کەسایەتی خۆییەوە ئازادیی تەواوی هەیە..

---

[٣٨] العبودية، مجموع الفتاوى بەرگی ١٠ ل١٥٥

بۆیە – نوسەر پێی وایە .. مرۆڤایەتی لە زۆربەی مافەکاندا هاوبەشن، ئازادیەکانی مرۆڤ دەست نیشان ناکرێت .. مەگەر لە چوارچێوەی ڕێکخستنی یاسایەکدا بێت بۆ پاراستنی گۆمەڵگا بە گشتی.
هەموو مرۆڤێك لەڕووی کەسایەتیەوە ئازادە سەراپا لەدەستنیشان کردنی زاتی خۆیدا کەچ جۆرە نمونەیەك هەڵدەبژێرێت بۆ کەسایەتی خۆی وەك ئیمامی شافعی دەفەرموێت لەم بارەوە لەکتێبە بەناوبانگەکەی بەناوی دایك .. (إن أصل الناس الحرية حتى يعلم أنهم غير أحرار).[39] مرۆڤ بەئازادی لەدایك دەبێت بۆ هیچ کەس نیە ئەسیرو کۆیلەی بکات، یاخود بچووکی بکاتەوە و یاری بە کەسایەتی بکات یان هەڵی خڵەتێنیت، یاخود ئیستغلالی بکات.

**مافی کار کردن بۆ هەمووان:**
خوای گەورە مافی داوە بەهەموو مرۆڤەکان کەکار بکەن بەیەکسانی بەگوێرەی توانای مرۆڤ خۆی بێ زۆر لێکردنی.

**دانانی کاتی کارکردن بۆ بەدەستهێنانی بژێوی ژیان:**
خوای گەورە دەفەرموێت: (وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشًا) ١١ النبأ
واتە: ڕۆژیشمان بۆکردونەتە هۆی ژیان و هەوڵ و کۆشش بۆ بەدەستهێنانی ڕزق و ڕۆزی. ئیبن جەریر دەڵێت: ((ڕۆژ بۆ بەدەستهێنانی بژێوی خۆتانە بڕۆن وە دەستی بهێنن بۆ خۆتان)).
ئیبن بەطال دەڵێت: ((ومن منع الأجير حقه فقد ظلمه حين استخدمه واستحل عرقه بغير أجر، وخالف بصيرة الله في عباده لأنه استعملهم، ووعدهم على عبادته جزيل الثواب وعظيم الأجر، وهو خالقهم ورازقهم)) ( شرح صحيح البخاري )٣٩٩/٦)

---

[39] الأم..ئیمامی شافعی بەرگی ٦ ل ٢٦٥

"وجعلنا النهار لكم ضياء لتنتشروا فيه لمعاشكم، وتتصرفوا فيه لمصالح دنياكم، وابتغاء فضل الله فيه)[40] پاشان خوای گەورە دەفەرموویت: (فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلاَةُ فَانْتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِنْ فَضْلِ اللَّهِ) ١٠ الجمعة

واتە: هەرکاتێك كەنوێژ تەواو بوو بڵاوببنەوە بەزەویداو بەتەمای بەخششی خوا هەوڵ و كۆشش بدەن، لەهەموو كاتێكدا یادی خوا زۆر بكەن لەهەموو چالاكیەكانی ژیاندا ناوی ئەو زاتە لەسەر زارو لەناو دڵتاندا بێت بەڵكو سەرفرازی هەمیشەیی بەدەستبێنن.

لەهەمان كاتدا مافی ئەوەمان پێنەدراوە كەسەروەتی خەڵكی بخۆین و پارەی كرێكار نەدەین، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموویت لەمبارەوە:

(عن أبي هريرة رضي الله عنه، عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: قال الله: ثلاثة أنا خصمهم يوم القيامة: رجل أعطى بي ثم غدر، ورجل باع حُرًا فأكل ثمنه، ورجل استأجر أجيراً فاستوفى منه ولم يعطه أجره)(أخرجه البخاري في البيوع، باب إثم من باع حرًا (٢٢٢٧).)

سێ پۆل خەڵكی هەن پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لەبەرامبەردا لەقیامەتدا لەڕوویاندا دەوەستێت.

یەكەم: كەسێك، كە بەناوی ئیسلام و دینداری بانگەواز بكات خەڵكی پێ هەڵبخڵەتێنێت.

دووەم: كەسێك، كەسێكی ئازاد بكاتە بەندە و مافی پارەكەی بخوات.

سێیەم: كرێكارێك كار بۆ كەسێك بكات و كەسەكە ماف و پارەی كرێكارەكە بخوات.

هەر كەس حەقی هەر كرێكارێك بخوات، ئەوە زوڵمی لێكردوەو مافی ئەو عارەقەی نەداوەتێ كەڕشتیویەتی و ماندووبوونەكەی بەهەدەر بردوە، ئەمەش ڕێك پێچەوانەی ڕێنمایەكانی پەروەردگارە بۆ مرۆڤەكان، چونكە خوای گەورە

---

[40] جامع البيان بەرگی ١٢ل٣٨٧

کەداوای بەندایەتی لەمرۆڤ کردووە بەگوێرەی ماندبوونەکەشیان پاداشتیان ئەداتەوە لەدنیاو لەقیامەتیشداو پاشان بێجگە لەوەی کەپاداشتیان ئەداتەوە لەسەر بەندایەتی دروستیکردوون و رزق و رۆزی داون.

### ئازادی لەکارکردندا

هەموو مرۆڤ ئازادە لەشێوەی کارکردنیدا بەمەرجێك کاریگەریی نەبێت لەسەر خەڵکانیتر مافی ئەوان زەوت بکات، مافی خۆیەتی کاتەکەی هەڵبژێرێت ئازادە لە مافی کاتی کاریدا بۆ ئەوەی لەو کاتەی کەدەیەوێت کار بکات، پەیمان بەستن لە سەر کارکردن چەندە مافی هەیە، کەپارە لەوکارە وەردەگرێت، لەهەمان کاتدا دەستنیشانی کاتی کارەکەی دەکات، کەچەند کاتژمێر کاردەکات، دەستنیشانی جێگاکەشی هەر دەبێت ئازاد بێت، نابێت هیچ کەس بەکار بهێنرێت بۆ ئەوەی ئیستغلال بکرێت[٤١].

### بناغەی سێیەم: دەسەڵات

#### دەسەڵات:

لەچەمکە بنەڕەتیەکانی زانستی سیاسەتە، کە بەتوانایی کەسێك بۆ ناچارکردنی کەسانی دیکە دەگوترێت، لەرۆژئاوادا بە(power) ناسراوە، کە مل بۆ داواکاری و ویستی ئەو دانەوێنن.

---

[٤١] لكل إنسان الحق في أن يعمل ما يشاء وأن يكسب من الطرق المشروعة ما شاء وله الحق في اختيار وقت العمل وساعاته، واختيار الوقت إذا كان يعمل لنفسه، فإن عمل إلى غيره فالعبرة في العقود عامة، وعقد العمل التراضي وما يتم الاتفاق عليه في تقييد الزمان والمكان وتحديد ساعات العمل وأجره، ولا تقيد حرية العمل إلا القيود العامة في الحلال والحرام، وضمن الأحكام الشرعية، وألا يؤدي العمل إلى الإضرار والضرر بالغير. حقوق الإنسان، محمد الزحيلي ل ٢٨٦.

ئەو کەسە بۆ گەیشتن بەمەبەستی خۆی لەهەموو شێوازەکان کەڵك وەردەگرێ، یەکێك لەتایبەتمەندیەکانی ڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی، هەبوونی ئوتۆریتەیە، کەنەریت و یاساکان دانیان پێداناوەو ڕەوایە و سەرکردایەتی لەکۆمەڵگادا، بەهۆی دانپێدانان بەتواناییەکەیەوە، کە لەکەسێك یان لەبەرپرسێکدا شاراوەتەوە.

دەسەڵاتی سیاسی پێویستی بەپەیوەندییەکی دەروونی لەناو بژاردە سیاسیەکان و ئەو کەسانەدا هەیە، کە لەژێر کاریگەریی دەسەڵاتدان، سەپاندنی دەسەڵاتی سیاسی، تایبەتمەندیی سەرەکی سیستەمێکی سیاسی لەکاتی سەرهەڵدانی سەروەرییە.[٤٢]

لەئیسلامدا دەسەڵاتی تەواوەتی لەپەروەردگارەوە وەردەگیرێت، پێچەوانەی دید و بۆچوونی دیموکراسی و عەلمانیەت و مەدەنیەت، کە ئەم سێ چەمکە، سێ کوچکەی پێکهاتنی بیری سیکۆلاریزمە لەجیهاندا بەم سێ چەمکە سیستەمی سیکۆلار دامەزراوە.

بۆ ئەوەی زیاتر لەچەمك و مانای دەسەڵاتی ئیسلامی تێبگەین بەبەراورد دەستنیشانی دەکەین لەگەڵ بەرنامەکانی تردا، ئەو شێوازی بەراوردە بۆ زیاتر و ئاسان تێگەیشتنی خوێنەرە لەباسەکەماندا، چونکە بەناسینی دژی زیاتر پێچەوانەکەی دەردەکەوێت، ئاسانتر خەڵك توانای وەرگرتنی دەبێت.

لە ئیسلامدا سەرەتا دەسەڵات لەئیمانەوە سەرچاوە دەگرێت کەشەریعەتی خوای پەروەردگارە..

لە ڕاستیدا دامەزارندنی باوەڕ (ئیمان) خۆبەخشین و گەردن کەچییە بەزانست و کردار بەشەریعەتی ئیسلام، بەوەی کەپێتخۆشە و بەوەشی کە لاتناخۆشە، لەڕازیبوون و ناڕازیبوون لەتوڕەیی و ئارامگرتن، بەواتای ئەوەی نابێت هیچ شتێك پێش وتەی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی (-صلى الله علیه وسلم-)

---

[٤٢] فەرهەنگی سیاسی نوێ ساڵی ٢٠٠٦ ل ٢٤٩

بخەیت، هەروەك خوای موتەعال لەقورئاندا ئاماژەی پێداوە دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ) ١ الحجرات.

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە پێش خواو پێغەمبەری خوا مەکەون (لەبڕیارو پێشنیاردا) لەخوا بترسن و پارێزگار بن، چونکە بەڕاستی خوا بیسەرە بەگوفتارتان و زانایە (بەنیاز و نهێنیەکانتان).

هەرچەندە مەبەستەکە دیارە، بەڵام بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە، بەواتای ئەوەی ئەگەر فەرمانەکە بەسەر سەرۆکی وڵات و وەزیر و خەڵکی بەگشتیدا دانا و ژێر و ئازادو بەندەیشدا.. تاد دەچەسپێنرێت.!

دانپێدانان بەدەسەڵات و هەیمەنەتی شەریعەت و حاکمیەتی خوای گەورە و ڕازیبوون پێی، کەقوبوڵتکرد، دەبێت بەکردارو گوفتار ڕازی بێت لەسەری و بێ هیچ مەرجێك و دوو دڵییەك، ئەمەش بنەمایەکی ئیمانیە بنەڕەتەکەی دەگەڕێتەوە بۆ وەحی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا﴾ ٦٥ النساء

واتە: نەخێر، سوێند بەپەروەردگارت ئەوانە ئیمان و باوەڕیان دامەزراو نابێت، هەتا لە هەموو کێشەیەکدا کە ڕوودەدات لەنێوانیاندا تۆ نەکەن بەدادوەرو گوێڕایەڵی تۆ نەکەن، دوای ئەوەش نابێت لەدڵ و دەرونیاندا هیچ نارەزاییەك دروستببێت بەرامبەر ئەوەی کە دادوەریت لەسەر کردوە، دەبێت بە تەواوی تەسلیم بن و ڕازی بن.

لەگەڵ ڕوونی و ئاشکرایی ئەم شەریعەتە و بیروباوەڕەکەی و ئیجماع لەسەری، کەچی ڕەوتە عەلمانیەکان و بزوتنەوە ڕۆشنبیرییەکان دەیانەوێت لەم بیروبۆچونە کەم بکەن و نوقسان بیناسێن و سەروەری بگەڕیننەوە بۆ مرۆڤ، گوێنەدان بەسەروەری شەریعەتی خوای گەورە حاکمیەتەکەی و بەکردار و پراکتیزەکردن، دەیانەوێت ئەم شەریعەتە لەناو خودی موسڵمانان بخرێتە پرۆسەی دەنگدانەوە، ئایا خوای باڵا حوکم بکات، یان مرۆڤەکان؟!

لەناو ئەم گروپ و ڕەوتانەدا دوو جۆرن، جۆرێکیان ڕازین بیخەنە دەنگدان، کۆمەڵی دووەمیان، بەهیچ شێوەیەك ڕازی نین و دەیانەوێت دین بەئارەزو و ویستی خۆیان پێناسە بکەن و بیخەنە چوارچێوەی دینێکی ڕەهبانی وەك ئاینی مەسیحی تەماشای دەکەن، لەهەموو جۆرە چالاکی سیاسی و هەیمەنەت و دەسەڵات دووری دەخەنەوە، ئەم جۆرە بیرو بۆچوونە لەدوای داگیرکەری ڕۆژئاواو دەسەڵاتی دیکتاتۆریەکانیان لەناو موسڵماناندا بڵاوبویەوە لەسەر دەستی عەلمانیەت.

گومان لەوەدا نیە کەدەسەڵاتە عەلمانیەکان بۆچوونیان وایە بەگشتی کەحەڵاڵ و حەرام بۆچونی تاکی موسڵمانە، بەم هۆکارە دەڵێن، دەتوانرێت بخرێتە دەنگدانەوە، دووهەمیشیان ئەگەر گەل هەڵیبژرێت، هەر بەلایانەوە گرنگ نیە کەشەریعەتی خوایە، بەڵکو پێیان وایە سەروەری گەلەکەیە کەپێشێل ناکرێت..!

لێرەدا دەکەوینە جەنگێکی فکری دەستەو ئێخە لەگەڵ موسڵمانانی تێنەگەیشتوو لەئیسلام، تەنانەت لەگەڵ هەندێك لەئیسلامیەکان و دەنگیش بەسەر ئەو عەلمانیانەدا بەرزدەکەینەوە کەبەچکە موسڵمانان و مەفتون بوونەتەوە بەم عەلمانیەتە، کە بە نەخوازراوی هێناویانەتە ماڵی موسڵمانان، لەگوتاری سیاسی ئیسلامی نەگیشتوون.

کە دەڵێین، سەروەریی، دەبێت وشەی سەروەریی بزانین لەکوێوە سەرچاوەی گرتووە، لای موسڵمانی تێگەیشتوو لەحاکمیەتی خوای گەورە و لەگەڵ ئەوەی تێنەگەیشتەوە لەحاکمیەتی خوای موتەعال جیاوازی چیە؟ هەرچەندە زۆرێك لەموسڵمانانی پابەندیش تا ڕادەیەکی زۆر بێئاگان لەم جۆرە بوارانە، کەڕوحی ئیسلامەکەیە، کەیەکتاپەرستی لەسەر دامەزراوە، توحید شێخولئیسلام ئیبن تەیمییە کردویەتی بەسێبەش،

یەکەم، یەکتاپەرستی لەخوایەتی و هەموو جۆرە بەندایەتیەکانی، هەر لەنوێژ و زیکر و حەج و ڕۆژو تا خوێندی قورئان وسەربڕین و قوربانی.. هەموو ئەمانە پاداشت و سزای لەسەر دیاریکراوە لەدونیاداو لەقیامەتیشدا، بۆ نموونە ئەوی

نوێژ نەکات لەیاسای ئیسلامدا سزادەدرێت، یان ئەوەی زەکات نەدات بەهەمانشێوە سزا دەدرێت لەدونیادا، وەك ئەبوبەکر خەلیفەی موسڵمانان ـ ڕەزای خوای لێبیت ـ کردی و لەمێژوودا بەجەنگی هەڵگەڕاوەکان ناسراوە، کەواتە ئەمە بۆیە سزای بۆدانراوە دەبێت سەروەریی بپارێزرێت.

دووەم: یەکتاپەرستی لەپەروەردگاریەتی خوای موتەعالدا، هیچ کەس ناتوانێت لابدات لەوەی کەئەم گەردوونە خوای گەورە و کارساز دروستیکردومو بوونیادی ناوە بەجوانترین شێوە، ئەوەی هاوبەش بۆ خوای گەورە دابنێت لەناو ئاینی ئیسلامدا سزا دەدرێت، هەروەك چۆن حەلاج سزدرا و پێی وابوو خوا تێکەڵ دەبێت لەگەڵ لاشەی مرۆڤەکاندا، یاخود هەندێك لەسۆفی و شیعەکان پێیانوایە: پیاوچاکان کاریان بەدەستە خوای گەورە داویەتە دەستیان، ئەوان وەکیلن بۆ خوا ـ زۆرێکیش لەوان لەسەردەمی یوسف کوڕی تاشفین و ئەبوو مەنصوری موەحیدی سزا و حەدی لەسەر دانراوە، چونکە لەسەردەمی سەلەف موسڵمانان زۆر بەکەمی تووشی ئەم جۆرە هاوبەشدانانە دەبوون لەگوتاری سیاسی ئیسلامیدا، تا ئەو کاتەی تەرجومەی فەلسەفەی یۆنانی و بیروبۆچونەکانی مەجوسی هاتە ناو موسڵمانان لەسەردەمی دوای هارونەڕەشید ـ ڕەحمەتی خوا لەهەموو ئەو پیاوچاکانە بێت ـ لەسەردەمی مەئمونەوە دەستیپێکرد، ئەمەش بەدرێژای مێژوو موسڵمانان باسیان لەم چەمکە هەڵانە کردووە بۆ ڕاستکردنەوەی تێگەیشتنەکان و پاراستنی شەریعەتی خوای گەورە، چونکە ئەگەر سەروەری تەوحید و بیروباوەڕ نەبێت، ئەم ئیسلامە هیچ بەندایەتی و کارێکی تێدا دروست نیە، هەروەك چۆن کەمرۆڤێك موسڵمان دەبێت سەرەتا پێی ناڵێیت نوێژ بکە، یان ڕۆژوو بگرە یان حەج بکە، بەڵکو دەڵێیت: شایەتومان بێنە، بەتوحید دێتە ناو ئیسلام، بەهیچ شێوەك لەئیسلامدا دروست نیە (نیو) بەندایەتی بۆخوا، دەبێت هەرچی کارە بۆ خوا بێت، چونکە لەبەندە وەرناگیرێت ئەگەر هەمووی بەشی خوا نەبێت، کەواتە سەروەریی ئەم چەمکەش هەر پارێزراو بووە بەدرێژایی مێژوو ئیسلامەکە

نوێگەریی دینی (المجدد) لەدوای موجەدیدەکانیتر پاراستویانە، لەسەروو هەمووشیانەوە خوای گەورە پارێزەری دینەکەی خۆیەتی.

سێیەم: ناوو سیفاتە پیرۆزەکانی خوای موتەعالە، دەبێت سەروەریی ناوو سیفەتەکانی خوا بپارێزرێت ئەگەر موسڵمان قەناعەت و بیروبڕوای وایە: خوا دەپەرستێت و خوا هەیە!.

کە پێشتر ئاماژەی بۆ کراوە لەباسی گوتاری دیندا بۆیە زۆر شیکاری ناکەین لەم باسەدا..

لەوانەیە هەندێك بەسەرسوڕمانەوە تەماشای ئەم خوێندنەوەی ئێمە بکات، کەنوسیومانە، ئاخر ناشێت خوای گەورە سیفاتی حاکم بێت، بڵێن ئاساییە ئێمەش هاوکاری دەبین لەحاکمیەتدا ، خوای موتەعال هاوکاری ناوێت، یان لەخوای گەورە کەم بکەینەوە بڵێن: ئەو نازانێت یاسا بۆ مرۆڤ دابنێت ئێمە خۆمان دایدەنێین، ئەمە کەی پاراستنی سەروەریی سیفات و ناوە پیرۆزەکانی خوایە، پێویستە ئەو سەروەریەش بپارێزێت [٤٣]

بەم سێ توحیدە حاکمیەتی خوای گەورە و شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەیمان - صلى الله عليه وسلم- بۆ دەستەبەر دەبێت.

هەرچەندە ئەم پۆلێنکردنە «ئیبن تەیمییە» کردویەتی پێشتر زانایانی بیروباوەڕ نەیانکردوە، هەمووی هەر بەتوحیدی خوا ناسراو بووە، بەلاّم شێخ الاسلام بۆ زووتێگەیشتن و ئاسانکاریی بۆ کۆمەڵە سەرلێشێواوەکان ئاسانیکردوە.

لێرەدا دەبێت بزانین سەروەریی شەریعەتی خوای گەورە چیە؟ کاری ئێمە بۆ سەروەریە؟ ئەم وشەیە لەناو خەڵکدا دووبارە دەبێتەوە خۆشیان تارادەیەك نازانن چی لەپشتیەوەیە بۆچی بەکاری دێننەوە، ئایا گوتاری سیاسی ئیسلامی چیە لەپشتی سەروەی شەریعەتەوە؟ دەمانەوێت لەم باسەدا ئەوە روون بکەینەوە.

---

[٤٣] شرح العقيدەی الطحاوی .. دکتۆر سفر الحوالي .. باب الحاكمية.. ص ٢٧٩

کەسەروەری واتای چیە لەئیسلامدا، لەیاسای فەرهەنگە و ڕۆژئاوا بەگشتی چۆن باسی لێوەکراوە تێگەیشتن لەچەمکی سەروەریی (سیادەت)؛

سەرومریی، یان وشەی (سیادەت) لەزمانی عەرەبیدا لەڕووی زمانەوانی و زاراوەوە لەسەیدەوە (السید) وەرگیراوە. واتە: خاوەنداریەتی بەندە، کەخاوەنی دەسەلاتی ڕەهایە و بڕیار لای خۆیەتی، لەزمانی کوردیدا زیاتر لەسەروەر و یاخود سالاری، یان سەرداریەوە کەخاوەنداره داتاشراوە، نوسەر پێی وایە ووشەی سالار شیاوترە، تا سەرومری، بەهەرحاڵ لەڕووی زمانەوانیەوە ئەوەندە گەورە نیە، بەڵام گرنگە لەخودی چەمکەکە تێبگەین، ئەم وشەیە دەگەڕێتەوە بۆ هەر سێ دەسەڵاتەکە کەئەو سێ دەسەڵاتە دەبێت سەروەر بێت لەناو حکومەت و دەوڵەتاندا، لەوانە دەسەڵاتی یاسادانان (التشریعة) و دەسەڵاتی دادوەری (القضائیة) و دەسەڵاتی جێبەجێکردن (التنفیذیة)، سەرەتایی ئەم بیرۆکەیە لەڕۆژئاوا لەقوتابخانەی یاسایی فەرەنسیەوە سەرچاوەی گرتووە لەسەر بنەمای گرێبەندی کۆمەڵایەتی لەدیدی ژان ژاك رۆسۆ»، سەروەری و (سیادەت) لای ڕۆسۆ واتای هێمایە بۆ ئیدارەی گشتی کەبەهێزترین دەسەڵاتە هیچ کەس لەم دەسەڵاتە بەرزترنییە، هێز و هەیمەنەتی خۆی بەسەر هەمووواندا دەسەپێنێت[٤٤].

---

[٤٤] (معنى سيادة في معجم المعاني الجامع - معجم عربي عربي،سيادة، ( اسم )
مصدر سادَ
سِيادَة : سُلْطة ، هيمنة وغلبة ، سيطرة ، حرِّيَة التَّصرُّف
سِيادَةُ البَلَدِ : رِفْعَتُها ، سُلْطتُها ، مَجْدُها
دَوْلَة ذات سيادة : دولة مستقلَة ،
سيادة القانون : احترامه وتطبيقه على الجميع
سِيادَة : لقب احترام وتشريف يُستعمل لبعض أصحاب المناصب العالية أو المقامات الرَّفيعة
سيادة مشتركة : ( الأحياء ) حالة يكون فيها كلا المُضادَّين في زوج من الجينات المتضادّة الصِّفات سائدَيْن)

«سەروەری گەل» لەفکری سیاسی هاوچەرخدا بەواتای یاسای سیستەمی دیموکراتی دێت. ئەم مۆدیلە لەڕووی زاراوەکەیەوە یاسای ئەقڵانیە کەناسراوە بە (یاساودانانی یاسا) بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵاتی گەل بەگشتی، واتە: دەسەڵات ئەداتە گەل بۆ یاسادانان لەڕێگای کۆمەڵێك نوخبەوە، واتە: هیچ یاسایەك دەرناچێت، مەگەر گەلەکە ڕەزامەند نەبێت لەسەری، ئەمەش واتای ئەوەیە، کە لە گەلەوە دەرچوو، دەبێت سەروەریی بپارێزرێت و هەموو لەبەردەمیدا ملکەچ بین، چونکە دەسەڵات و بەدەستهێنانی یاسا بەڕەهایی لای گەلە

ئیتر گەل حەڵاڵ، حەرام دەکات و حەرامیش، حەڵاڵ دەکات. دەبێت هەموو ڕازیبین و سەروەریەکەی بپارێزین، نابێت هیچ کەس لەم سەروەری و سالاریە لێیدەربچێت، بەمەش گەل خاوەنی دەسەڵاتی یاسادانانە، خۆی حاکمیەت دەبات بەرێوە خاوەنی سەروەری ڕەهایە، وێڕای ئەوەی کەگەل خۆی خاوەنی دەسەڵات نیە، بەڵام وا نیشاندراوە کەگەل بۆ خۆی خاوەنی دەسەڵاتە و خەڵك خۆی بڕیاری ڕەها ئەدات بۆ یاسا و ئەوەی کەحەزی پێدەکات، ئیسلام کەئاینی پەروەردگارە لەناو ئەم سیستەمەدا هیچ ئەرزشی نیە.

لێرەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە سەروەری گەل هەموو بەربەست و سنورەکانی شکاندوەو لەڕێگای هەڵبژاردنەوە خاوەنی دەسەڵات و سەروەری ڕەهایە و بەتەواوەتی یاسا بەدەست خۆیەتی، ئەمەش لەناخ و جەوهەردا لەدیدو تێڕوانیندا سەرچاوەکەی «فەلسەفەی دیموکراتیە»، ئیتر ئەوەی کەخاوەنی ئەم بیرو فەلسەفەیە بەتەواوەتی یاسا و حاکمیەتی خوای گەورە پەراوێز دەخات، یان بەهیچ شێوەیەك ناهێڵێت لەسیستەمەکەشدا هەبێت.

خەڵکێك وا پەی دەبەن کە هیچ کێشە نیە ناو بەکاربێتەوە لەڕووی حوکم کردنەوە.. بەتایبەت هەندێك لەئیسلامیەکان.. ئەم زاراوانە بەکاردێننەوە بەئارەزوی خۆیان ئەو هەستەیان نیە کەلەڕاستیدا جەنگی ئەمڕۆ جەنگی زاراوەیە، هەر زاراوەیەك پێناسەو مەدلولی خۆی هەیە و لەدونیای ئەمڕۆ لەڕووی فیکر و فەلسەفەی یاساوە بەمەحکەمترین شێوە بۆ بەربەستی ئاینی ئیسلام

داڕێژراوە، سەروەری گەل - هیچ کات ناگونجێت بەسەروەری گەلی ئیسلام پێوەری بکەین و بڵێین: ((ئاسایە لەناو ئیسلامیشدا هەمان بۆچوون هەیە کەگەل سەروەربێت. ئەم وشەیە ڕاستە وەك بەکارهێنانی وشەسازی بوونی هەیە، بەڵام لەپێناسەدا ئاسمان و ڕێسمان جیاوازی نێوانی هەردووکیانە، کەئیسلام و دیموکراتیە دوو سیستەمی جیاوازن، لەڕووی ڕێکخستن و مامەڵەکردنی یاسایی لەگەڵ دیموکراسیدا دەسەلاتی گەل هیچ ئەرزش بۆ خوا دانانێت. لەئیسلامیشدا نوقسانی باوەڕە، تەوحید سەرچاوەی باوەڕە لێرەوە پێکداکێشانەکە دەستپێدەکات. ئەگەر یەك هەڵە لەناو ئەم بازنە گشتیەی تەوحیدی ئیسلامیدا هەبێت. ئەگەر زەڕەیەك بێت و چەندە هەڵەکە بچووك بێت. لەئیسلامدا هەموو داواکاریەکانی ئیسلام تێکدەدات و لەبەندەکەی وەرناگیرێت. وەك ئەوە وایە کە شیر تێکەڵاوی خوێن بکرێت، یان هەر شتێکیتری تێکەڵاو بێت ئەوە لەئەسڵی خۆی دەردەچێت. تام و بۆنی دەگۆڕێت. ئەگەرچی شلەمەنیش بێت. کەواتە گوتاری سیاسی ئیسلامی بۆ خەڵکی بەگشتی سەرەتاکەی بەبەندایەتی و خواناسییە، نەك تەنها جەوهەری حوکمداری و فەرمانڕەوای بێت.

د.عەبدولڕەزاق سەنهوری، یەکێکە لەگەورە پیاوانی پارێزەری یاسای عەرەب دەڵێت: ((یاسای ئیسلامی خۆی فەرز دەکات بەسەر هەموو سەروەریەکانی تردا، چونکە بەربەستی ناگیریت و هیچ کەس ناتوانیت بیوەستێنێت لەمرۆڤدا، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار ئەو یاسایەی ناردووە و هەموو مرۆڤەکان پێویستیان پێیەتی، وتەو فەرموودەی خوایە و بۆ پێغەمبەرێکی معصوم نێراوە (-صلى الله عليه وسلم-)، هەر دەبێت مرۆڤ دەستە نەخوارببێت)).[٤٥]

لە وڵاتی هۆڵەندا و فەرەنسا و نەرویج هەرسێکیان سوودیان لەیاسای میراتی ئیسلام وەرگرتووە. یاسا ناسەکانیشیان دەڵێن: ((باشترین یاسایە کەدانرابێت بۆ

---

[٤٥] کتێبی (فقه الخلافة وتطورها.. لاپەڕە ٧٠)..

ناو خێزانەکان، چونکە زۆر دەگمەنە خێزانێك لەخێزانێکی تر بچێ، بەهۆکاری پێکهاتەی خێزانەکان لەدونیادا))[٤٦].

**سەروەری شەریعەت و دەسەڵات لەبنەڕەتدا بۆ ئیسلامە:**

سەرەتایەك و تێڕامانێك لەقورئان لەمەڕ سەروەری شەریعەت.. گوتاری سیاسی دەسەڵاتی ئیسلامی خوای گەورە دەفەرمویت: (وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَلا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَنْ يَفْتِنُوكَ عَنْ بَعْضِ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَاعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ أَنْ يُصِيبَهُمْ بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ وَإِنَّ كَثِيراً مِنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ) ٤٩ المائدة واتە: کاتێ کەهەندێك لەزاناکانی جوو، هاتن بۆلات تا دادوەریی بکەی لەنێوانیاندا، دادوەری بکە بەو بەرنامەیەی کە لەلایەن خواوە بۆت ڕەوانەکراوە، شوێنی ئارەزووەکانی ئەوان مەکەوە، وریایانبە نەوەکو ڕێت لێ هەڵە بکەن لە هەندێك لەو ڕێنموونییانەی کەخوا بۆی ناردووی جا ئەگەر ئەو جولەکانە ڕازیی نەبوون و پشتیان تێهەڵکرد، ئەوە دیارە خوا دەیەوێت گیرۆدەی سەرئەنجامی هەندێك لەگوناهەکانی خۆیانیان بکات، بێگومان زۆربەی خەڵکی یاخیی و سەرکەش و تاوانبارن.

ئەگەر تەماشای ئەم ئایەتە بکەین و پێوەری بکەین بۆ سەروەری شەریعەت دەبینین خوای گەورە دەفەرمویت (وَلا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ) بەهیچ شێوەیەك دوای ئارەزووەکانی ئەوان مەکەوە، پاشان دەفەرمویت: (احْذَرْهُمْ أَنْ يَفْتِنُوكَ عَنْ بَعْضِ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ) ئاگاداربە دەبێت بەو بەرنامەیە کار بکرێت، کەخوای گەورە ناردویەتی بەهیچ شێوەیەك لێی لانادرێت، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەشەریعەت و یاساکانیتر بێجگە لەئیسلام هیچ بایەخێکی نیە، بۆ سەروەری

[٤٦] ڕاستە هەمموو یاساکە پیادە ناکرێت وەك یاسای ئیسلامی بەڵام چەمك و تێگەیشتن لەیاساکەو ڕوحەکەی وەرگیراوە پیادەی دەکەن ئەو وڵاتانەی کەئاماژە پێداوە الاسلام والغرب د. جمال النابلسي.. ل ٣٣٠

دەسەڵاتی ئیسلام لەناو گەل و هۆزی موسڵماناندا، هەر بەرنامەیەکیتر جێگای بگرێتەوە بێ هیچ شك و گومانێك کوفرە.

ئەوەی کەپێچەوانەیە لەبنەڕەتی ئیسلامدا ئەوەیە کەخەڵکی بەئارەزو و ویستی خۆیان شەریعەت و داوا بکەن، پێویستە خەڵکی بزانێت شەریعەت واتە: یاسا..

حاکمیەتی شەریعەت و ڕازیبوون پێی لەئیسلامدا هیچ سازشێکی لەسەر ناکرێت، کارپێکردنی واجبە و پێویستە لەڕووی سروشت و مرۆییەوە داواکراوە، لەوە گەورەتر وەك خۆراك و خواردنەوە و هەوا وایە بۆ مرۆڤ، کەپێداویستی ڕۆژانەیە و مرۆڤ بەبێ ئەوانە ناتوانێت بژی.

لەڕاستیدا ئیسلام واتە: پەیوەستبوون و پابەندبوون، تەسلیم بوونە بەهەموو ئەو هەواڵ و فەرمانانەی، کەخوای گەورە دایناوە، شکاندنی بڕیارەکان تاوانە سزای لەسەر وەردەگیرێت، بڕوا نەبوون پێی کوفرە پێی لەچوارچێوەی ئیسلام دەچێتە دەرەوە، ئەگەر بۆ یاساو فەرمانی خوای گەورە مەرج دابنێرێت ئەمە لەپەیوەست بوون و تەسلیم بوون دەچێتە دەرەوەی فەرمانی خوای گەورە.

ئیمامی غەزالی - ڕەحمەتی خوای لێبێت - لەکتێبی موستەصفادا دەفەرموێت: ((بەدەستکەوتنی فەرمانداری و حاکمیەت نفوز بۆ هیچ کەس نیە تەنها خوای خاوەن دەسەڵات و بەدیهێنەر و فەرماندار نەبێت، خۆی خاوەنی موڵکی خۆیەتی دەتوانێت هەر ئەو دەسەڵاتی بەسەر موڵکی خۆیدا هەبێت، هیچ دەسەڵاتێك نیە بێجگە دەسەڵاتی خۆی، پاشان پێغەمبەر (-صلی الله علیه وسلم-) و سوڵتان و باوك دایك و هاوسەرەکان هەموویان پێویستە گەردن کەچ بن بۆ فەرمانی خوای گەورە و فەرمانەکانی ئەو جێبەجێ بکەن))[٤٧]

لێرەدا جەنابی غەزالی باسی پێویست و پێویست نەبوون و حەڵاڵ وحەرام ناکات، بەڵکو بەڕاشکاوانە باسی نفوزی خوای گەورە دەکات ئەو وشەیە بەهەموو شتەکانەوە دەلکێنیت لەحاکمیەتدا واتە: «نفوذ الحکم» لەگەڵ پیادەکردن

---

[٤٧] موستەصفادا پەراوێز...بەرگی سێیەم ل ٤٥

(تطبیق) فەرمانبەرداری «تحکیم» دەکات لەشەریعەتدا، ئەمەش لەلای هەموو زانایان و کۆمەڵ و گوربەکانی ناو موسڵمانان و ئیسلام ڕای جیاوازی لەسەر نیە و هەموو کۆکن لەسەر حاکمیەتی خوای گەورە.

جەنابی ئیبن تەیمیە ـ ڕەحمەتی خوای لێبێت ـ لەکۆمەڵی فەتوادا بەرگی ٣ لاپەڕە ٢٦٧ دەفەرموێت: هەرکاتێك مرۆڤ حەڵاڵی حەرام کرد، وە حەرامی حەڵاڵ کرد، یان شەریعەتی خوای گۆڕیەوە بەشەریعەتێکی دیکە، دەڵێت: ((ئەوە کافرە مورتەدە واتە: پاشگەز بۆتەوە لەئیسلام بەکۆڕای زانایان، ئەمەش دەکەوێتە ئەو بوارەی کەحوکمی خوای گەورە قبوڵ ناکات، خوای گەورە دەفەرموێت: (ومن لم یحکم بما أنزل الله فأولئك هم الکافرون..) زۆرێکیتر لەم دەقانە کە شیخ الاسلام ئاماژەی بۆ کردوە)).

هەموو زانایان کۆکن لەسەرئەوەی کەدەسەڵات و فەرمانڕەوای تەنها بۆ خوای گەورەیەو ناگۆڕێت، هەموو پەرتووکەکانی عەقیدە باسیان لەحاکمیەتی خوای گەورە کردوە لەئیسلامدا، هیچ تەئویل و تەفسیرێك هەڵناگرێت، تەنها هەندێك نەبێت دەڵێن: ((کافر نابێت بەڕەهایی و گوایە کفری دون کفرە))، واتە: لەناو بازنەی ئیسلامدا دەمێنیتەوە! ئەمەش زیاتر سەلەفیەکان کەناسراون بەمەدخلی وادەڵێن: وتەکەیان لەئیبنو عەباسەوە وەریانگرتوە، لەهەندیك جێگایتردا قوتابیەکەی ئیبنوعباس ئاماژەی پێداوە نەك خودی ئیبنو عەباس، کەناوی طاوسە.

بەنیسبەت شوراوە، کەمرۆڤەکان توانای قسەیان هەیە تێدا لەبیروباوەڕە کۆنکرێتیەکاندا نایگرێتەوە، بەڵکو لەوەدایە کەبۆ مرۆڤ بەجێهێڵراوە بۆ بیرکردنە و ڕاوێژکردنی خۆیان ئەمەش ناوەڕۆك و جەوهەری بەندایەتیە، کەخوای گەورە ئاماژەی بۆ کردوە لەقورئاندا: (وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْراً أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ) ٣٦ الأحزاب

واتە: بۆ هیچ پیاوێکی ئیماندار یان ژنێکی ئیماندار نیە، کاتێك کەخواو پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێك بدەن ئەوان سەرپشك بن لەئەنجامدانی ئەو کارە،

چونکە ئەوەی سەرپێچی بکات لەفەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ئەوە ئیتر بە ئاشکرا گومرا و سەرلێشێواوە.[48]

**بۆچی گوتاری سیاسی ئیسلامی وەك خەیاڵی لێهاتوە لەدنیایی ئەمرۆدا؟**

ماوەی ١٠٠ساڵ زیاترە لەرۆشنبیر و زانا و بانگخواز و تەنانەت کادیرە حیزبیە ئیسلامیەکانیش زۆر بەدەگمەن باس لەفکری سیاسی ئیسلامی دەکەن.
لە ناو خەڵکی موسڵماندا وایلێهاتوە کەزۆر نامۆ و نائاشنایە بەگوێی خەڵکی ئەوەندەی کەدەنگ بەدیموکراسی و سیستەمی رۆژئاوایی بەرزکراوەتەوە. ئەوەندە باسی فکری سیاسی ئیسلامی نەکراوە..
کەواتە ئەوەی باسدەکرێت بۆ ئەم رەوەندە لەگوتاری سیاسی و فکری سیاسی زۆر نوێیە بەلایانەوە تەنانەت نامۆشە..
ئیبن خەلدون دەڵێت: ((لەسەرەتای هەموو شکستێکدا خەڵکانێك دوچاردەبن بۆ ئەوەی شوێنکەوتووی بەرامبەرەکەیان بن، دەبنە دواکەوتووی ئەو دیدو بۆچوونانەی کەدوژمنەکەی دەیسەپێنێت بەسەریدا)[49]
لەکاتێکدا ئەگەر سیستەم و دەسەڵاتەکەی خۆی زۆر لەو باشتر بێت، لەواقیعدا راستە، نموونەی جەلالەدینی کوڕی خەواریزم شا، کەتەتار هاتە ناو وڵاتی موسڵمانان ئەویش سیستەمە ئیسلامیەکەی جێهێشت سەرسام بوو بەسەرکەوتنی تەتار ومەغۆل ئەوان چیانکرد ئەمیش دەیکردەوە لەتالانی و برۆیی و وێرانکردنی شارو گەلان، تا لەکۆتایدا بەدەستی جوتیارێکی کورد بەبێڵەکەی دەستی ملی پەڕاند.

---

[48] شرح العقیدة الطحاویة التوحیدالألوهیة، الشیخ الدکتور سفر بن عبدالرحمن الحوالي ـ وەرگێرانی، باوکی محمد ل٢٠١

[49] (لباب المحصل في أصول الدین ص٧٠)

ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگر هەیە، ئەویش ئەوەیە بەشێکی زۆر لەموسڵمانان و ئیسلامیەکان، خۆیان تێنەگیشتوون لەفکری سیاسی ئیسلامی بۆیە هیچ زانیاریەکییان نیە لەمبارەیەوە هەمیشە دەنگیان بەدیموکراسی ڕۆژئاوا بەرزە، داوایان لێبکە زۆر نائاشنان بەسیستەمی ئیسلامی، تەنانەت هەندێکیان ئەوەندە چاو قایمن دەڵێن: ((ئیسلام باسی فکری سیاسی نەکردوە!)).

لێرەدا دەچینە ناو گوتارە سیاسیە ئیسلامیەکە، هەموو تیۆرێك کە لەمێشکدا گەڵاڵە دەبێت، پاشان لەسەرکاغەز دەنوسرێت، پاشان خەڵکی بۆ پەروەردە دەکرێت، تا پیادە ببێت..

بۆیە من پێم وایە سەرەتا لەئیسلامدا فکری سیاسی تەنها تیۆر نیە، واتە: بەمانای ئەوەی زادەی فکری مرۆڤ بێت، مرۆڤ دەستی هەبێت تێیدا، بەتەنها نا، بەڵکو بەشی سەرەکی لەلایەن خوای موتەعالەوە سەرچاوە دەگرێت، کەحاکمیەتە و حەتمییە، بەشێکی تریشی سیاسەتە، کە لەفیقهەوە سەرچاوە دەگرێت کەئیجتیهادی مرۆڤەکانە، کێشەکە لەوەدایە تا ئێستاش جیاوازی لەنێوانی حاکمیەت و سیاسەت نەکراوە لەناو هەندێك لەڕۆشنبیران و لێکۆڵەرموانی ئیسلام و غەیری ئەوانیش..

ئێمە لێرەدا وەك کارێکی ئەکادیمی لەم ماستەرنامەیەمدا بیرو بۆچوونی خۆمان پێشکەش دەکەین و بەشێوەی بەراورد، بێ ئەوەی ڕەخنە لەبەرامبەر بگرین، هیچ پەیوەندیمان نیە بەسەر فیکرە سیاسیەکانی بەرامبەر هەر لەلیبراڵی و شیوعیەکان و هتد، بەڵکو ئەگەر نموونەش بهێنمەوە بۆ تێگەیشتنە لەفکری سیاسی ئیسلامی بە بەراورد.

ڕۆژئاوا خاوەنی فکری سیاسی خۆیەتی و بەرهەمی هێناوە لەئەنجامی ساڵانێك و چەند سەدەیەك، نوسەر بۆ خۆی خاوەنی فکری سیاسی خۆیەتی وەك موسڵمان، ئەو ئەگەر سێ پایەی گرنگی هەیە بۆ ئەم سیستەمە بینای ژیار و شارستانیەت و دەوڵەتی خۆی کردوە، کەبریتیە: لەعەلمانیەت، دیموکراسی، مەدەنیەت.

- عەلمانیەت واتە: ئەقڵانیەت سەنتەری سەرەکییە
- دیموکراسی: گەل: خاوەن بڕیارمو بەڕژدارێکی کارای دەسەڵاتە..

ـ مەدەنیەت، ماف و ئەرك ئینتیمایە.

بەبێ ئەم سێ پایەیە سیستەمی فکری سیاسی ڕۆژئاوا هیچ بوونی نیە، ماناشی نیە، بەبێ هیچیان تەواو نابێت، وەك خۆیان دەڵێن: ((ناتەواو و ناتەندروستە)).

ئیسلام خاوەنی سێ چەمکی گرنگی دامەزرێنەری فکری سیاسییە، ئەویش دەتوانین ناوی بنێین هەرەمێکی سێ کوچکەیی کەبیناکراوە لەلوتکەوە بۆ دامێن بریتین لە: خوا و مرۆڤ، مرۆڤ و مرۆڤ، مرۆڤ و مادە (ژینگە)..

لەناو هەناوی ئەم سێ کوچکەیەدا یاخود سێ گۆشەیەدا لەشێوەی دیوار تایبەتمەندیەکانی خشت لەسەر خشت دانراوە..[٥٠] کەبریتین لە:

- سیستەمی باوەڕ
- سیستەمی بەندایەتی
- سیستەمی پەیوەندیەکانی دوروبەر
- سیستەمی کۆمەڵایەتی لەکلتور دابوونەریت
- سیستەمی ئابووری و مامەڵە کردن
- سیستەمی دەستوری ودادگەریو ئیداری
- سیستەمی دەولی

## هاوڵاتیبوون لەگوتاری سیاسیی ئیسلامدا:

بەو کەسانە دەگوترێت، کە لەناو ئوممەتی ئیسلامیدا نیشتەجێن، جا جولەکەن، یان گاورن، یاخود زەردەشتین... هتد یاخود بەتێگەیشتنی نوێ و دەوڵەتی نەتەوەیی: واتە لەسەر خاکێك ژیان دەبەنە سەر دەشێت جۆری دین و ڕەگەز و

---

[٥٠] مصنفة النظمە الاسلامیة.. د. مصطفی کمال وصفی لاپەڕە٧٥

زمانیان جیاواز بێت، نیشتیمانێك كۆیان بكاتەوە هەموو لەئەرك و مافدا وەك یەك تەماشا بكرێن و مافی كەس پێشل نەكرێت.

ئەگەر زیاتر شیكاری بەم باسە بدەین دەبێت ڕەهەندەكانی هاوڵاتیبوون لەئیسلامدا ڕوونتر نیشان بدەین، لەكاتێكدا كەباس لەئیسلام دەكەین بنەڕەت و سەرچاوەمان قورئان و سوننەتە، كەهەردووكیان لەڕووی مەیدانیەوە لەژیانی پێغەمبەردا بەرجەستە دەبێت - صلى الله عليه وسلم- كەواتە سەرەتا لەپەیامبەرەكەمانەوە دەستپێدەكەین، پاشان دەچینە ناو مێژووی موسڵمانان بەگشتی، ئێستا پرسیار ئەوەیە ئایا دەشێت و گونجاوە لەسیستەمی ئیسلامیدا جگە لەموسڵمان كەسیتر جێگای ببێتەوە؟ وەك هاووڵاتی موسڵمان تەماشا بكرێت، یاخود جیاوازی لەنێواندا نەبێت؟

لەڕاستیدا بیری عەلمانی و تەنانەت هەندێك لەموسڵمانی ڕووگە ڕۆژئاوا لەم بازنەیەدا دەخولێنەوە، موسڵمانەكە گێژبووە ئەوەندە خولاوەتەوە و نازانێت چی بكات و چی بڵێت؟! عەلمانیەكەش وەك تەزبێحی دەستی هەڵیدەسوڕێنێت بۆ خۆبادانی عەلمانیەتی وەڵامێكی گونجاو لەڕاگەیاندنەكانەوە نەدراوەتەوە سەبارەت بەم باسە، یاخود هیچ نوسینێكی ئەكادیمی لەو بوارە نەنوسراوە، ئەگەر نوسرابێتیش ئێمە پەیمان پێنەبردوە..

كەواتە وەڵامی پرسیارەكە دەستەبەر دەكەین..

ئەم سەردەمەی ئێستامان لەكام سەردەمی مێژوویی دەچێت تا بتوانین لەقۆناغەكانی ئیسلام و موسڵماناندا بیگونجێنین و گوتاری سیاسی ئیسلامی لەسەر دابمەزرێنین؟

سەردەمی ئێستا ژیانی موسڵمانان و بەتایبەتیش كوردستان لەسەردەمی سەرەتای دوو ساڵی مەدینە دەچێت، كەپێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم- چووە ناو دەسەڵاتەوە، دەسەڵاتەكەی دیاریكراوبوو، چونكە تەنها خۆی نەبوو لەو مەملەكەت و وڵاتەدا، بەڵكو چەند كۆمەڵ و گروپێكی تێدا بوو، هەموو وەك یەك سەیردەكران و لەسەر بنەمای هاونیشتیمانی مامەڵەیان لەگەڵ یەكتردەكرد، دەستور نوسرایەوە..

بەم پێیە، سیستەمی ئیسلامی بنەڕەتی دەگەڕێتەوە بۆ نوسینەوەی دەستور کۆکردنەوەی هەموو حیزب و لایەنەکان تر چەتری هاوولاتیبووندا نەك ئیسلامدا، چونکە ئیسلام تەنها بۆ موسڵمانانە، هەروەك پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم- کردی، ئەم گروپانەی لەژێر چەتری هاوولاتیبوونی مەدینە کۆکردوە، (هەموو سیرەکان واتە: ژیاننامەی پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم- ئەو دەستورەی تێدایە وەك سەرچاوە ئاماژەی پێدەکەم هەندێکی وەك خۆی دەنوسمەوە کە لەکتێبی ڕێزمویك بۆ خۆناسین وەرمگرتوە..

یەکەم کاری پێغەمبەری ئازیز -صلی الله علیه وسلم- دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی بوو، هەڵبەتە لە بەشەکانی پێشوودا ئاماژەمان پێکردوە و ڕوونمانکردۆتەوە کە بۆ دامەزراندنی دەوڵەت پێویستت بەسیاسەتە، یەکێك لە کارەمەزنەکانی پێغەمبەر -صلی الله علیه وسلم- لەدوای دروستکردنی مزگەوت دانانی یاسایەك بوو بۆ ڕێکخستنی ئەو کۆمەڵگە نوێو موسڵمانەی کەخۆی بوونیادی نابوو، نەهێشتنی خراپە و ستەمکاری و دەستدرێژی لەنێوانیاندا، ئەو یاسایەش بەگوێرەی فەرمانی خوا دانرا، بوو بە بناغەی پەیوەندی نێوان موسڵمانان و جولەکە و بت پەرستانی مەدینە، تا هەموویان لەچوارچێوەی یاسادا کۆبکاتەوە و لەسەری بڕۆن و دورنەکەونەوە ئەمەش سەرەتای یەکەم سیاسەتی پێغەمبەری ئازیز - صلی اللەعلیەوسلم- بوو کە لە هەموو مرۆڤایەتیدا توانایە کی سیاسی وا بەدینەکراوە.

پێغەمبەر- صلی الله علیه وسلم- کەدەسەڵاتی کەوتەدەست یەکەم هەنگاوی سیاسی ئەوەبوو بەخێرایی ڕێگایەکی وای دانا، کە کەس نەتوانێت بەگوێرەی هەوا و هەوەس دەوڵەت بەڕێگاوە بەرێت، موسڵمانانی کردەیەك کۆمەڵ تا هەموو پێویستیەکانی ژیانیانی لەدەستبێت و کردار و کردەوەی ناو گەل ڕێکبخەن و بەڕێوەی بەرن.

هەر گەلێك لەناو خۆی کاروباری بەچاکی و بەگوێرەی یاسای خوا بەڕێوە نەبرد کارەکەیان دەشلەژێت و بێگانە دەسەڵاتی بەسەردا دەشکێن و پرژو بڵاویان دەکاتەوە.

یاسای دەستوری ئیسلام هەر لەیەکەم ڕۆژەوە کەدامەزرا جیاوازی نەکرد لەنێوان پیاو و ژن و خاوەن دەسەڵات و بێدەسەڵات و دەوڵەمەند و هەژارو بێ ئاین و موسڵمان و جولەکە.

مافی جولەکەکانیشی بەتەواوی دیاریکرد لەژێر سێبەری ئیسلام بوونەوە یەك، ناوی ڕۆم و عەجەم و حەبەش ونبوون و نەمان بەهەموویان دەگوت گەلی و ئوممەتی ئیسلام.

جارێکیان کۆمەڵێك لە موسڵمانان کۆبوونەوە لەمەدینە، ویستان سەلمانی فارسی بەسوکی ناو بێنن، هەریەکەیان خۆی و باب و باپیرانی هەڵدایەوە شانازیان بە نەسەبی خۆیانەوە دەکرد، تاهاتنە لای سەلمانی فارسی لێیان پرسی تۆ کوڕی کێیت؟ ئەویش گوتی: من کوڕی ئیسلامم، بەو ڕستەیە هەموویان شەرمەزار و بێدەنگ بوون[٥١]

کاتێك کەئیمامی عومەر ئەو قسەیەی سەلمانی بیست دەستیکرد بەگریان ئینجا هاواریکرد سەلمان ڕاستی گوت منیش کوڕی ئیسلامم ئەم وتەیە بووە یاسایەك و دانیشتوانی مەدینە لەبەڵای هۆزایەتی ڕزگار بوون.

ئەو دەستورەی کەدامەزرا بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵگەی مەدینە کەموسڵمان و جولەکە و بت پەرست لە سایەیدا حەسانەوە مەگەر ئەوانەی کە لەدەستور لایاندابێت خۆیان توشی نەهامەتی و سەرگەردانی بوون ئەمەش هەندێك لە خاڵەگرنگەکانی دەستورەکەیە.

**دەستووری مەدینە:**

یەکەم: موسڵمانانی قوڕەیش و مەدینە لەمەودوا بەیەك گەل دەژمێرێن و دەبێ بەرگری لەیەك بکەن و پشتیوانی یەکتر بن.

---

[٥١] السیره وبناء الامم . د.راغب السرجانی العهد المدینه..ص ٤٦٠

دووەم: موسڵمانان یەك گەلن جیاوازی هۆز و تیرە نەما هەموویان بەیەکەوە بەستراون و پارێزگاری لەیەکتر دەکەن و دەبێ دیلەکان بکڕنەوە و لە چاکە و دادپەروەریدا هەموو وەك یەك بەشدار دەبن.

سێیەم: پێویستە لەسەر موسڵمانان پیاوی قەرزار و زۆر خێزان و دەستکورت و هەژار لەبیرنەکەن دەبێت بەهەموو لایەکیان یارمەتیان بدەن.

چوارەم: ئەگەر یەکێك ویستی ستەم و خراپە و دەستدرێژی بکات لەناو موسڵمانان دەبێ بەهەموویان لێی ڕاست ببنەوە، جا کوڕی هەر کەسێك بێت و سەر بەهەر عەشیرەتێك بێت.

پێنجەم: موسڵمانێك لەتۆڵەی کافرێك نابێت موسڵمانێك بکوژێت، نابێت یارمەتی کافریش بدات لەدژی موسڵمان، چونکە بەخیانەتی گەورە دادەنرێت.

شەشەم: ئاشتی موسڵمانان یەك ئاشتیە هەموو پێکەوە یەکسانن وە دەبێت بە یەکسانیش لەڕێی خوادا کۆشش و خەبات بکەن، نابێت کۆمەڵێك خەریکی خەبات بێت و کۆمەڵێکیتر وازبێنێت.

حەوتەم: تەنها خوا پەنامانە موسڵمانان لەپەنای خودا دان، موسڵمانان برا و پشتیوانی یەکترن.

هەشتەم: هەر موسڵمانێك دانی بەم دەستورە دانا، نابێت یارمەتی تاوانباران بدات و بیحەوێنێتەوە، ئەگەر لەدەستور لایدا ئەوە خوای گەورە ڕەحمی پێناکا و لێی توڕەیە لەقیامەتیشدا لێخۆشبوونی ئەستەمە.

نۆیەم: جولەکە و موسڵمانان ئەگەر لەگەڵ دوژمن کەوتنە شەڕ بەماڵ و سامان یارمەتی یەکتر دەدەن.

دەیەم: لەنێوان موسڵمانان و جولەکە ئامۆژگاری و ڕێگا دانان و چاکە هەیە نابێت خراپە لە نێوانیاندا هەبێت.

یازدەیەم: نابێت کەس ستەم لەهاوپەیمانی بکات ستەم لێکراو هەرکەس بێت، دەبێت سەر بخرێت، ئەوانەشی کە لەگەڵ موسڵماناندا دەژین نابێت زیان و تاوانیان هەبێت.

دوازدەیەم: خوا لەگەڵ چاکەو باشەی ئەو دەستورەدایە، هەرکەسێك چاکە بکات و خۆی لەخراپە بپارێزێت، خوا میهرەبانی خۆی بەسەردا دەرێژێت.

سیازدەیەم: هەرکەسێك هێرشی هێنا بۆ سەر مەدینە دەبێت موسڵمان و جولەکە بەیەکەوە بیپارێزن.

چواردەیەم: جولەکەی بەرەی عەوف لەگەڵ موسڵمان یەك گەلن.

پازدەیەم: جولەکە لەسەر ئاینی خۆیان و موسڵمانیش لەسەر ئاینی خۆیانن.

شازدەیەم: جولەکەی بەرەی ساعیدەو بەرەی جوشەم و بەرەی ئەوس وەك جولەکەی بەرەی عەوف تەماشا دەکرێن.

حەڤدەیەم: هەرکەسێك لە جولەکە و موسڵمان لە مەدینە دەرچو بۆ بازرگانی بۆ هەرکارێك یا مایەوە، با لەخۆی دڵنیا بێت و کەس دەستدرێژی ناکاتە سەر مەگەر ستەم بکات ئەو کات چاوەڕێی سزابکات.[٥٢]

ئەو یاسایە هەموو لایەکی گرتەوە، چ لایەنی بەرگری بێت، چ لایەنی ئابووری بێت، چ لایانی کۆمەڵایەتی، لەهەمان کاتدا لایەنی سیاسی بە جوانترین شێوە دە ردەخات.

ئەگەر سەرنجێك بدەین، بەوردی تێڕابمێنین، یان لەبنەمایەکی هزریەوە سەیری دەستورەکە بکەین دەبینین چەندە دادپەروەری لەم یاسا و دەستورەدا بەدی دە کرێت، کەتەواوی دەوڵەتی ئیسلامی پێدامەزراوە ئەگەر ئاینی ئیسلام سیاسەت نەبێت، ئەم دەستورە بۆ لە سەرەتای کۆچی پێغەمبەری ئازیز - صلی اللەعلیە وسلم-!

**هاوڵاتیەکانی شاری مەدینە بریتی بوون لە:**

یەکەم: موسڵمانانی کۆچکردوو واتە لەمەککەوە بۆ مەدینە (موهاجیرەکان).
دووەم: موسڵمانانی پشتیوان لەدوو هۆزی شاری مەدینە ئەوس و خەزرەج (ئەنصارەکان).
سێیەم: هاوبەشدانەرەکانی مەدینە (موشرکەکان) لەئەوس و خەزرەج.
چوارەم: جولەکەکانی شاری مەدینە لەهۆزەکانی (قینوقاع، نەزیر، قوریزە).
پێنجەم: عەرەبە بێباوەڕەکانی چواردەوری مەدینە (ئەعرابەکان).

---

[٥٢] ژیان و ڕەوشتی پێغەمبەر عبدولعزیز عەلائەدین موستەفا ل ١٦٩

ئەگەر تەماشای ئەم گروپ و هۆزانە بکەیت وەك ئایدۆلۆژیا و بیروباوەڕی جیاواز، ئیسلام هات دانی نا بەبوونی هەموویاندا، وەك هاووڵاتی مامەڵەی لەگەڵدا کردن، ئەگەرچی موسڵمانیش نەبوون.

کەواتە بەم پێوەرەی ئاماژەمان پێکرد لەدەستوری شاری مەدینە: لەم سەردەمەدا سیستەمی ئیسلامی دەبێت دان بنێت بەهەموو حیزبە عەلمانیەکان و بەدەسەڵات و کیانیان و تەنانەت بێباوەڕەکانیش، چونکە ئیسلام لەڕووی فکریەوە کێشەو دوژمانیەتی نیە لەگەڵیان، بەڵکو بانگەوازی خۆی دەکات، ئەوەی وەریگرت سەربەستە پێچەوانەکەشی هەر ئازادن، چونکە دین بەزۆر بەسەر کەسی دیکەدا نادرێت.

لێرەدا لەوانەیە هەندێك بۆ خۆبادان ئەو پرسیارە بکەن بڵێن خۆ جولەکەکان و موشریکەکان دەربەدەرو بەزۆر موسڵمان کران، لەوەڵامدا دەڵێین: جولەکە لەسەر بیروباوەڕی هەرگیز لەئیسلامدا وەدەرنەنراوە نە لەمێژووی ئیسلامی یاخود مێژووی نەیارەکانی ئیسلامیش ناتوانن ئەم قسەیە بکەن، بەڵکو لەسەر خیانەت و موئامەرە و لەناوبردنی موسڵمانان جەنگیان لەگەڵداکراوە لەمێژوویشدا دیارە.

موشریکەکانیش لەدوای جەنگی بەدر خۆیان مونافیقیان هەڵبژارد و بە مونافیقی ماونەتەوە، تەنانەت جولەکەو مەسیحیەکانیش خوای گەورە لەقورئاندا مافی هەموویانی دەستنیشان کردوە، زاناو ئەحبارەکانیشیان بەرێزەوە هەر بەزانا و ئەحبار ناوبراون لەقورئاندا، لەئیسلامدا کوفر کردنیش لەلایەن ئەو کۆمەڵانەوە ڕێگە پێدراوبوو مافی خۆیان بووە کوفر بکەن لەچوارچێوەی ئاینەکەی خۆیاندا، واتە نەك فکریان ئازاد بووە، بەڵکو کوفر کردنیش ئازاد بووە، بۆ نموونە جولەکە کان پێیان وابووە عوزێر کوڕی خوایە، ئیسلام ڕاست نیە، پاشان محەمەدیان بەپێغەمبەر نەزانیوە، لەگەڵ زۆرێکی تر لەنەیاریان بۆ ئیسلام کەچی ئیسلام ڕێگەی تەواوەتی دا و هیچ کێشەیەکی نەبووە لەسەر بیروباوەڕیان..

بەم پا و پێوەندە عەلمانی و بێباوەڕ لەئێستادا لەدەستوری ئیسلامیدا لەسەر هاوڵاتیبوون مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، ئازادە لەچوارچیوەی فکری خۆیدا چی

باسدەکات و دەیڵێت، ئیسلام ڕێگرنابێت لەتەرحی بەرامبەر لەفکری نەیارانی، بەڵام سوکایەتی و خیانەت جێگای قبوڵ نیە.

بەکورتی وەڵامی ئەو پرسیارەی خەڵکی و دیموکراتخوازەکان ئەدەینەوە، کەدەڵێن؛ بۆچی موسڵمانان وەك ئێمەو مانان لەئەوروپادا لەسایەی سیستەمی دیموکراسیدا دەژین و قسە دەکەن ئەی بۆ ناچن بۆ سعودیە یان بۆ وڵاتیکی تری ئیسلامی؟

لە وەڵامدا دەڵێین؛ کێشەی خەڵکی سادە و ئەوانەی، کەدیموکراتخوازن زۆر سادە بیردەکەنەوە پێیانوایە ئەوەی دیموکراتی نەبوو ئیتر دیکتاتۆرە، ئەمە لەناخی هەموو دیموکراتخوازێکدا دروستبوە، لەڕاستیشدا ئەوەی کەدیموکراتخوازە هێتلەر و مۆسلۆنی و ستالینی ناگاتێ، ئەوەندە دیکتاتۆرە!

چۆن؟ دیموکراتخوازەکان بەزۆر دیموکراتی خۆیان دەسەپێنن، بەسەر ئەوانیشدا، کەبڕوایان پێیی نیە، پاشان بڕوا نەبوون بەشتێك وەك مەبدەء و مامەڵەکردن لەتەکیدا جیاوازە، ئێمەی موسڵمان بەدەیان هاوڕێ و دۆستی عەلمانی و بێ باوەڕمان هەیە مامەڵەش لەگەڵیاندا دەکەین و ڕێزیان دەگرین، لەکاتێکدا کە ئێمە دیموکراتی نیمن و بڕوامان پێی نیە و بەسیستەمێکی مشەخۆری دەزانین، بەڵام مامەڵەی لەگەڵ دەکەین، ئەمە ئەوپەڕی سنگ فراوانی و بیرفراوانی ئێمەومانان نیشان ئەدات، دیکتاتۆرە دیموکراسیەکان ئەوانەن، کەدەڵێن؛ مادام باوەڕتان بە دیموکراسی نیە بڕۆنە دەرەوە مافی ژیانت نیە لاماندا، نوسەر پێیی وایە؛ "من موسڵمانم ئیعتراف بەهەمووتان دەکەم ئەوە ئێوەن ناوێرن ئیعتراف بەمنی موسڵمان بکەن، من بەئیرهاب نیشان ئەدەن و خۆشتان پیاوچاك بەڕاستی پێوانەکی زۆر هەڵەیە"..

بەشێکیتری وەڵامەکە ئەوەیە، خەڵکی موسڵمان لەئەوروپادا لەسایەی دیموکراسیدا نەحەساوەتەوە، بەڵکو لەسایەی سەرمایەداریدا ئارامیەکیان هەڵمژییوە کەئەگەر سوودمان لەڕووی مادییەوە لەسیستەمە سەرمایەداریەکە وەرگرتبێت، لەدە لایەنیترەوە زەرەمەند بووین.

بۆ؟ یەك میحوەر باس دەکەین بۆ ئەوەی زۆر دەرنەچین لەباسەکە، خێزان پایەیەکی گرنگی هەموو کۆمەڵگەکانە، بەڵام هەندێك لەبەر چاوچنۆکی سەرمایەداری دەیەوێت خێزان هەڵبوەشێنێتەوە، چونکە لەخزمەتی پرۆژەی سەرمایەداریدا نیە، سەرمایەداریی نە خێزانی دەوێت، نە کۆمەڵگە بەڵکو دەسەلاتیش مۆنۆپۆڵ دەکات، تا بتوانێت هەرچی وزەیەك هەیە بەکاریبهێنێت بۆ بەرژەوەندیەکانی خۆی، تا دەسکەوتی زیاتری هەبێت، مرۆڤەکان دابماڵێت لەهەرچی سۆز و هەست و نەست هەیە بۆ کالاکانی خۆی..

ئەم پرۆژەیە زۆر دەمێکە کار لەسەر ئەوە دەکات، کەخێزان پارچەپارچە بکات و لەبەریەك هەڵیبوەشێنێتەوە، چونکە پرۆسەی دروستکردنی خێزان سوود بەسەرمایەی سەرمایەداری ناگەیەنێت، هەرچەندە نامانەوێت ئەم باسە لەدیدێکی فکریەوە ڕوماڵ بکەین، بەڵکو دەمانەوێت لەڕووی کۆمەلایەتیەوە ئەو ترسە بخەینە بەردەم کۆمەڵگەی کوردی کە ئەم سیستەمە هەوڵ بۆ نەهێشتنی خێزان دەدات.

ئەزمونی ڕۆژئاوا لەبەرچاودایە بۆ لێکترازانی خێزان و لەناو ئەو شارستانیەتەدا ئەوەی ئەرزشی نەبێت خێزانە، بەهۆی کۆمپانیا زەبەلاحەکان سیستەمی سەرمایەداری بەتەواوەتی خەڵکی رۆژئاوا لێکترازاون و کۆمەڵگەیەکی ساردو سڕیان پێکهێناوە، کەزۆرجار لەولاتێکی وەك نەرویج، کەزۆر خوشك و برای دایك و باوکی جیاواز یەکتر ناناسن لەپڕدا لەدیسکۆیەك بەیەك دەگەن و هەرچی حەزی خۆیانە لەگەڵ یەکتردا بەتاڵی دەکەنەوە، لەولاتی فینلەندا بەهۆکاری سەرقاڵی دایك و باوك بەکاری ڕۆژانەوە خوشك و برایەك بەدرێژای ڕۆژ کەدایك و باوکیان لەئیش بوون لەگەڵ یەکدا ڕایانبواردوە تا خوشکەکە سکی لەبراکەی پڕ بووە ئینجا هەستیان پێکراوە، یاخود لەنەمسا پیاوێك لەگەڵ کچەکەی خۆیدا ڕایبواردوە بۆ ماوەی ١٨ ساڵیش لەژێرزەمینەکەی ماڵی خۆیاندا زیندانیکردوە زیاد لە ٨ منداڵی لێبوو زۆرێك لەمنداڵەکانی هەر لەو ژێر زەمینەدا بەهۆکاری ئەوەی کەنەخۆش دەکەوتن بۆ ئەوەی ئاشکرا نەبێت نەیدەبردنە نەخۆشخانە هەر لەوێ مردن، زۆری تر لەم ڕوداوانە لەئەورپادا دەبینرێت، بێجگە لەو هەموو

نەخۆشیە شازانەی کەتوشی مرۆڤەکان دەبێتەوە لەڕووی جنس و کاری بەدو خراپەوە[٥٣]

ئینجا لەم وڵاتانەدا ئەوەی پێبڵێن ڕێگادان بەبیری ئیسلامی و دامەزراندنی دامەزراوەی ئیسلامی هیچ بوونی نیە، ئازادیەکەیان زۆر سنوردارە، ئیتر دیموکراسی مانای چیە؟

هەر ئەوەندە زانیان موسڵمانیت و چالاکیت زۆرە هەموو هەفتەیەك موخابەراتیان بانگت دەکات و تەحقیقت لەگەڵ دەکات، خۆمان لێرە دەژین و دەزانین ئەوروپا چیە، دەنگی دەهۆڵ لەدور خۆشە ئەوەی ئازادیە لەدیموکراسی ئەماندا ڕابواردن و خواردنەوەیە..

لە وڵاتی نەرویجدا لەبڕگەی دوو لەیاسای دەستوریەکانیدا دەڵێت، ((نابێت هیچ شتێك دژی ئاینی مەسیحی ئەو وڵاتە بێت))، یان لەبەریتانیا.... هتد.

دیموکراسی لەئەمریکادا لەوپەڕی بێمانایدایە، لەنێوانی دوو حیزبدا وڵات و دەسەڵات دابەشکراوە، هەروەك یەکێتی و پارتی لای خۆمان بۆ ڕەخنە لەیەکێتی و پارتی دەگرن لەنێوانی کۆماری و دیموکراتخوازەکاندا حیزبی سێیەم شك دەبن؟ ئەوان زۆر گرنگی ئەدەن بەئاینەکەیان ئەو سەرۆکەی دێتە سەر حوکم دیندار نەبێت هەڵنابژێردرێت..!

بەهەرحاڵ، لەم بەراوردەدا ئەوە دەرکەوت، کەموسڵمان لەسایەی سیستەمی دیموکراسیدا نەحەساوەتەوە، بەڵکو ئەوەی حەساندویەتەوە بازو کاری خۆیەتی، یاخود تەنها ژیانە بێ بوونی کەرامەتی موسڵمانبوون.

زۆر گرنگە ئەوانەی وەك موسڵمانێکی ڕادیکاڵانە بیر دەکەنەوە، دوو شت لەیەك جیابکەنەوە تەبەنیکردنی دیموکراسی، واتە: خۆ بەخاوەن زانینی ئەو سیستەمە و مامەڵەکردن لەگەڵ دیموکراسیدا وەك هەر سیستەمێکی سیاسی تری جیاواز، مامەڵەکردن لەگەڵیدا مانای وانیە ناچاریە، بەڵکو ئەوانەی پیادەی ئەو فکرە سیاسیە دەکەن ئەوانیش مافی خۆیانە کەدان بنێت بەبوونیاندا، چونکە ئەم

[٥٣] ڕۆژنامەی ڤێگەی نەرویجی

سەردەمە و کاتەی ئێستا، باوی ئەوە نەماوە کەس پەراوێز بخرێت، وا هەست بکەیت خەڵکی دەسرێتەوە.. باوی ئەوە نەماوە دەبێت مامەڵە لەگەڵ دیندار و بێدین و جولەکە و مەسیحی و زەردەشتی و یەزیدی... هتد. هەموویدا بکرێت ـ وەك ئەوەی کەهەیە، ئەم بیرۆکە نوسەر- یان هیچ بیرمەندێك داینەمەزراندوە، بەڵکو خوای گەورە مافی هەموویانی دیاریکردوە لەقورئاندا هەر لەنەسرانی و جولەکەو مەجوسی و موشریك و صابئی... هتد قورئانە فێرمان دەکات، کەدەبێت بوونیان بپارێزین و پێکەوە ژیان دروستبکەین.

کەواتە ئیسلام دان بەبوونی هەموو ئاین و ئایدۆلۆژیاکاندا دەنێت، جا خۆشی لەوەدایە هیچ کام لەمانە دان بەبوونی ئیسلام دانانێن! ئەمەش ئەوپەڕی هێز و توانای ئیسلام لەڕووی فکری و سیاسی و ئازادی و مافەکانەوە نیشان ئەدات، ئیسلام پێناسەی هەموو بیر و ئاینەکان لەخۆیانەوە دەکات و ڕمواییان لەسەر بنەمای پێناسەی خۆیان ئەداتێ، بەڵام بەپێچەوانەوە، هەموو ئایدۆلۆژیاو ئاینەکانی دیکە ئەوەندە دیکتاتۆرن ئەوان دەیانەوێت پێناسە بۆ ئیسلام بکەن.!

لێرەدا دەبێت سێ چەمك و تێگەیشتنی گرنگ جیابکرێتەوە، چونکە بنەمای فکری سیاسی ئیسلامی لەسەر دادەمەزرێت..

یەکەم: دەسەڵات

دووەم: دەوڵەت

سێیەم: حکومەت

پێناسە بۆ هەر سێکیان لەڕووی بنەمای سیاسی ئیسلامیەوە.

دەسەڵات: بەگشتی زۆرینەی خەڵکیە لەسەر خاکێك کەدەسەڵاتەکە دروستدەکەن خاوەنی وەحدەتی ئاینی، یاخود فکرین، بۆ نموونە ئیسلام و ئوممەتەکەی ئەگەر خاوەنی دەسەڵاتبن ئەوا موسڵمانان لە ٩٥٪ لەپێکهاتەی خاکی موسڵمانانن و

دەبنە خاوەن دەسەڵاتی ڕەها، بەڕەچاوکردنی مافی کەمە ئاینییەکان و بیروباوەڕەکانی دیکە..

دەوڵەت: هەرچەندە دەوڵەت و حکومەت بەیەك مانا دێت لای هەندێك لەخەڵکی، بەڵام نوسەر پێیوایە: لەئێستادا پایەی دەوڵەت لەسەر بنەمای دەستور دادەمەزێت، کەحکومەتیش دەبێتە ئالیەتی بەڕێوەبردنی ئیداری خەڵك و وڵات. بۆ زیاتر ڕونکردنەوەی ئەم چەمکە، نموونەی دەوڵەتی تورکیا پایەی دەستوری بەگشتی لەسەر بنەمای عەلمانیەتە، بەڵام حکومەتەکەی حکومەتێکی ئیسلامیە...

حکومەت: ئالیەتی بەڕێوەبردنی وڵاتە بۆ خزمەتکردنی خەڵك و ئیدارەی و پرۆژەی خزمەتگوزارییە و پاراستنی ئاسایشی ناوەوە و دەرەوەی ئەو وڵاتەیە..
دەشێت ئەم پێناسانە کامڵ نەبن، بەڵام ئێمە لێرەدا نەهاتوین پێناسەیان بکەمین لەڕووی زمانەوانی و زاراوەوە، بەڵکو دەمانەوێت بڵێین: موسڵمانان بۆ گەیشتن بەدەسەڵات لەم ڕێگایانەوە ئیسلام حاکم دەکەن و سیستەمی سیاسی ئیسلامی دادەمەزرێنن. ئیسلام بڕوای بەئینقلاب نیە، واتە هەڵگەڕانەوە لەسیستمێکی سیاسی ئیسلامیدا، نابینیت و نموونە نیە لەفکری سیاسی ئیسلامیدا، بەڵکو بڕاوی بەشۆڕشی جەماوەرییە، یان بەدەستاو دەستکردنی دەسەڵات هەیە.

شۆڕش: واتە بەنەهێشتنی سیستەمێك لەبنەڕەتەوە هەڵکێشی و نەیهێڵیت، وەك: نموونەی ئەفغانستان و داگیرکردنی ڕوسیای شیوعی وەك شۆڕشی ئەهلی سوننەت، یاخود ئێرانی محەمەد ڕەزا شا و خومەینی و کۆماری ئیسلامی شیعەنشینی وەك شۆڕشی ئەهلی شیعە..

یان وەك دەستاو دەستکردنی دەسەلاَت، لەڕێگای هەڵبژاردن و سوندوقەکانەوە، وەك نموونەی تورکیای ئۆردوغان، مالیزیایی ماهاتیر محەمەد، ئیخوان لەمیسر، بەلاَم دواتر عەلمانیەت ئینقلابی کرد و پێی قبوڵ نەکرا..

لێرەوە ئەوە ڕونبویەوە، کەمامەڵەی ئیسلام لەسەر دەوڵەتداری و فەرمانڕەوایدا لەسەربنەمای ئەقڵ و ژیری سیاسیەکانی دادەمەزرێت، بەلاَم نەك بەمانای ئەوەی فکری سیاسی دیکە هەڵبگێڕێتەوە بەئەدەبیاتی ئیسلامی کار نەکەیت وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد، کەسیستەمی سیاسی ئیسلامی لەسەر دامەزراوە و پایەکانیمان لەبەشی یەکەمدا خستەڕوو، لەداهاتووشدا بەدورو درێژی باسیدەکەین، تەنانەت پێغەمبەری خوا -صلی الله علیه وسلم-، پایە دەوڵەتیەکەی هیچ پەیوەندی بەوەحیەوە نەبووە، بەڵکو لەسەر بنەمای ماددی ئیسلامی[٥٤] دروستیکردوە..

دێینەوە سەر ئەو شیکارییەی کەئیسلام و سیستەمە سیاسیەکەی ئەگەر لەسەر بنەمای واقیع و ڕەوشی ئەو دەمەی موسڵمانان کاردەکات و چی لەبەرژەوەندی ئیسلام و موسڵمانانە بەو شێوە هەنگاو دەنێت..

ئەگەر (ئۆپۆزسیۆن) بوو هاوشێوەی پێغەمبەر موسا ـ سەلامی خوای لێبێت ـ بەرامبەر بەفیرعەونەکان دەوەستێتەوە لەناو دەسەلاَتە فیرعەونیەکە و نەیار دەبێت، یاخود چاودێر دەبێت بۆ پاراستنی مافی خەڵکی..

ئەگەر پێویستیکرد دەسەلاَتی ئیئتیلافی دروستدەکات لەڕووی ئیداری و سیاسیی لەناو حکومەتێك و دەسەلاَتێکی تری سیاسیدا بۆ ناساندنی سیستەمە سیاسیەکەی خۆی و بیری حاکمیەت بەخەڵکی وەك پێغەمبەر یوسف ـ سەلامی خوای لێبێت ـ دەناسێنێت.

---

[٥٤] ماددی ئیسلامی: واتە، فاکتەر و تواناکانی ئیسلامی بەزاراوە و ئەدەبیاتی ئیسلام.

ئەگەر توانای چوونە ناو دەسەلاتی نەبوو، لەڕووی جەماوەری و مادییەوە هێزی کەمبوو ئەوا تەنها خەریکی بانگەواز و ئیسلاح دەبێت وەك پێغەمبەر نوح ـ سەلامی خوای لێبێت ـ
ئەگەر هەموو موسڵمان بوون و پێکهاتەی ئوممەتەکەیان پێکهێناو لە خاکی موسڵمانان زۆرینە بوون، دەتوانن دەوڵەتی ڕەهایی ئیسلامی دروستبکەن و ئیمپراتۆر و خیلافەتی ئیسلامی دابمەزرێنن، وەك هەردوو پێغەمبەری کوڕو باوك داود و سولەیمان ـ سەلامی خوایان لێبێت ـ یان هەروەك سیستەمی ئیسلامی ١٣٠٠ساڵەی ڕابوردوو لەڕووی دەسەلاتی سیاسیەوە.

لێرەدا پێویستە وەلامی ئەو پرسیارە بدەینەوە، ئایا فکری سیاسی ئیسلامی دەشێت هەموو چوار ساڵ جارێك دەستاو دەستی دەسەلات بکات؟ وەك لەلای عەلمانیەت و دیموکراتیخوازەکان و ئایدۆلۆژیەکانیتر هەیە؟
وەك پێشتر لەم باسەدا ئاماژەی پێکرا، ئیسلام لەسەر بنەمای ئەقڵ سیستەمە سیاسیەکەی دادەمەزرێنیت و بێگومان بەپێوەری ئیسلامی، کاتێك کەئەبوبەکر و عومەرو عوسمان فەرمووی: لەسەر بنەمای ئیسلام و هەریەك لەخەلیفەی دوای خۆی و بڕیاری ئوممەت و هەنگاو هەڵدێنینەوە، بەلام تەنها عەلی نەبێت گوتی: من لەسەر بنەمای ئیسلام و ئوممەت هەنگاو هەڵدێنمەوە نە ئەبوبەکر نە عومەر نە عوسمان، واتە: پەیوەندی بەو گرێبەندەوە هەیە، کەحاکم لەگەڵ ئوممەت و خەڵکەدا دەیبەستێت، جا چوار ساڵە یاخود پێنج ساڵ یان حەوت ساڵە، یاخود تا مردنی خەلیفەیە ئەویش لەواقعی ئەو ڕەوشەدا دەردەکەوێت، کەموسڵمانان پیادەی بەرنامەی سیاسی خۆیان دەکەن لەو خاك و واقیعەدا گوتاری سیاسی ئیسلامیەکە دەستنیشانی دەکات لەسیستەمەکەدا..

دەسەلاتی ئاینی ئیسلام خودی ئاینەکەش بەزۆر بەسەر کەسدا نادرێت، چونکە موسڵمانان و ئەوانەی کەسیاسەت دەکەن لەوە تێگەیشتون کەسیستەمی ئیسلامی نیعمەتە، وەك هەموو نیعمەتەکانی دیکە کەخوای گەورە بەخشیویەتیە

مرۆڤایەتی، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ئەگەر سوپاسگوزاری نیعمەتەکانی خوای گەورە بوون ئەوا بۆتان زیاد دەکرێت، ئەگەر سوپاسگوزار نەبوون بۆ ئەو نیعمەتانە خوای گەورە دەوڵەمەندەو پێویستی بەهیچ کەس و دروستکراوێکی دیکە نیە، هەموو موحتاجی پەروەردگارین و زاتی پیرۆزی خاوەن سزایە لەڕۆژی گەڕانەوە بۆلای ..

(لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ) ٧ ابراهيم

واتە: لەیادتان بێت کە: پەروەردگارتان بڕیاری داوە، سوێند بەخوا ئەگەر سوپاسگوزارو شوکرانە بژێر بن، ڕزق و ڕۆزی و نازو نیعمەتتان بەسەردا دەڕێژێنم و زیادی دەکەم، بەڵام: ئەگەر ناشوکرو سوپاس ناپەزێر بن، بەڕاستی ئەو کاتە ئیتر تۆڵە و سزای من زۆر بە ئازار دەبێت.

لێرەدا ئەو پرسیارە دەستەو ئێخەمان دەبێتەوە پێمان دەڵێن: ئەی ئێوەی ئیسلامی چۆن دەتانەوێت فەرمانڕەوایی بکەن و دەسەڵات لەدەستی نەیاراکانتاندا وەردەگرنەوە بەشێوەیەکی ئاشتی؟

لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا دەگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەی پاك و بێگەردی ئیسلام بزانین پێغەمبەری ئیسلام - صلی الله علیه وسلم- چۆن ئەم دەسەڵاتەی گرتەدەست و حکومەتی دامەزراند..

لای هەمووان ئاشکرایە پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم- کەچووە شاری مەدینە بۆ ئەوە نەچووە کەببێتە حاکمدار، بەڵکو تەنها بۆ داڵەدەدان و پاراستنی بوو لەزوڵمی قورەیش، پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم- نەچووە شاری مەدینە، بەڵکو چەند کیلۆمەترێك دوور لەشاری مەدینە بنەو بارگەی خست و مزگەوتی تێدا دروستکردو لەوێدا نیشتەجێ بوو کەناوی "قوبا" یە، ئاشکرایە کەعەبدوڵڵای کوڕی سەلول کاندید بوو بۆ سەرۆکی مەدینە و خەڵکەکە ویستیان بیکەنە مەلیك و پادشای خۆیان!

لێرەوە وەڵامەکە سەرچاوە دەگرێت، ئەی چۆن پێغەمبەری خوایان هەڵبژارد بۆ سەرۆکی ئەو وڵاتە؟

لەماوەی شەش مانگی یەکەمدا پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم- چەند پرۆژەیەکی پێشکەش بەخەڵکی شاری مەدینە کرد، چاوبەستی لەخەڵکەکەی نەکرد بەدروشم و قسەی بێبنەما، یاخود بڵێت: تەنها من شەریعەتم پێیە، ڕاستە شەریعەت پێویستە وەك یاساو ڕێسا و ڕێکخستن بۆ کۆمەڵگە، بەڵام پێش هەموو شتێك خەڵکی کاری خزمەتگوزاری دەوێت، خەڵك کارەبایی دەوێت خەڵکی جادەو شەقامی قیری دەوێت، پرۆژەی خزمەتگوزاریی دەوێت، بۆیە پێغەمبەر خوا - صلی الله علیه وسلم- سەرەتا ئاوی دابینکرد بۆ شاری مەدینە و بۆ ئەوەی ئاوی ئەو وڵاتە دابین بێت و بازاڕی جیاکردەوە لەدەستی مشەخۆر و قۆرغچییەکانی جولەکە و ئابووری سەربەخۆی بۆ خەڵکەکە دروستکردو میلیشیاکانی ئەوس و خەزرەجی ئاشتکردنەوەو سوپایەکی یەکگرتووی لێدروستکردن، پاشان دەستووری نوسییەوەو هەموو وەك هاوڵاتی بێ جیاوازی لەو دەوڵەتەدا ژیان بەسەر بەرن بەجولەکە و دیندار و بێدین و موشریکەوە.. زۆرێکی دیکە لەپرۆژەی خزمەتگوزاری، کەلێرەدا دەرفەتی باسکردنی نیە و سەرنجتان ڕادەکێشین بۆ یەکەم ساڵی شاری مەدینە و پرۆژەکانی پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم- لەهەموو کتێبەکانی سیرەدا..[٥٥]

کەواتە: لەهەموو سەردم و کاتێکدا سیستەمی ئیسلامی بەخزمەتکردنی خەڵك دێتە سەر دەسەڵات، نموونەش زۆرە لەم سەردەمدا ئیسلامیەکانی تورکیا و مەغریب و تونس و ئوردون و کوێت و پاکستان.. هتد.. بەهۆکاری پرۆژەکانیان هاتنە ناو حکومەتەوە..

---

[٥٥] عندما عهد الرسول.د. راغب السرجاني ل ٤٢- ٤٣

## ئازادیە گشتیەکان لەناو دەسەڵاتی ئیسلامیدا:

ئازادیەکانی ناو دەسەڵاتی ئیسلام لەسەر بنەمای (لا ضرر ولا ضرار) دادەمەزرێت. واتە: یەکەم: زیان بەکەس مەگەیەنە. دووەم: زیان بەخۆت مەگەیەنە.

یاخود دەتوانین بڵێین: لەسەر حەڵاڵ و حەرام دامەزراوە.. ئەوی پاك بوو حەڵاڵە لەئیسلامدا ئەوەشی پیسە و زەرەر بەخەڵکی دەگەیەنێت حەرامە (....ويُحِلُّ لَهُمُ الطيِّبَاتِ ويُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ.....) ١٥٧ الاعراف

واتە: ..... هەرچیەك پاکو چاکە بۆیان حەڵاڵ دەکات و هەرچی پیس و ناپوختەلێیان حەرام دەکات.....

لە ئیسلام و سیستەمەکەیدا ئەوەی تاوانە، ئیسلام حەرامیکردوە بەهیچ شێوەیەك رێگەی پێنادرێت کرین و فرۆشتنی پێوە بکرێت، بۆ نموونە: گۆشتی بەراز و مەی و هەموو جۆرەکانی، بەڵام ئەحکامی قەدەغەکردنی مەی بەو راستەوخۆیە قەدەغە ناکرێت، چونکە خەڵکانێك هەیە ناتوانێت هەروا بەئاسانی وازی لێبێنێت، دەبێت دەسەڵاتی ئیسلامی بۆ ئەو کەسانەی کە مەیخۆری مودمینن، تا کاتی چارەسەریان لەدەرمانخانەو جێگای تایبەت مەیان بۆ دابین بکات یاخود بۆ ئەوانەی کەمادە هۆشبەرەکان بەکاردێنن بۆ ئەوەی تووشی تاوان نەبن، تاوان دروست نەبێت، جا هەموو دەرکردن و سەپاندنی ئەحکامێکی ئیسلامی یاخود یاساکانی ئیسلامی هەموو لەسەر چوار بنەما دادەمەزرێت یان قەدەغە دەکرێت.

یەکەم: عیللەت

دووەم: سەبەب ـ هۆکار

سێیەم: مەصڵەحەت ـ بەرژەوەندی

چوارەم: حیکمەت ـ رامیاری

عیللەت (العلە)، لەزمانی عەرەبیدا واتە ئەو شتەیە کەداوای گۆڕانێك دەکات یان گۆڕانێکی بەسەردا دێت، کە بە نەخۆشیش دەگوترێ، عیللەت لەبەرئەوەیە کە حاڵەتێکی نوێی هێناوە جیاوازە لەحاڵەتی پێشوو، واتە، لە لەشساغیەوە بۆ نەخۆشیی. عیللەتی عەقڵیش، بریتیە لەو شتەی کەبڕیارێك دەسەپێنێت وەك جوڵەی پەنجە بۆ موستیلەیەك !.

هۆکار ـ سبب، بریتیە لەو شتەی کەبتگەیەنێت بەشتێك. بۆ نموونە ڕۆژئاوابوون سەبەبە بۆ واجب بوونی نوێژی مەغریب، یان بینینی مانگ سەبەبە بۆ واجب بوونی ڕۆژووی رەمەزان، هەندێکیش دەڵێن، عیللەت و حیکمەت جیاوازییان نیە یەك مانا و ناوەڕۆکیان هەیە.

حیکمەت یەکێك لەماناکانی ڕەشۆی ئەسپە لەبەرئەوە پێی دەگیرێت و ڕێگەنادات تێپەر بکات لەسنوری خۆی.

لەزاراوەشدا، ناوە بۆ ئەو حوکمانەی کە هەرشتێك لەشوێنی خۆیدا دادەنێت، بەڵام دەستگرتن بەسەر حیکمەت کامەیەو کامە نیە تۆزێك سەلیقەی دەوێت. بۆیە هەندێك دەڵێن، ((حیکمەت ئەو مانایەکە وەسفێك دەکاتە عیللەت)) واتە، حاڵێك دەخاتە ڕیزی عیللەتەوە. چۆن؟ بۆ نمونە، عیللەتی حەرامبوونی عەرەق سەرخۆشکردنەکەیەتی بۆ مرۆڤ، بەڵام حیکمەتەکەی عەقڵ پارێزییەکەیەتی.

بەرژەوەندی ـ المصلحە، بریتیە لەو قازانج و کەڵك و سوودەی کەخاوەنی شەریعە ت ڕەچاویکردوە لەپارێزگاریکردن و هێنانەدی ئامانجە باڵاکانی شەریعەتدا واتە، ئایین پارێزەریی و گیان پارێزیی و سامان پارێزیی ئەقڵی و هتد.

ئەو جێگایەی؛ ئەو ئەحکامەنەی لێوە دەردەچێت یاخود لەسێ سەرچاوە دەردەچێت، بەهاوکاری سێ دەزگای گەورەی ئیسلامیە، کەخەڵکی تایبەتمەند لەبوارەکان یاساو ئەحکامەکاندا.. هتد تێیدا دەستنیشانی ئەحکامەکان دەکەن و ئیجتیهاد دەکەن، یان ئیسطینباط دەکەن، دەکرێت ئەمانەش لەجێگایەکدا کۆببێتەوە ناوی لێبنرێت مەجلیسی حەل و عەقد، یان هەر مەجلیسێکی دیکە،

بەڵام بەو مەرجەی زاراوەکەی یان ناوەکەی لەئیسلامەوە سەرچاوە بگرێت، نەك لەرۆژئاواو عەلمانیەتەوە، چونکە ئەوەمان ڕونکردەوە، کەفکری سیاسی ئیسلامی بەبیرو هزری موسڵمانان دادەمەزرێت لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سونەتدا، ئەویش برتیین لە:
یەکەم: فەقیهەکان، کەفیقهی ڕۆژانەی خەڵکی لەوانەوە سەرچاوە دەگرێت.
دووەم: قازیەکان، یاخود دادگا و حاکمەکان، چارەسەری کێشەی خەڵکی دەکرێت.
سێیەم: موفتیەکان، کەجێگای فتواداان و ئادابی فتوادانە لەوێوە سەرچاوە دەگرێت.
ئەم دەسەڵاتە تەشریعی و قەزاییە بەدەسەڵاتێکی تەنفیزی هاوپشت دەبێت و جێبەجێ دەکرێت، بەشورطە و ئاسایش و هەر ناوێکی دیکە، کەخەڵکی ناو سیستەمە سیاسیە ئیسلامیەکە دەستنیشانی دەکەن.
لێرەدا لەوانەیە خەڵکێك بپرسێت ئەی شورا کاری چیە؟ نوسەر پێیوایە: شورا وەك دەستنیشانکردنی بەرژەوەندیەکانی باڵای دەوڵەتەکەیەو بڕیاری یەکلاکەرەوە ئەدات لەسەر پرسە گرنگەکانی دەوڵەت و دەرەوەی وڵات و دەستنیشانکردنی ستراتیژیی و پەیوەندییەکانی ناوخۆ دەرەوە.

## بەکورتی شورا چییە؟

شورای ئەو زاراوە سیاسیە ئیسلامییە، کەسورەتێکی بەناوە نراوە، ئەگەر باس لەفەرمانڕەوای ئیسلامی بکرێت توخمێکی گرنگی ناو ئەو سیستەمە ئیسلامییە شورایە، کەوەك نوێژ و ڕۆژ و حەج و جیهاد و هەموو واجباتیتری ئیسلامی پێویستکراوە لەسەر موسڵمانان، لەنێوانی دوو هاوڕێیەوە دەستپێدەکات تا خێزان، گەورەتر بۆ کۆڵان و گەڕەك، پاشان گەورەتر بۆ شار و دواتر بۆ شارەوانی و دەسەڵات و حیزب و کۆمەڵ و گروپ و ڕەوتەکان، تا دەگاتە بەرزترین پلەی دەسەڵات و سەرۆکی وڵات، یاخود خەلیفەی موسڵمانان، کەدەبێت پابەند بێت بەئەنجامی شوراوە لەقورئانیشدا لەزۆر جێگادا باس لەشورا و گرنگی شورا کراوە

تەنانەت پێغەمبەری خوا پابەند بووە بەئەنجامی شوراوە ئەگەرچی بەدڵیشی نەبووبێت.!

لەبەرئەوەیە دەڵێین شورا توخمێکی گرنگی ناو سیستەمە ئیسلامیەکەیە لەسەر ئەو بنەمایەش دەڵێین: ((دەستنیشانی پرسە گرنگەکانی ناو دەوڵەت دەکات لەسەر ئەم چەند نموونەیە لەقورئان و سونەتدا..))

لە جەنگی ئوحوددا داوایکرد، کەنەڕۆنە دەرموەی شاری مەدینە، لەناو شاردا بەرگریی بکەن، بەڵام سەربازەکانی چواردەوری پێغەمبەرمان- صلی الله علیه وسلم- وەك مامی بەرێزیان "حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب" "محەمەدی کوڕی مەسلەمە" و زۆرێکیتریان لەئەنسار و موهاجیرین - ڕەزامەندی خوا لەهەموویان بێت - داوایانکرد بڕۆنە دەرموەی شاری مەدینە، چونکە سەروەرمان شورای بەخاوەن ئەزمونەکان و تایبەتمەندەکان کرد لەوبوارەدا، بۆیە دابەزیە سەر بۆچوونەکانیان فەرمانی پێنەکرابوو وەك وەحی، کەشوێن وەحی بکەوێت، پاشان پێغەمبەری خوا دابەزی بۆ ئەنجامی شورا، کەچوونە دەرموەی شاری مەدینە بوو، دوای ئەوەی کەشکست هات بەسەر موسڵماناندا پەرتەوازەیان هات بەسەردا بڵاوەیانکردو زۆربەیان ڕایانکرد لەموسڵمانان، بەڵام سەروەرمان نەیفەرموو کە بەقسەی منتان نەکردوە چوونەتە دەرموەی شاری مەدینە، بەڵکو لەسەر شاخی ڕوما بەقسەی خۆشەویستمانیان -صلی الله علیه وسلم- نەکرد سەرەتا سەرکەوتوو بوون کەسەنگەرەکەی خۆیان بەجێنەهێشت و کاتێك دابەزینە ناو جەنگەکە و پشتیان چۆڵ بوو، ئینجا شکستیان هێنا، کەواتە هۆکار شورا نەبوو، بەڵکو سەرپێچی بوو لەفەرمانی خوا و پێغەمبەر- صلی الله علیه وسلم-، بەڵگەیەکی بەهێزتر ئەوە بوو لەدوای کۆکردنەوەی هێزەکە دیسان خوای گەورە فەرمانی کردەوە بەپێغەمبەر-صلی الله علیه وسلم- فەرمووی: شورایان پێبکە (وشَاوِرهُمْ فِي الأمْر) ئەم ئایەتە لەئالی عیمران دابەزی، کەباس لەو ڕووداوەی ئوحود دەکات، پاشان ئەوەی کە سوپاکەی کۆکردوە ڕێکیخستن و سەرکەوتنی بەدەستهێنا و دوای سوپای قورەیش کەوتنەوە لە (ئەسەدولحمراء) و سێ شەوو سێ ڕۆژ لەوێ مانەومو بەسەرکەتووی گەڕانەوە ناوشاری مەدینە، هەموو ئەم

کارانە بەشورا بوو، پەیامی ئێمە لە سەرەتای ئەم باسەدا ئەوەیە کەشورا فەرزە، هۆکاری شکستیش نابێتە ئەوەی کەتاوان بخرێتە سەر شورا، وەك ئەوە وایە کەسێك لەکاتی جەنگدا نوێژ بکا و لەدواوە بپێکرێ و شەهید بێت، هەرگیز ناشێت بڵێن: نەدەبوو نوێژی بکردایە! شورا فەرزە لەسەر موسڵمانان، ئومەتی پێغەمبەریش - صلى الله عليه وسلم- لەسەر کاری خراپ شورا ناکات و کۆنابێتەوە.

سیمای دەوڵەت و دامەزراندنی حوکمڕانی ئیسلامی لەسەر چ بنەمایەك دادەمەزرێت: پێش ئەوەی بچینە ناو ناوەڕۆکی ئەم باسە ئەوەی کەزۆر گرنگە بیری خوێنەری بهێنینەوە ئەوەیە، لەبەشی ڕابردوودا ئاماژەمان بەشورای ئیسلامی دا، پێویستە ئەوە ڕوونبکەینەوە کەشورای ئیسلامی ناشوبهێنرێت بەپەرلەمان و سیستمی دیموکراسی عەلمانیەکان! ئەمە ئەوپەڕی چاوبەستکردنە لەموسڵمانان و تەنانەت هەڵخەڵەتاندنی عەلمانیەت خۆشیەتی، لەبەرئەوەی پەرلەمان جێگای یاسادانانی بیری مرۆڤەکانە بەگوێرەی سەردەم و ژیانی باوی خەڵکەکە، یاسا دادەڕێژن و ڕەچاوی هیچ بەهایەکی ئاینی و دابوونەریتێك و سیستەمێکی ئەخلاقی ناکات، وەك دەرکردنی یاسای پیاو لەپیاو مارەکردن، یاخود ژن لەژن مارەکردن، یاخود ئەو یاسایانەی کە لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا یەکانگیر نابێتەوە.

شورا لەئیسلامدا ئەو دەزگایەیە کەدەبێتە هۆکاری دروستکردنی بڕیار، نەك جێگایی دروستکردنی یاسا بێت، لەباسی ڕابردوودا ئاماژەمان بەوەدا لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامەوە بێ دەستێوەردانی حکومەت و جومگەکانی دەوڵەتی ئیسلامی یاسا ناسەپێنرێت بەسەر کۆمەڵگە سڤیلەکەدا، حکومەت تەنها ئەرکی دەسەڵاتی پیادەکردنە، بەڵکو لەڕێگای سێ دەزگاوە یاساکان دادەڕێژرێت کەپێکهاتەی موفتی و قازی و فەقیهەکانە، ئەم دەزگایە هیچ پەیوەندیی نیە بەجومگەی دەوڵەت و حکومەتی ئیسلامییەوە، بەڵکو حکومەتی ئیسلامی تەنها دوو جومگەی دەخاتە ناو خەڵکی و ئەویش نان و ئەمانە، وەك خوای گەورە ئاماژەی پێکردوە لەقورئاندا (الَّذِى أطعمهم من جوع وآمنهم من خوف) ٤ قريش..

کەواتە دەبێت، موسڵمان ئیتر لەوە تێبگات کەجیاوازی نێوانی شوراو پەرلەمان ئاسمان و ڕێسمانە، وەزیفە و کاری هەردووکیان زۆر جیاوازە و هەرگیز لەیەك ناچن.

**سیمای دەسەلات و حکومەتی ئیسلامی:**

سیمای دەوڵەتی ئیسلامی بەسێ قۆناغدا تێدەپەڕێت، یاخود لەنێوان قۆناغێکیاندا بۆ قۆناغێکیتر هەنگاو دەنێت، بەلآم سێ دانەیەو چوارەمی نیە..

**قۆناغەکان چین ؟**

قۆناغی یەکەم: موسڵمانان خاوەن کۆمەڵ و گروپن و هیچ دەسەلات و هێزێکیان نیە..
قۆناغی دووەم: خاوەن هێز و توانا و دەسەلاتن، بەلآم لەبەرامبەریاندا نەیار و حیزب و دەسەلآتی دیکەی عەلمانی و یان ئاینەکانیتر هەیە.
قۆناغی سێیەم: ئیسلام و موسڵمانان خاوەنی دەسەلآتی تەواوەتین.

لەسەرەتاوە ئاماژەمان بەوەکرد لەم سێ ڕەوش و قۆناغەدا کارکردنی ئیسلامی بۆ دەوڵەتداریی جیاوازە.

قۆناغی یەکەم: ئەم ئەرکە زۆر قورسە و دەبێت کۆمەڵگە ڕێکبخرێت لەسەر بنەمای سێکوچکەکە، واتە کارکردنی ئەو گروپ و هێزە بچووکە ئیسلامییە بۆ ئەم سێکوچکەیە کەبریتیە لە:

یەکەم: ڕێکخستنی نێوانی خوا و مرۆڤ.
دووەم: ڕێکخستنی نێوانی مرۆڤ و مرۆڤ.
سێیەم: ڕێکخستنی نێوانی مرۆڤ و ژینگە (مادده).

**شیکاریەکی کورت بۆ هەر سێ چەمکەکە:**

**یەکەم: ڕێکخستنی نێوانی خوا و مرۆڤ.**
لە ڕەوشی ئێستای جیهانی ئیسلامیدا خەڵکی بەسروشتی خۆی ئیسلامی خۆشدەوێت، بەڵام تێگەیشتن و چەمکەکانی لێشێوێنراوە، نەیارانی دەسەڵاتی ئیسلامی، جا ئەگەر عەلمانیە، یاخود هەر دیدو بۆچونێکی دیکە، ئەو هاتووە پێناسەی بۆ داتاشیوە، چەمکە کۆنکرێتیە ئیسلامیەکان ئەو پێناسەیان دەکات لەقورئاندا، بۆیە زیندووکردنەوە و تێگەیشتن لەبەها ڕوحی و تەفسیرە ڕاستیەکانی ئیسلام پێویستە ئەو کۆمەڵ و گروپە بیکەنەوە کەهەڵگری ئایدۆلۆژیا ئیسلامیەکەن، بۆئەوەی سەرلەنوێ خەڵکی لەسەر بنەمای یەکتاپەرستی (توحید) پەروەردە بکەنەوە.

**دووەم: ڕێکخستنی نێوانی مرۆڤ و مرۆڤ**
مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤی برایدا خاوەنی٧٠٪ خاڵی هاوبەشە بێئەوەی بیروباوەڕ بەیەکەوە بیانبەستێتەوە، لە٣٠٪ بیروباوەڕ بەیەکتریەوە دەیانبەستێتەوە، کەچی ئەو بەشەیتر فەرامۆش دەکات، کەزۆرینەیە، چونکە ئەو مرۆڤانەی کەدروستبوون هەموو نەوەی ئادەمن، ئەگەرچی خەڵکی هەر کون و کەلەبەرێکی ئەم ئەستێرەیە بن کەناوی زەوییە.
ئەم پێشەکیەمان بۆ ئەوەیە بەڕاشکاوانە بڵێین: مرۆڤ بەسروشتی خۆی ناتەواوە، واتە مێژووی مرۆڤ وا هاتووە، کەبوونەوەرێکی نارێکوپێکە پێداویستی زۆری ماوە بۆ ئەوەی دەستکەوتی خۆی دابین بکات، ئەمەش لەنیعمەتی خوای گەورە، کەمرۆڤی بەو شێوە مۆدیلە دروستکردوە، لەگەڵ ئەو هەموو پێداویستیانەیدا

کەنوقسانە، ڕێزی لەهەموو شتێك زیاترە و کردوێتیە جێنشینی خۆی و کەرامەتی پاراستومو ڕێزی لێناوە. خوای گەورە دەفەرموێت: (وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً) ٧٠ الاسراء

واتە: بەڕاستی ئێمە ڕێزمان لەنەوەی ئادەم گرتومو بەسەر وشکانی و دەریادا (بە جۆرەها هۆکاری گواستنەوە) هەڵمان گرتوون، لەڕزق و ڕۆزی چاك و جۆراوجۆر بەهرەوەرمان کردوون لەخۆراك و پۆشاك و ماڵ و ناوماڵ و ...هتد بەڕاستی ئێمە ڕێزی زۆری ئەوانمان داوە بەسەر زۆربەی ئەو بەدیهێنراوانەدا کە دروستمان کردوون لەهەموو ڕویەکەوە.

کەواتە لەڕووی ئەو ناتەواوییەوە وایکردوە خوای بەرز و پیرۆز، کەمرۆڤ پێویستی بەمرۆڤ بێت واتە: بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی بێت، پێداویستی یەکتر تەواو بکەن، ئەمەش خوای موتەعال لەقورئاندا بۆمان باس دەکات و دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ) ١٣ الحجرات

واتە: بەهۆکاری ئەوەیە کەمرۆڤ ناتەواوە خوای گەورە کردونیەتە هۆز و تیرە بۆئەوەی یەکتربناسن ناتەواوی یەکتر تەواو بکەن، پێداویستی یەکتر دابین بکەن، ئەم کارە لەسەر بنەمای تاك، پاشان کۆمەڵ ئینجا دەوڵەت، هەریەك لەمانیش بۆ تاکی بەرامبەرو کۆمەڵگەیەکیتر، گواستنەوەی کلتور و دەوڵەتانی دراوسێ پێداویستی یەکتر دابیندەکەن بەهۆکاری ئەو ناسین و تەعاروفەی، کەدەیکەن خوای گەورە لەسروشت و ناخی مرۆڤدا ڕواندویەتی، لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەورە مرۆڤی وا دروستکردوە کەپێویستە هیچ کات بیروبۆچوون بیرکردنەوەیان وەك یەك نەبێت، خوای پەروەردگارو باڵا دەست دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلاَ يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ﴾ ١١٨هود

واتە: ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە هەموو خەڵکی دەکرد بەیەك تاقم و کۆمەڵ، بەڵام بەردەوام ئەو خەڵکە جیاوازن لەنێوانی یەکتردا لەئایین و بەرنامەو بۆچووندا.

بەچەمکی ئیسلامی تێگەیشتنی ئیسلامیش برایەتی ئیمانی و دابونەریتی ئیسلامیە لەنێو خەڵکیدا بڵاودەکرێتەوە.

**سێیەم: مرۆڤ و ژینگە**

هەوڵدانی هێز و لایەنە ئیسلامیەکانە بۆ پێگەیاندی تاکی موسڵمان و وەگەڕخستنی پرۆژەی خزمەتگوزاریی لەڕووی پەروەدەکردن و بانگخواز و کادیری باش و چالاك بۆ سیستەمە ئیسلامیەکە لەڕووە مادییەکانە و گرنگیدان بەهۆشیاری سیاسی، تا ئەو کاتە خەڵکی لەبزاوت و بزاڤە ئیسلامیەکە تێدەگەن، ئەمە قۆناغی یەکەمە موسڵمان دەبێت حەتمیە و تێپەڕی بکات.

قۆناغی دووەم: چوونە ناو دەسەڵاتە بەپرۆژەی گرنگ و خزمەتگوزاری باش بۆ خەڵکی ناو دەوڵەتەکە و دروستکردنی متمانەی خەڵکیە، هەروەك چۆن لەبەشەکانی ڕابردوودا ئاماژەمان پێداوە، کەپێغەمبەری خوا - صلی الله علیەوسلم- ئەو کارەی ئەنجامداومو لەشاری مەدینەدا کاندیدی حکومەتەکەی لەدەستی عەبدوڵلای کوڕی سەلول وەرگرت و خۆی بووە حاکمی مەدینە، بەهۆکاری پرۆژەی چاکسازی و دەستورە گرنگەکەی کەدایناـ.

لێرەوە تا ئەوکاتەی کەدەسەڵات دەبێتە دەسەڵاتی ٩٥٪ ئیسلامی ئەوکات جیاوازتر هەنگاو دەنرێت وەك لەم دوو قۆناغەیتردا، کەباسمکرد.

مامەڵەکردن لەگەڵ سیستەمەکانی تردا جیاوازە وەك ئەوەی تەبەنی بکەیت!

تائێستا سیستەمەکە سیستەمی ئیسلامی نەبووە، بەڵکو سیستەمێکی عەلمانی یاخود هەر بیروباوەڕێکی دیکە ئیسلام بەو شێوە مامەڵەی لەتەکدا دەکات.

ئێستا ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە ئەی ئەگەر سیستەمی ئسیلامی هەبوو لە٩٥٪ یاخود زۆرینە سیستەمی ئیسلامی ویست ئەوکات چۆن ئیسلام و سیستەمەکەی مامەڵە دەکات؟

لێرەدا بەچوار خاڵ وەلامەکە ئەدەینەوە لەپاشاندا شیکاری بۆ دەکەین، کەپێی دەوترێت سیمای دەوڵەت و سیستەمی ئیسلامی..

یەکەم: خواناسی

دووەم: دادگەری

سێیەم: زانست

چوارەم: ڕەوشت

بۆ تێگەیشتن لەناوەڕۆکی باسەکە..

هەموو دەسەڵات و سیستەمێك خاوەنی سیمای تایبەتی خۆیەتی، هیچی لەویتر ناچێت، ئەشێت لێکچوون هەبێت، بەڵام ئەستەمە بنەما و سیما و کارەکانی وەك یەك بن، چونکە ئەگەر وابێت ئەوە فۆتۆکۆپی تەواوە پێویست ناکات بەسیستەمی ترەوە باسی بکەین.

نموونە: سیستەمی دیموکراسی: خاوەن ئەدەبیاتی تایبەت بەخۆیەتی و گەل سەروەرەو هیچ دەسەڵاتێك و بڕیارێك لەسەرو گەلەوە نییە.

دیکتاتۆری: تەنها یەك کەس یاخود بنەماڵەیەك خاوەن بڕیارە، کەسیتر هیچ ئەرزشی نییە.

سیستەمی ئۆلۆگراشی: سیستەمی خواپێداو بەگزادەو سەرمایەداری قەبەیە و ورگ زلەکانە..

سیستەمی مۆبۆکراتی: خاوەن دەسەڵاتی سەرسەری و مافیا و خوێنڕێژ و سۆپرمانەکانە..

سیستەمی ویلایەتی فەقیهی خومەینی: ئیمام خاوەنی دەسەڵاتی ڕەهایەو لەجیاتی خوا لەسەر زەوی حکوم دەکات

سیستەمی ئەکلیریۆس و ثیوقراتیەکان: جۆرە سیستەمێکە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا حوکمی کردوە، بەردەوام لەهەندێك جێگادا بوونی ماوە وەك فاتیکان و زۆریتر لەو سیستەمانەی، کەوجودیان هەیە هەریەك لەمانە خاوەن

تایبەتمەندی خۆیانن، ئەمانەی کەباسمان کرد هیچیان سیستەمی سیاسی ئیسلامی نین.
کە دەڵێن سیستەمی سیاسی ئیسلامی جیاوازترە لەم ئەدەبیاتانە تر کە بوونیان هەیە و سەرچاوەکەی رۆژئاوایە .
پێکهاتەی سەرەکی ئەدەبیاتی سیستەمی سیاسی ئیسلامی بۆ بەندایەتیە، بیرو باوەڕ بەسەر هیچ کەسدا ناسەپێنرێت، بەڵام ئەگەر زۆرینە موسڵمان بوو حوکمی شەریعەتی قبوڵ بوو ئەوا سیستەمی ئیسلامی بەسەر کەمە ئاینزا و نەتەوەکانیتردا دەسەپێنرێت بێئەوەی مافی ئەوان پێشێل بکرێت.
نموونە زۆرە لەمێژووی ئیسلامدا ئەو جێگایانەی کەجولەکە و مەسیحی تێدایە بەهیچ شێوەیەك یاسای ئیسلامی بەسەردا ناسەپێنرێت و قازی ئیسلام حوکمیان ناکات، وەك کاروباری کەسایەتی لەڕووی یاسەکانی مەراسیم و هاوسەرگیریی و بەندایەتی و بۆنە تایبەتەکانی خۆیان ئازادن، بەڵام یاسا گشتیەکان بۆ موسڵمان و کافر وەك یەکە، واتە: ئەوەی دزیکرد دەستی دەبڕدرێت چ موسڵمان بێت، یاخود جولەکە و نەسرانی بێت ، واتە: بۆ هەمووان دەبێت یەکسان بێت هەموو مافێکیان لەدەسەڵاتی ئیسلامیدا وەك موسڵمان وایە، چونکە پێکهاتەی وڵاتەکەن، هەندێك پێیانوایە کەدەبێت جزییە یاخود جیبایەیان لێبسەنرێت، وەك ئاماژەمان پێدا ئەگەر پێکهاتەی دەوڵەتەکە بوون وەك موسڵمان هاووڵاتین و هەر فەرمانێکیش دەدرێت بەسەریاندا لەرێگای بەتریاك و پاپا و قەشە و حاخامەکانیان دەبێت، چونکە بۆئەوەی کاریگەری لەسەر نفوزیان نەبێت و رێزی ئەوەیان لێبگرێت، کەئەوانیش ئەهلی کیتابن ئەگەرچی دەستکاری ئاینەکەشیان کراوە.

تێبینی: کەدەڵێین جولەکەو مەسیحی، واتە: ئاینەکانی تریش بەهەمان شێوە دەگرێتەوە، بەڵام پێوەری دەکەین لەسەر ئەو دوو ئاینە.

ئیسلام خەڵکەکەی وا پەروەردە دەکات لەو سیستەمەدا، دەبێت بزانن کەبۆ بەندایەتی دروستبوون، مرۆڤی موسڵمان هەموو کارێکی بەندایەتیە جیاوازی و ئیمتیازی ئیسلام لەسیستەمەکەیدا لێرەوە دەردەکەوێت.

یاساکانی ئیسلامی هەموو لەسەربنەمای ئیمان دامەزراوە، بۆ نموونە ئەو کەسەی کەخێزانەکەی تەڵاق ئەدات، دوای ئەوەی کەئارام دەبێتەوە دەتوانێت هیچ نەڵێت و بەژنەکەی بڵێ ئافرەت بابچینەوە لای یەکتر و ماڵمان وێران نەبێت، بەڵام چونکە یاساکە بنەمایەکی ئیمانی هەیە، چەندین مەلا و قازی دەگەڕێت، هەتاکو چوونە لای خێزانی حەرام نەبێت، ئەم نموونەیە ئەوە دەردەخات کەکاری موسڵمان هەمووی بەندایەتیە.

سیستەمە ئیسلامییەکە کاری ئەوەیە خەڵکی ژیانی خۆش بکات لەڕووی نان و ئەمان، پاشان ڕایانبهێنێت لەسەر بنەمای ئیمان و گەڕاندنەوەی بۆ لای خوای پەروەردگاریان، کەمرۆڤ بۆ بەندایەتی دروستبووە، نوێژی بەیانی دەکات چاوەڕوانی نوێژی نێوەڕۆیە، پاشان عەسر ئینجا شێوان و خەوتنان، کەوابوو بەردەوام مرۆڤی موسڵمان لەبەندایەتیدایە مەگەر خۆی هەڵە بکات خوای گەورە هەموو کارەکانی بەبەندایەتی هەژمار دەکات، بەبەردەوامی ئەگەر لەسەر ڕێچکەی ئیسلامەتی بوو، بەپێچەوانەی عەلمانی و دیموکراتخوازەکان، ئەوان دەڵێن: ئێمە وازمان لەکاری خوا هێناوە خواش وازی لەکاری ئێمە هێناوە، ئێمە لەسەر زەوی خۆمان حوکم دەکەین خوایش لەئاسمان حوکم دەکات، ئەوەی بڕوای پێیبوو بابگەڕێتەوە بۆ ئاسمان! لەبەشەکانیتردا بنەمای عەلمانیەت و دیموکراسی و مەدەنیەت، وەك خۆی دەخەینە ڕوو بەپشتیوانی خوای پەروەردگار.

کەواتە خواناسی لەسیمای یەکەمی دەسەڵاتی ئیسلامییە..

**سیمای سیستەمە ئیسلامیەکە:**

ئەو سێ خاڵە (زانست، ڕەوشت، دادگەری) دەبێتە هۆکار بۆ هەڵسان و پێشڕەوی گەلان بۆ سەرکەوتن لەشۆڕش و سیستەم و دەسەڵاتیان، بەڵام ئەم هۆکارانە نابێتە هۆی سەرکەوتنی موسڵمان تاپێشڕەوی گەلان بەدەست بهێنێت، ئەگەر خواپەرستی لەگەڵدا نەبێت!..

مەرجە لەسیستەمی ئیسلامیدا ئەم چوارە پێکەوە پیادە بکرێت، یەك لەم بنەمایانە فەرامۆش بکرێت ئوممەتی موسڵمان سەرکەوتوو نابێت هەمیشە ژێر دەستە دەبێت..

**گرنگی ئەو چوار بنەمایە بۆ سیستەمی ئیسلامی:**

**خواناسین**

هەموو ئەم خاڵانەی کەباسمان کرد ئەگەر ناسینی خوایەك نەبێت ئەوا ئەستە مە ڕێکبخرێت، سەرکەوتنی زۆر دوورە، یان بەهۆکاری کامیرا و دەزگاکانی ئاسایش، یاخود جۆرەکانی تری چاودێری ڕێکدەخرێت؛ کەواتە جیاوازی نێوان موسڵمان و بێباوەڕ ئەوەیە، کەخواناسی لای موسڵمانان مەرجە، بەڵام بۆ ئەوان مەرج نیە، ئەمە سوننەتە و ڕێبازی نەگۆڕی خوایە، لەمێژوی ئیسلامیدا لەخاکی موسڵماندا هەرگیز ڕوینەداوە دەوڵەتێك دامەزرابێت، یاخود خیلافەتێك یان ئەمارەتێك، کەسەرکەوتنی بەدەست هێنابێت، مەرج بووە ئەم چوارخاڵەی تێدا هاتبێتەدی لەسیستەمە ئیسلامیەکەدا، یاخود لەبزاوتە ئیسلامیەکەدا، نموونەی دەوڵەتەکان و بزاوت و فەرمانڕەوایان کردبێت مەرجی سەرکەوتنیان ئەو چوار خاڵە بووە، هەر کات ئەم چوار خاڵە یەك دانەی پشتگوێ خرابێت ئەوا دەوڵەتەکە بەرەو داڕمان چووە، مێژوو شاهیدی ئەم باسەیە، سوننەتی خوای گەورە گۆڕانی بەسەردا نیە. (فَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلاً وَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَحْوِيلاً..، سورة..) ٤٣ فاطر

واتە: هەرگیز نابینیت یاساو بەرنامەکانی خوا لەنەخشەی خۆیان لابدەن کە بە شێکی ڕیسواکردنی پیلان گێڕانە.

خواناسین: قورئان و سوننەتی سەروەرمان - صلی الله علیه وسلم. خەڵکێك لەوانەیە بڵێن: خۆ بڕوامان بەخوا و پێغەمبەر - صلی الله علیەوسلم- هەیە، بەڵام ئیسلام و دیموکراتی تیکەڵ بکەین، یاخود ئیسلامێکی لیبراڵ. ئەم جۆرە بیرکردنەوانە لەئیسلامدا خوای گەورە نایەوێت، لەموسڵمانی وەرناگرێت، لەتەرازوی ئیسلامدا هیچ ئەرزشێکی نیە، چونکە بەدرێژایی مێژووی ئەم ئیسلامە سەرکەوتنی ئوممەتی موسڵمان بەهۆکاری دەستگرتنیان بووە بەقورئان و سوننەتەوە.

ئەشێت خەڵکانیك بپرسن ئاخر موسڵمانان ئەوەندە زۆرو پارچە پارچەن کەس نازانێت ڕوو لەکامیان بکات؟

وەڵامی ئەم پرسیارە زۆر ئاسانە موسڵمانان لەخۆیان قورسکردوە، هەمیشە لەسەردەمی پارچە پارچەییە، وایان لێهاتووە، کەحەز بە"جیدال" بکەن چەلەحانێ لەسەر شتێك بکەن، کەخوای گەورە بۆی ڕونکردوونەتەوە..

﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَذَا الْقُرْآنِ لِلنَّاسِ مِن كُلِّ مَثَلٍ وَكَانَ الْإِنسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا﴾ ٥٤الكهف

واتە: بێگومان ئێمە لەم قورئانەدا لەهەموو جۆرەنموونەیەکمان هێناوەتەوە بۆ خەڵکی تا پەندو ئامۆژگاری لێوەرگرن کەچی ئینسان لەهەموو شتێك زیاتر موجادەلە دەکات و لەشت دەکۆڵێتەوە.

کەواتە، پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم- وەڵامی پرسیارەکەمان دەداتەوە و دەفەرموێت: (أنه من یعش بعدی فسیری اختلافا كثیرا فعلیکم بسنتی وسنة الخلفاء الراشدین عضوا علیها بالنواجذ وایاکم ومحدثات الامور فان كل محدثة بدعة وكل ضلالة فی النار).

واتە: لەدوای من ڕا جیاوازیتان لەنێواندا دروست دەبێت پارچە پارچەیی ڕووتان تێدەکات، بەڵام دەستبگرن بەسوننەتی من، واتە: قورئان، سوننەت. پاشان شوێنکەوتووی ڕێ و شوێنی خەلیفە پێگەیشتووەکان بن لەدەسەڵات و فەرمانڕەوای دینداریدا، بەڵکو بەنینۆکەکانتان بیگرن باوەشی پێدا بکەن

لەسیستەمی خیلافەت و شەریعەت هیچ داهێنراوێکیتر بۆ خۆتان دامەتاشن، چونکە هەموو داتاشراوێك لەدین و سیستەمی ئیسلامیدا ئەوا لەئاگردایە.

**دادپەروەری:**

لەڕووی دادگەریەوە خوای گەورە بەپێویستی داناومو فێرمان دەكات دادپەروەر بین لەهەموو کاروبارێکماندا لەماڵی خۆمانەوە تا دەسەلات و سیستەممان لەتاکمانەوە تا کۆمەڵگەمان.

**﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ إِنَّ اللّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ إِنَّ اللّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيراً﴾ ٥٨ النساء**

واتە: بێگومان خوا فەرمانتان پێدەدات، کەئەمانەت بدەنەوە دەست خاوەنەکەی، هەرکاتێکیش دادوەریتان کرد لەنێوان خەڵکیدا دادپەروەرانە فەرمانڕەوایی بکەن، بەڕاستی خوا بەجوانترین و چاکترین و تەواوترین شێوە ئامۆژگاریتان دەکات، بە ڕاستی خوا هەمیشە و بەردەوام بیسەرو بینایە.

**﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ وَإِيتَاء ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ ٩٠النحل**

واتە: بەڕاستی خوا فەرمان دەدات بەدادپەروەری و چاکەکاری و یارمەتیدان و بەخشندەیی بەخزمان، وە قەدەغە لەگوناه و تاوان و دەستدرێژی دەکات بۆ سەر ماڵ و نەفس و نامووس و ئامۆژگاریتان دەکات، بەڵکو یادەوەری وەرگرن و تێفکرن و هەر چاکەبکەن.

هەر سیستەمێك لەسەر بنەمای دادپەروەری دانەمەزرێت ئەوا دیکتاتۆریەتە و سیستەمی طاغوتە..

**ڕەوشت:**

ئەگەر لەئیسلامدا سەیری زانست و ڕەوشت بکەین دەبینین بەچەندین بەرگ کتێبی لەسەر نوسراوە. بۆتە ڕەفتارو ڕەوشتی پارسەنگ و پاکردنەوەی دڵ و دەروون و دابونەریتی کۆمەڵایەتی ڕەسەن کە بەهەمووی دەوترێت قییەمی کۆمەڵایەتی.

تەنانەت سەروەرمان پێغەمبەر- صلى الله عليه وسلم- کە باسی ڕەوشت دەکات وا هەست دەکەین، کەتەنها بۆ ئەو کارە ڕەوانە کرابێت و دەفەرموێت: إنما بعثت لأتمم مكارم الأخلاق.( (صححه الألباني في الصحيحة))

واتە: بەڕاستی من بۆ ئەوە ڕەوانە کراوم کەڕەوشتی جوان لەنێو ئێوەدا تەواو بکەم ..

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ أَكْثَرِ مَا يُدْخِلُ النَّاسَ الْجَنَّةَ فَقَالَ تَقْوَى اللَّهِ وَحُسْنُ الْخُلُقِ وَسُئِلَ عَنْ أَكْثَرِ مَا يُدْخِلُ النَّاسَ النَّارَ فَقَالَ الْفَمُ وَالْفَرْجُ . [حكم الألباني: إسناده حسن] پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: زۆرینەی خەڵکی کەدەچنە بەهەشت، بەهۆکاری ڕەوشت جوانی و خۆپاراستنیانە لەتاوان..

وعن أبي الدرداء رضي الله عنه أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: [ ما من شيء أثقل في ميزان المؤمن يوم القيامة من حسن الخلق وإن الله يبغض الفاحش البذي] رواه الترمذي وقال حديث صحيح

واتە: نزیکترین کەس لەمەجلیسی موبارەکی پێغەمبەر- صلى الله عليه وسلم- لەڕۆژی قیامەتدا ئەو کەسەیە کەڕەوشت بەرزە..

**زانست:**

خوای گەورە سەرەتا کەپەیامی ناردە خوارەوە بۆ پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- باسی زانست بوو؛ لەناو ئەو هەموو ئەحکامە زۆرەی ئیسلام یەك وشەی کردە پێشەنگ بۆ ئەم دینە ئەویش بریتی بوو لەوشەی "خوێندن". پاشان پێنج

ئایەتی یەکەمی ئەم ئیسلامە لەناو ئەو هەموو ئەحکامە زۆرانەی ئیسلامدا باسی خوێندن و زانست و قەڵەم دەکات، کەهەموو پەیوەندیان هەیە بەزانستەوە، ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەم ئوممەتە کەهەڵسانەوەی بێ زانست ئەستەمە..

پاشان خوای گەورە بەهۆکاری زانستەوەیە مرۆڤی کردۆتە خەلیفە لەسەر زەویدا و پلە و پایەی بەرزکردۆتەوە.

پێغەمبەر (صلی الله علیەو سلم) زانستی لەسەر هەموو موسڵمانێك بەپێویست داناوە.

پاشان لێرەدا پرسیارگەلێکی زۆر خۆی دەنوێنێت و دەستەو ئێخە دەبێت لەتەکماندا و دەڵێن: باشە ئەی عەلمانیەکان چۆن دەبن و حیزبیان دەبێت و سیمای ڕاگەیاندن و حیزبەکانیتر چۆن دەبێت کەئیسلام دەسەڵاتی زۆرینەی لەدەستدا بوو؟

لە باسەکانی ڕابردوودا ئاماژەمان پێداوە، کەئیسلام بەسێ قۆناغدا تێدەپەڕێت، کاتێك لاوازە مامەڵە لەگەڵ ڕەوشەکەدا دەکات، لەقۆناغی ناوەندیدا چۆتە ناو دەسەڵات و خاوەن پرۆژەی تۆکمە و باشە ململانێی سیاسی هەیە لەگەڵ حیزبەکانی رکابەریدا، قۆناغی کۆتایی زۆرینەی خەڵکی لەگەڵدایەو خۆی بەتەنها حکومەت و سیستەم و دەسەڵاتی دامەزراندوە.

لەم حاڵەتەدا بەهیچ شێوەیەك ڕێگا نادرێت بەهیچ دەسەڵاتێك، کەبانگەشەی بێدینی بکات یاخود بانگەواز بۆ کارێك بکات کەدژی ئاینی ئیسلام و ڕای زۆرینە و ئیرادەی خەڵکەکەیەتی، واتە: ڕێگا نادرێت بەحیزبی کۆمەنیست و شیوعی و چەپ و لیبراڵ بانگەشە بۆ بێدین و جیاکردنەوەی دین لەدەوڵەت بکەن، ئەگەر ڕێگایدا. ئەوکات تۆ لەسیستەمە ئیسلامیەکەدا ڕێگاتداوە بەخراپەکاری بۆ خەڵك و وەك ئەوە وایە تۆ بەدەستی خۆت خەڵکەکەت بکوژیت و توشی نەخۆشی کوشندەیان بکەیت بەهێنانی فیکرو بیری بێباوەڕی!

ئەمەش ئەوپەڕی واقعیە لەئیسلامدا، کام دەسەڵات و سیستەم ئەگەر خۆی بەتەنها زۆرینە بوو دەهێڵێت سیستەمیتر پیادەبکرێت؟

تەنانەت لەسیستەمە دیموکراسیەکانیشدا ئازادی حکومەت و دەسەڵات و تەنانەت جلوبەرگیش نادەن بەخەڵکی موسڵمان نموونەی میسر و حەماس و بەرەی ئینقاز لەجەزائیر... هتد وەك ژیانی تایبەتیش فەرەنسا و تورکیا ئەو وڵاتانەیتر.. کەپۆشاك و سیمای موسڵمانیان قەدەغەکرد..!

بەهیچ شێوەیەك ئیسلام لەدەسەڵاتی زۆرینەی خۆیدا ڕێگا نادات بەحیزبی عەلمانی و لادینیەکان حیزبیان هەبێت و بانگەشەی حیزبایەتی بۆ سیستەمی عەلمانی و یاخود بێدینی یان هەر ئایدۆلۆژیایەکیتر، تەنانەت ڕێگە نادرێت جولەکە و مەسیحیەکانی ناو دەوڵەتی ئیسلامی بانگەشە بۆ ئاینی خۆیان بکەن.

بۆ؟

وەك گوتمان هەر سیستەمە خاوەن ئەدەبیاتی خۆیەتی، سیستەمی ئیسلامیش بۆ حوکمڕانی ئەوەیە، کەپارێزەری نێوانی خواو مرۆڤەو پارێزەری نێوانی مرۆڤ و مرۆڤە و پاشان مرۆڤ و ژینگەیە..

خوای گەورە لەقورئاندا کەسەرەتای سورەتی فاتیحەیە قورئانەکەی نمایش دەکات و کەلامی خۆیمان پێدەناسێت، کەئەمە یەکەم ئایەتە شوناس و ناسنامەی مرۆڤی موسڵمانە بەرامبەر بەخوای پەروەردگاری، بەڕای نوسەر هەموو قورئان تەفسیری ئەم سورەتەیە، پاشان کۆتاییەکەی بەسورەتی خەڵك کۆتایی دێت کەخوای گەورە دەبێت بەپاشا و فەرمانڕەوای موطڵەقی بزانین و فەرمانڕەوای لەسەر بنەمای کەلامی خوا و نێردراوەکەی کە محەممەدە - صلی الله علیه وسلم- کار بکەین.

ئیسلام سەرەتای قورئانەکەی بەوە دەست پێدەکات کەگوتاریکی سیاسییە بەسوپاسگوزار و پاشان بەدواکەوتن و دواتر بەخۆ بەریء کردن لەڕێوشوێنە هەڵەکانی گەلانیتر و بڕیار ئەدەیت و نزا دەکەیت خۆت دەناسێنی کەخوا پەرستی ناسنامەی خۆت ئاشکرا دەکەیت، تا کۆتایی قورئان تەفسیری ئەو سورەتەیە کەخوای گەورە دەفەرموێت:

قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ﴿١﴾

(ئەی محەمەد (صلی اللەعلیەوسلم)، ئەی ئیماندار) بڵێ: پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خەڵکی.

مَلِكِ النَّاسِ ﴿٢﴾

وەبەپادشای خەڵکی.

إِلَهِ النَّاسِ ﴿٣﴾

وەبەخوای خەڵك

تەنانەت کۆتایەکەی بەدەسەڵاتداری خۆی کۆتایی پێدێنێت..

بەوەی کەخوا پادشایە، خوا حاکمە..

کەواتە: بەهیچ جۆریك ڕێگا نادرێت بەکەسانێك دژایەتی خوا و ئاینەکەی بکەن!

جا ئەگەر هەندێك ئەمە بەپێشلکردنی ئازادی ڕادەربڕین و مافی خەڵکیتر دەزانێت، ئێمەی موسڵمانیش پێمانوایە کەبانگەشەی بێدین و عەلمانی و هەر بیروباوەڕێکی دیکە بێجگە ئیسلام خۆکوژییەو مرۆڤ بەرمو هەڵدێر دەبات..

لێرموە ئەوە ئاشکرا دەبێت، کەحاکمییەتی خوای گەورە بەندایەتیە، لەبنەڕەتیشدا مرۆڤ بۆ بەندایەتی دروستکراوە.. پێچەوانەی بەندایەتی و تەوحید، هاوبەش دانانە و گوێنەدانە بەفەرمانی خوا و پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم-، چونکە مرۆڤی موسڵمان نێوانی خواو خۆی تێکنادات لەبەر خاتری ڕای دەربڕین، مرۆڤێکی کەم و کاڵفام کەئەو بیەوێت بەئارەزوی ویستی خۆی قسەی بسەپێنێت و کەلامی خوا لەبیر بکرێت، ئەمە لەسیستەمی ئیسلامی زۆرینەدا ڕوونادات مەحاڵە نابێت، دەسەڵات و خەلیفە و یان ئەمیری موسڵمانان ڕێگای پێبدەن.

## سیستەمی ئیسلامی ناوی چیە؟

بە بۆچونی نووسەر- لەقورئان و فەرموودەوە سەرچاوەی گرتووە، بەهیچ شێوەیەك سیستەمی ئیسلامی هیچ ناوێکیتر هەڵناگرێت، تەنها خیلافەت نەبێت..

خیلافەت واتە: جێنشینی حوکمی خوای گەورە لەسەر زەوی، خەلیفەکەشی واتە: جێگرەوەی پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم- لەحوکمڕانیدا...

ڕاستە پێغەمبەری خوا -صلی الله علیه وسلم- بەوەحی ئاراستەکراوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەی کەپێغەمبەر بووە - صلی الله علیەو سلم - حاکمدار و دەسەڵاتی فەرمانڕەوایشی هەبوو وەزیر و سوپاشی هەبووە، وەحیەکەی ماوە کەقورئانە و لەبەردەستدایە، زانایان ئاراستەی تاك و کۆمەڵگەو دەسەڵاتی دەکەن لەڕێگای سێ پێکهاتەی ناو خەڵکەکە کەپێشتر ئاماژەمان پێداوە لەموفتی و قازی و فەقیهەکان...

حکومەت و دەسەڵات و فەرمانڕەوایەکەی وەك سیرەو مێژوو لەبەردەستماندایە لەگەڵ پێنج خەلەیفەکەیدا هەرچەندە لەئەبوبەکر زیاتر بەهیچیان نەگوتراوە خەلیفە ئەوان ناوی ئەمیری موسڵمانانیان وەرگرتبوو تەنها بەئەبوبەکر گوتراوە - خلیفة الرسول - ئەوان امیر المؤمنین - بوون.. بەهەرحاڵ دێینەوە ناو ناوەڕۆکی باسەکە هەموو سیستەمی ئیسلامی بەچاك و خراپیەوە هەر خیلافەتە...

## بۆ وە چۆن؟

پێغەمبەر زیاتر ئاگادارمان دەکاتەوە لەسیستمەکی خۆی دەفەرموێت: علیکم بسنتي وسنة خلفاء الراشدين.. واتە: دەست بگرن بەرێگا و شوێنەکانی منەوە کەئەنجاممداوە، پاشان خەلیفە پێگەیشتووەکان زیاتر ئاگادارمان دەکاتەوە دەفەرموێت: (وإياكم ومحدثات الأمور؛ فإن كل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة) کەباسی (محدثات، يحدث، حدث) کرابێ واتە: (المفسدون في الارض) ئەوانەی کەخراپەکارن، بەمانای تازەگەری و داهێنان کە لەشەرعدا نەبێت، واتە:

(المحدثات بمعنى الباغون على الحق ولعدل ولخارجون على قانون الدوله) بەکەسێك دەوترێ محدث کەطغیان ئەکات واتە: دەرچووە لەئەمری خوای گەورە ئەم وشەیە زیاتر بۆ سیستەمی دەسەلآت بەکاردێت. دەسەلآتیش لێرەدا یاخود لەشەرعدا بەمانای ئەو دەسەلآتەی کەپێغەمبەر صلى الله عليه وسلم باسی کردوە لەفەرموودەکەیدا کەدەفەرموێت لەسەر سوننەتی من بن و لەسەر سوننەتی خەلیفە ڕێنیشاندراوەکان بن، یان پێگەیشتوەکان کەراشدینە. نەك هەموو دەسەلآتێك بەگشتی باسبکرێت دەبێت دەسەلآتەکان دیاری بکرێت. چونکە ئێمە باسی دەسەلآتی ئیسلامی دەکەین، کاتێك دەسەلآتەکە ئیسلامی نەبوو ئەوا گوێڕایەلّیکردنیشی ناشەرعیە و ناشێت بۆ موسلّمان خۆی پابەندی دەسەلآتێکی ناشەرعی بکات. دەبێت بیگۆڕێت و لەهەولّی گۆڕانیدابێت.

مەبەست لە(محدث) ئەو کەسانەیە کەهەمیشە فیتنە دروستدەکەن بەرامبەر ئەو کەسانەی گۆڕانکاری دەکەن، (خارجون عن الدولة الشرعية) هەر کەس لەقانونی دەلّەتی ئیسلامی بچوایەتە دەرموە پێی ئەوترێ (محدث)، بۆیە پێغەمبەر – علیه الصلاة والسلام- ئەفەرموێت: (من أحدث فيها حدثا أو آوى محدثا فعليه لعنة الله والملائكة والناس أجمعين، لا يُقْبَل منه صَرْف ولا عَدْل)

واتە: هەر کەسێك لەسیستەمی ئیسلامیدا بچێتە دەرموە، ئەوا لەعنەتی لێکراوە و لەعنەتی مەلائیکەت و خەلّکی بەگشتی، صرف، سەرفکردن، بەواتای تۆبەکردنی لێوەرناگیرێت، چونکە سەرفکردنی تاوانە لەجێگای چاکەکردن، والعدل، دادگەری، بەخشین و لەبریاردان لەشەرعدا کارێك بکات حەدی شەرعی بکەوێتە سەر، وەك دزیکردن، لەجیاتی دەستبڕینەوە بەوشێوەیە.

پاشان پێغەمبەری خوا - علیه الصلاة والسلام- کاتێك دەیەوێت تەشریف بەرێت بۆ ناو بەنی شەیبان لە عێراقدا لەگەلّ (موثنی کوڕی حارث) دەکەونە گفتوگۆ، مثنی کوڕی حارث دەلّێ: (انا قد عاهدنا كسرى على ان لانحدث حدثا ولانؤوي محدثا) واتە: ئێمە بەلّێن و پەیمانمان بەکیسرا داوە، کەهیچ شتێك نەکەین دژ بەسیاسەتەکەی ئەو هیچ کەسێکیش پەنا نەدەین کەدژی ئەو بجولّێتەوە

لێرەدا (محدثات) بدعەی داهێنراوە کەئەم سیستەم و ڕژێم و فەرمانڕەواییە دێت بەو مانایەی، کەئێستا هەیە و گرنگە هەموولایەکمان هەست بەوە بکەین، کەپێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) ئەفەرموێت، (من أحدث في أمرنا هذا ماليس منه فهو رد) واتە، هەر کەسێك شتێك دابهێنێت لەسیستەمی ئێمەدا نەبێت و فەرمانی ئێمەی لەسەرنەبێت ئەوا دەدرێتەوە بەسەریدا و لێی وەرناگیرێت[٥٦].

ڕژێمی موسڵمان (توحید)ە، سیستمی دەسەڵاتی ئیسلامییە، گۆڕینی هاتنەوە کایەی ئیسلام لەڕووی ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیریی و ...هتد لەهەموو ڕەهەندەکانی ژیانەوە ئەمە پێی دەوترێ گوتاری سیاسی، بەکورتی پێکهاتوە لەئوصولی سێ شت (قورئان، سونەت، خلفاء راشدين). کەبەشێکی گەورەی ناو سیستەمە ئیسلامیەکەیە.

پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم- دەستنیشانی سیستەمی سیاسی ئیسلامی کردوە. سەروەرمان محەمەد کۆتا پێغەمبەرە - صلى الله عليه وسلم- و ئاینەکەشی کۆتایی ئاینەکانە، خوای گەورە و باڵا، لەپەیامەکەیدا بۆ سەر زەوی دەفەرموێت، (الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا...) ٣ المائده

واتە، لێرەدا دەبێت ئەوە لەبەرچاو بگرین، کەخوای گەورە ڕازییە بەوەی ئیسلام ئاینمان بێت، دەبێت بەبچوك و گەورەی ئیسلام ڕازیبین، گومانمان لەوەدا نیە کەهەمووومان بەجیاوازی دید و بۆچوونمان لەسەر ئەمە کۆکین، کەمادام کۆکین ئەم دەقە قورئانیە تەئویل هەڵناگرێت، نە هیچ وتەو باسێکیتر، ئەگەر مەرجە موسڵمان بین و شوێنکەوتووی محەمەد بین- صلى الله عليه وسلم- خۆ ئەو پێغەمبەرمان بووە و سیستەمە سیاسیەکە سیستەمی پێغەمبەرایەتی بووە.

---

[٥٦] سیرەی ابن اهشام ج١ ل ٢٨٩)

پێغەمبەری خوادا صلی الله علیەوسلم دەفەرموێت: دوای من پێغەمبەر نایەت؛ کەواتە ئەو سیستەمە کۆتایی هات. بەڵام دوای ئەوە سیستەمێکی نوێ دەستپێدەکات خۆی ئاشکرای دەکات وەك نیشانەی پێغەمبەرایەتی خۆی و سیستەمی سیاسی و بەڕێوەبردنە هەر خۆشی حاکم بووە و فەرمانڕەوابووە - صلی الله علیە وسلم-. لەدوای ئەو سیستەمە ناوی نەناوە سیستەمی دیموکراسی، بەڵکو ناوی لێناوە سیستەمی پێگەیشتوو، واتە: ڕاشدین، دوای ئەو سیستەمە سیستەمێکی تری ئیسلامی دەستنیشان دەکات بەناونیشانی سیستە می ویراسەت کەهاوشێوەی پاشایەتیە، بەڵام لەناو دامەزراوەی ئیسلامیدا و لەبازنەی ئیسلامەکەدایە وەك نموونەی معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان ڕەزامەندی خوای لێبێت زۆرێکیتر لەخەلیفەکانی ئەمەوی و عەباسی عوسمانی...هتد ئەمان لەشورای ئوممەت دەرچوو بوون، سیستەمی زۆر و ستەمکار بەزمانی ئەمڕۆ (دیکتاتۆر)، ئەمیش دەشێت هەر لەبازنەی ئیسلامدا بێت، بەڵام وەك حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی، جەلالەدینی کوڕی محەممەدی خەواریزم شا، بەدرەدین لوئلوئو، برکیاروق و توتوش....هتد لەدوای ئەم قۆناغانە قۆناغیتر جێگای نابێتەوە لەناو ئیسلامدا دەبێت بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە سەرەکیەکە کەسیستەمە ڕاشدینەکەیە[57]

[57] دەقی ئەو فەرموودەیە کەئەلبانی - ڕەحمەتی خوای لێبێت - بەڕاستی داناوە لەئیمامی ئەحمەدەوە - ڕەحمەت و درودی پەروەردگار بۆ سەر گیانی - ڕیوایەت کراوە ئەو سیستمەیە کەسەروەرمان باسی دەکات (تکون النبوة فیکم ما شاء الله أن تکون، ثم یرفعها الله إذا شاء أن یرفعها ثم تکون خلافة علی منهاج النبوة، فتکون ما شاء أن تکون، یرفعها إذا شاء أن یرفعها، ثم تکون ملکا عاضا فتکون ما شاء الله أن تکون، ثم یرفعها إذا شاء أن یرفعها، ثم تکون ملکا جبریا، فتکون ما شاء الله أن تکون، ثم یرفعها إذا شاء ثم تکون خلافة علی منهاج النبوة ثم سکت). في مسند احمد.

تێبینی: هەندێك پێیانوایە كە لەدەسەلاتی "جەبابیرەكان" واتە: دەسەلاتی زوڵم و زۆر كەسەرووەرمان - صلی الله علیه وسلم- باسی لێوە دەكات مەبەست پێی عەلمانیە، ئەمە لەڕاستیدا وانیە، چونكە ئەگەر تەماشای سیستەمەكە بكەین هەمووی بەدوای یەكدا ئیسلامییە و خەڵكی موسڵمان حوكمڕانی دەكات، بەڵام ئەگەر هاتوو ناو و ناتۆرەی ئەم بەرنامانەی لەناو عالەمی ئیسلامیدا پیادەكرا، بەڵام هەر سیستەمەكە حاكمیەتی ئیسلام بوو، ئەوا دەشێت بەسیستەمە جەبریەكەی (ئیستبدادی) موسڵمان هەژمار بكرێ، سیستەمی عەلمانی و سیستمی دیموكراسی و سیستمی سەرمایەداری..تاد، ئەوانە هیچ بەئیسلام هەژمار ناكرێت، هیچ پەیوەندی بەئاینی ئیسلامەوە نیە، بۆخۆیان بەرنامە و تایبەتمەندی خۆیان هەیە.

لێرەدا گەیشتینە ئەو دەرئەنجامەی، كە بەفەرموودەی خوای بەرز و باڵاو فەرموودەی پێغەمبەری سەرووەرمان - صلی الله علیه وسلم-، ئیسلام خاوەنی سیستەمی ئیسلامیە هیچ ناوێكی تر هەڵناگرێت بێجگە لە خیلافەت...

لەسەر چوار پایەی گرنگ دادەمەزرێت..

١- حاكمیەتی خوا
٢- دادپەروەری و یەكسانی
٣- پەیمان بەستن گوێڕایەڵی
٤- راوێژ و شورا

قورئانیش بۆ خۆی لەناو كۆمەڵگە و كایەی سیاسەتدا كار لەسەر ئەو چوار تەوەرەیە دەكات.

كەواتە شیاوترە بڵێین: ((ئێمە خاوەنی سیستەمی پێگەشتوین، نەك دیموكراسی))، چونكە لەسەردەمی خیلافەتی پێگەیشتوو (ڕاشدین) كە(٣٠) ساڵی خایاندوە باسی ئەوە دەكاتەوە بۆمان پێغەمبەر- صلی الله علیه وسلم- لەسەر مەنهەج و ڕێبازی پێغەمبەرایەتی بوون (خلافة النبوة ثلاثون سنة)، بەڵام

لەماوەی ئەم ٣٠ ساڵەیدا کەخەلافەتی پێگەیشتوو بوون، کوشتنی نێوانی هاوەڵان و شەڕی فیتنە و هەڵگەڕانەوە لەئاین و دروستبوونی دەیان جۆر لەبیروباوەڕی جیاواز ڕوویداوە و دروستبووە.
پرسیار ئەوەیە ئەی چۆن ڕاشدین و پێگەیشتووە؟ چۆن لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر بووە ئەم هەموو ناڕەحەتی و جەنگ و کوشتار و فیتنەیە تێدابووە؟

موعجیزەی سیستەمە ئیسلامیەکە لێرەدا دەردەکەوێت..
چۆن؟

پێغەمبەری ئازیز- صلی الله علیه وسلم- تەمەنی سیستەمە پێغەمبەرایەتی و سیاسیەکەی ٢٣ ساڵ بووە.
خیلافەتی ئەبوبەکر ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ٢ ساڵ و سێ مانگ بووە.
خیلافەتی عومەری کوڕی خەتاب ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ ١٠ ساڵ و شەش مانگ بووە.
خیلافەتی عوسمانی کوڕی عەفان ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ ١٢ ساڵ بوە
خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبوتالیب ـ ڕزای مەندی خوای لێبێت ـ٤ ساڵ و حەوت مانگ بووە.
خیلافەتی حەسەنی کوڕی عەلی ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ شەش مانگ بووە.[٥٨]
باشترین سیستەمی سەر زەوی ئەم (٥٣) ساڵەیە، ئەم سیستەمە لەپێغەمبەرەوە - صلی الله علیه وسلم- تاحەسەنی کوڕی عەلییە، چونکە لەژیانی هەموو موسڵمان و دەستە و کۆمەڵ و دەوڵەتێکدا ئەم ٥٣ ساڵە دووبارە دەبێتەوە، هەرچی تێدا ڕوویداوە چارەسەری بۆ دۆزراوەتەوە، کێشەکانی بەباشترین شێوە چارەسەرکراوە، کەواتە بۆ ئەم ٥٣ ساڵە باشترین سیستەمە و بەپێگەیشتوو

[٥٨] تێبینی: ئەو مانگەی نادیارە دابەش دەکرێتەوە بەسەر ئەو ڕۆژانەی دەسەڵاتی هەر پێنج خەلیفەکە.

ناوبراوە؟ ئەگەرچی ئەو هەموو ڕووداوە ڕوویداوە تێدا، بەهۆکاری ئەوەی لەژیانی هەموو موسڵمانیك ئەم ٥٣ ساڵە هەر دەبێت دووبارەببێتەوە، ئیتر هەیە قۆناغی ئەبوبەکری لێ دووبارە دەبێتەوە و هەیە سەردەمی عوسمان.. هتد، بەڵام دەتوانین بەهاوشێوەی ئەوان بەرەوشی ئێستا چارەی بکەین و ببێتە ئەزمونێك.. کەواتە ئەمە سوننەتی خوای گەورەیە، وە سوننەتی خوای گەورەش گۆڕانکاری بەسەردا نایەت.

خەلیفە لەم سەردەمەدا ئەشێت جیاواز بێت، هەرچەندە لەم سەردەمەی ئێستاماندا بێجگە لەمەرجە گرنگەکان کەئاقڵ و موسڵمان و بالغ و ئەوەی کەبنەڕەتین، مەرج نیە خەلیفە وەك جاران دەسەڵاتی هەبێت یاخود حوکم بکات یان بڕیاری جەنگ و لابردن و دانانی بدات، ئەشێت وەك پادشا و مەلیکەکانی ئێستا فەرمانڕەوایی بکات و خاوەنی هەندێك لەدەسەڵات بێت و ستافی خیلافەتەکە حکومەت و پایەکانی دەوڵەت دابمەزرێنن بەگوێرەی ئەو گرێبەندەی کە لەنێوان (حاکم و مەحکومدایە) یاخود دەسەڵاتدار و خەڵکدایە و لەئیسلامدا ئەو گرێبەندە یاخود ئەو بەیعەتە بە(کلکم راع و کلکم مسئول عن الرعیە) ناسراوە، یاخود دەشێت خەلیفە ڕەمزی بێت و تەنها وەك باوکێکی ڕوحی دانرابێت و کردارەکانیتر وەزیر و وەزارەتەکانی خیلافەت ببەن بەڕێوە.

خەلیفە لەئیسلامدا هیچ پیرۆزی و گەورەییەکی نییە؛ واتە: وەك خەڵکەکەی ناو دەسەڵاتەکەیەتی، مەگەر تەقوا و وەرع و دینداری خۆی پلەوپایەی بەرزبکاتەوە بەمەرجی دادپەروەری و ئیحسان و.. هتد بەرز دەبێتەوە وەك خوای گەورە لەباسی وەلی ئەمردا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ إِنَّ اللّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ إِنَّ اللّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾ ٥٨النساء

واتە: بێگومان خوا فەرمانتان پێدەدات کە ئەمانەت بدەنەوە دەست خاوەنەکەی، هەرکاتێکیش دادوەریتان کرد لەنێوان خەڵکیدا، دادپەروەرانەفەرمانڕەوایی بکەن، بەڕاستی خوا بەجوانترین و چاکترین و تەواوترین شێوەئامۆژگاریتان دەکات، بە ڕاستی خوا هەمیشە و بەردەوام بیسەر و بینایە.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً﴾ ٥٩ النساء

واته: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، فەرمانبەرداری خوا و پێغەمبەرو فەرمانڕەواكان بكەن كە لە خودی خۆتانن، خۆ ئەگەر لەشتێكدابوو بەكێشەتان، ئەو كێشەیە بگێڕنەوە بۆلای خوا و پێغەمبەرەكەی - صلی اللەعلیە وسلم- كەپیادە كردنی قورئان و سوننەت دەگەیەنێت، ئەگەر ئێوەباوەڕتان بەخواو ڕۆژی قیامەت هەیە، ڕەفتاركردنتان بەو شێوەیە چاكترو ڕونتر و ڕەوانترە.

وەلی ئەمر بەكۆ ناوی هاتووە: واتە وەلی ئەمرێك گوێڕایەڵی دەكرێت، كەپابەندبێت بەفەرموودەی خوای پەروەردگار و پێغەمبەرەكەی - صلی الله علیه وسلم-..!

پاشان خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿الَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُواْ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُواْ إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُواْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيدًا﴾٦٠ النساء واتە: ئایا نابینیت و سەرسام نیت لەو جولەكانەی كە وا نیشان دەدەن، باوەڕیان هێناوە بەوەی بۆ تۆ ڕەوانەكراوە، وە بەوەش كەپێش تۆ ڕەوانەكراوە بۆ پێغەمبەران كەچی دەیانەوێت ڕووبكەنە زۆردارو جادوگەرو خوانەناسان، تا دادوەرییان لەنێواندا بكەن و چارەسەری كێشەكانیان بكەن، لەكاتێكدا فەرمانیان پێدراوە كەباوەڕیان بەشتی ناڕاست و نادروست نەبێت، شەیتانیش دەیەوێت بەرەو گومڕاییەكی دوور و بێ سنور بیانبات.

**شیکاری و هەڵهێنجانی چوار تەوەر لەم ئایەتە پیرۆزانە لەسەر وەلی ئەمر:**

یەکەم: لەسەر وەلی ئەمرەکان واجبە، کەئەمانەتی ئەو خەڵکە بپارێزن، سەروەت و سامان و نەوت و نانیان نەدزن و خەڵکی ئەو وڵاتە لەسەر دینداری نەخەنە زیندان و خۆیان سەروەت و سامانی ئەو خەڵکە بپارێزن، بەدادپەروەیی و عەدل حوکم بکەن لەنێوانی خەڵکیدا، بەمەقالیدی قورئان حوکم بکات، ئەو کاتە دەبێتە وەلی ئەمر.

دووەم: ئەبێت نوێژ خوێن بن لەمزگەوتەکاندا ببینرێن ئەمریش بکەن بەخەڵکی بەنوێژ و بیری قیامەتیان بخەنەوە ئەوکاتە دەبنە وەلی ئەمر.

سێیەم: هەموو گەردنکەچیەکی خەڵکی بۆ وەلی ئەمر و بەقسەکردنیان لەسەر بنەمای ئەوەیە کەخۆیان پیادەکەری قورئان و سوننەت بن، ئەگەر بوون ملکەچیان واجبە، ئەگەرنا شۆڕشکردن واجبە.[٥٩]

چوارەم: ئەو مەرجە دەستورییە، کەئیمانی قیامەتی کامڵ دەکات ئەویش ئەوەیە دەستوری وڵات هیچ بەربەرەکانێی نیە لەگەڵ قورئان و سوننەتدا، ئەم دەستورە ئیسلام سەرچاوەکەیەتی، داعی و حاکم وەك یەك دەبن. واتە: پیشەی حاکم بانگخوازیە لەگەڵ ئیدارەدا، ئەوکات خوا فەرمانڕەوایی خەڵکی دەکات لەڕێگای دەستور و قانون و یاساکانی کەقورئان و سوننەتەکەی پێغەمبەرە - صلى الله عليه وسلم- نەك طاغوتەکان[٦٠].

---

[٥٩](الاسلام والسياسه الرد على شبهات العلمانيين ل ١٥٧.. د.محمد عمارة)

[٦٠] الخطاب الدينى بين التجديد لاسلامي والتبديد الامريكان ل ١٧، .. د.محمد عمارة )

**سیستەمی سیاسیی ئیسلامی:**

سیستەمی سیاسی ئیسلامی کۆمەڵێك بنەمای دەزگای پێکەوەگرێدراو و پەیوەندیدارن، لەنێوانی دەزگاکانی فەرمانڕەوایی و ئالیەتی کارکردنی حکومەت، خاوەن کاری تایبەت و ئامانجی جیاوازە بۆ پاراستنی تاك و دیاریکردنی سنور بۆ پەروەردەکردنی کۆمەڵگە و دەستەکانی ناو ئەو کۆمەڵگەییە، ئاوێتە بوونی هەموو دەزگا و فەرمەنگاکان بۆ هەڵسان بەکار و وەزیفەی خۆیان بۆ ڕێکخستنی نێوانی تاك و خیزان و کۆمەڵگەو دەسەڵات.

لە ڕووی زمانەوانییەوە سیستەم: واتە: ئەو پەت و دەزووەی کەگەوهەرو و لوئلوئ پێ دەهۆنرێتەومو ڕێکدەخرێت.

سیستەم لەڕووی زاراوەیەوە: کۆمەڵێك لەیاساو ڕێسا کەنێوانی کۆمەڵگە ڕێکدەخات لەڕووی ڕەهەندی کۆمەڵگە و ئابووری و سیاسی و بیروباوەڕ و پەروەردە و خوێندن، کەهەمووی مەبدەئی پەروەردە و یاخود فەلسەفەی پێگەیاندنی گەلە بۆ بوارەکانی سیاسی و ئابووری و ئیداری و فێرکاری.

پێناسەی سیاسەت: واتە هەڵسانی خاوەن دەسەڵات بۆ چاکسازی بارو گوزەرانی ژێردەستەکانی.

ئیسلام: ئەو ئاینەیە کە لەلای خوای گەورە بەکۆمەڵێك ڕێسا و یاسا هاتۆتە خوارەوە بۆ مرۆڤەکان کەبەندایەتی خوای گەورە بکەن، هەمووی ئەو سیستەمە سیاسیەی کەئاماژەمان پێداوە لەدەوری ئەوەدا دەسوڕێتەوە کەخەڵکی خۆشگوزەران بن و حاکم و دەسەڵاتداری بیری قیامەت و بەندایەتیان بخاتەوە تا هەست بەگەڕانەوەیان بکەن بۆ لای پەروەردگاریان.

ئەم تێگەیشتنە جیاوازترە لەهەموو سیستەمەکانی تری ژیان، کەئەوانیتر هەموو گرنگی ئەدەن بەبواری ژیان و قیامەت و مردن و بەژیانیانەوە نابەستنەوە،

جیاوازی سیستەمی سیاسی ئیسلامی لێرەوە سەرچاوە دەگرێت، کەخوای گەورە ڕاستەوخۆ ئاڕاستەی دەکات، لەڕێگای قورئان و سوننەتەوە پاشان خەڵکی موسڵمانەوە.

ئەم سیستەمە پێکهاتە و ئاکاری ئیسلامی و مرۆییە؛ ژیار و شارستانیەتی لەسەر بوونیاد دەنرێت، کەفەلسەفەی پەروەردەی مرۆڤەکانە، کەدەڵێن ئاکاری ئیسلامی واتە، کۆمەڵێك پێوەرە و ئەحکام و دیدو تێڕوانینی نەگۆڕ بۆ گەردوون و ژیان و مرۆڤ و خوا، کەئیسلام بۆی وێناکردوین، تائاوێتە ببێت لەناو تاك و کۆمەڵگەدا و لەڕێگای وێستگەکانی ژیان و ئەزمونی جیاوازەوە ئامانجی ژیان دیاریبکەن.

**فەلسەفەی پەروەردەو ئاکاری ئیسلامی لەناو سیستەمی ئیسلامیدا دابەش دەبێت بەسەر سێ بەشدا:**

یەکەم: ئاکاری بەرزی ئیسلامی: ئەم ئاکارە بەرزە واتە بەرزبوونەوەی مرۆڤ بۆ بەرزترین پلەی ئاکار ئەویش مافی پەرستن و حەق و دادپەروەری و ئیحسان و حیکمەتی مرۆڤەکانە، کەئەمەش بەرزترین ئاکاری ئیسلامییە..

دووەم: ئاکاری شارستانیەت: ئەو ئاکارانەی پەیوەندیان هەیە بەپێشکەوتنی بوونیادی شارستانیەتی ئیسلامی، کەپێشکەوتنی ئەقڵ و هۆش و ئاوەدانکردنەوەیە، وەك دادپەروەی و یەکسانی و ئازادی و کار و هێز و ئاسایش و ئاشتی و جوانی... هتد.

سێیەم: ئاکاری سروشتی مرۆڤ واتە فیطرەت، ئەمەش پەیوەستە بەڕەوشتی مرۆڤە موسڵمانەکانەوە کە لەگەڵ یەکتردا پیادەی دەکەن بۆ بەرپاکردنی خۆشەویستی، وەك ڕەحمەت، ڕاستگۆیی، پێکەوە ژیان، ئەمانەت، ئارامی، سوپاسگوزاری، ڕێزگرتن، گفتوگۆ، ئامۆژگاری..هتد.

ئەم ئاكارە وايكردوە لەكۆمەڵگەی ئیسلامیدا جیاوازبێت لەناو كۆمەڵگەكانی تری دنیا و بەتايبەت لەرۆژئاوا.
لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوەو دەڵێت: ئەی بۆ كۆمەڵگەی ئیسلامی ئێستا ئەم ئاكارانە بەزەقی تێدا نابینرێت؟
لەوەڵامدا دەڵێین: ((هۆكارەكەی فەلەسەفەی پەروەردە و خوێندنی رۆژئاواییە، كەدەزگاكانی عەلمانی لەوڵاتی ئیسلامیدا كاردەكەن و بەهەموو شێوەیەك قۆرخی هەموو ئۆرگان و دەزگاو راگەیاندن و تەنانەت خوێندن و زانكۆ، تەنانەت نوسراوەكانیشیان كردووە لەرووی كتێب و گۆڤار و رۆژنامەكانەوە..))
كەواتە ئەوەی ئێستا پەخشدەكرێت ئاكاری ئیسلامی نیە، بەڵكو ئاكاری عەلمانیە لەناو جیهانی ئیسلامیدا بۆیە رۆژێك خەڵكەكە لەسەر پراگماتیكی و جارێكیتر لەسەر میسالی جارێكی دیكە لەسەر مادی و ماوەیەكی تر لەسەر وجودی پەروەردە دەكەن، گەلی موسڵمانیان لەنێوانی زەوی و ئاسماندا وەستاندوە نەئەوەیە بڵێین موسڵمانین نەئەوەیە بوێرن لەبەر خەڵكە موسڵمانەكەش حاشا لەئیسلامەكەش بكەن[٦١].

## بناغەی چوارەم: سەروەت وسامان و ئابووری:

گوتاری ئابووری ئیسلامی بۆ پاراستنی سەروەت و سامانی خەڵكی و ئابووری وڵاتە بەگشتی دابەشكردنی داهات و كانزا و بەروبوومەكانی زەوییە بەدادپەروەرانە، پاشان چاودێریكردنی و پاراستنی لەهەموو كارەساتێكی سروشتی، یاخود بەهەدەربردنی، یان قۆرخ كردنی (مۆنۆپۆڵ)..
سیمای گوتاری ئابووری بەشی سەرەكی لەسیستەمە ئابوورییەكەوە سەرچاوە دەگرێت، لەبەرئەوەی سیستەمی ئابووری ئیسلامی گوتارەكەی بریتییە لە

[٦١] السياسه ولحكم د. حسن الترابي.. سوودم لەكۆتایی كتێبكەی وەرگرتوە كەومك فەرهەنگی زاراوەی سیاسی بەكاری هێناوە...ل ٤٧٣-٤٧٩

هەڵسوکەوت و ئاکاری ئیسلامی کە لەڕاستیدا لکاوە بەبیروباوەڕ و ڕەوشتی ئیسلامییەوە، لەبەکارهێنانی داهات و دەسکەوتە مادییەکان، کەپێداویستی و تێرکردنی مرۆڤەکانە.

گوتاری ئابووری ئیسلامی سەرچاوەکەی لەبیروباوەڕەوەیە، دیدو تێڕوانینێکی هەر دوو ژیان ئەداتە مرۆڤی موسڵمان لەم جیهانە و لەڕۆژی قیامەتدا، هەنگاو هەڵدێنێتەوە لەسەر قورئان و سوننەت، ئەم سەرچاوەیە لەقورئان و سوننەت شیکار و لێوردبوونەوەی زۆری نەداوە، تا ببێتە زانستێکی ئابووری، بەڵکو بنەماکانی زانستی ئابووری دەستنیشانکردوە و ئەوەیتری لێگەڕاوە بۆ مرۆڤەکان کەئیجتیهاد و لێوردبوونەوە و لێکۆڵینەوە دەربارەی بکەن، دەیان زانا و ئابووریناسی گەورە لەجیهانی ئیسلامیدا ناوو ناوبانگی هەیە، کەهەموو خاوەن پەرتوك و تیۆری ئابووری سەربەخۆن لەسەر بنەمای قورئان و سوننەت[٦٢].

گوتاری ئیسلامی لەمەڕ ئابووری و سەروەت و سامان، ڕێنمایی لەبیروباوەڕی ئیسلامیەوە وەردەگرێت، کەسنور و چوارچێوەکە پەیوەندی هەیە بەبەخشین و پاشەکەوتکردن، خوای

موتەعالیش دەفەرموێت: ﴿ولاتَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلاَ تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا﴾ ٢٩ الاسراء

واتە: نەکەی ئەوەندە دەست نوقاو بیت وەك ئەوەی کەدەستی بەکۆت و زنجیر بەگەردنیدا هەڵواسرابێت، هەروەها ئەوەندەش دەستت پان مەکەوە، دەستبڵاو مەبە کە هیچت بەدەستەوە نەمێنێت، لەوەودوا بکەویتەبەردەم لۆمەو سەرزە نشتی ئەم و ئەو، وە هیچت بەدەستەوەنەمێنێ و بەهەناسەساردی و نائومێدی بۆی دانیشی.

---

[٦٢] أ.د.عبدالجبار السبهاني -سمات الاقتصاد الإسلامي- ل٧

## جیاوازی گوتاری ئابووری ئیسلامی و سەرمایەداری

بۆ دەرخستنی گوتاری ئیسلامی ئابووری پێویستە بەراوردێك لەنێوان سیستەمی ئێستای ئابووری کەسەرمایەداریە لەجیهاندا و سیستەمی ئابووری ئیسلامی بکەین بۆ ئەوەی گوتارەکەمان لەرێگای ئەو بەراوردەوە بۆ بەرجەستە ببێت.

لە سیستەمی سەرمایەداریدا توانا و کۆششەکان بۆ بەرژەوەندی تایبەت و کەسایەتیە دەوڵەمەندەکان و کۆمپانیا زەبەلاحەکانیانە. گوتاری سەرمایەداری پێیوایە کاتێك بەرژەوەندییە تاکە کەسیە تایبەتەکان هاتەدی، ئەوا بەرژەوەندی گشتی دێتە دی بۆ کۆمەڵگە!

زانای ئابووری ناسی جیهانی ( ئادەم سمیس) دەڵێت: ئێمە رەچاوی ئەوەناکەین کەقەسابێك یان نانەوایەك رێزمان بگرێت یاخود خێرمان پێبکات و نانی ئێوارە مان بداتێ، بەڵام ئێمە چاوەرێی ئەوەدەکەین بیکەن، ئەویش لە روانگەی بەرژەوەندی شەخسی خۆیانەوە. ئێمە ئینسانیەتی ئەوان نادوێنین، بەڵام خۆشە ویستی ئەوان بۆ خۆیان دەجوڵێنین، هەروا باسی پێویستیەکانمان ناکەین، وەلێ باس لەقازانجی ئەوان دەکەین!))[٦٣]

بەراوردەکە زیاتر لێرەوە دەردەکەویت لەگوتاری ئابووری ئیسلامیدا، ئەویش لەسەربنەمای بەندایەتی هەنگاو هەڵدێنێتەوە.

چالاکی ئابووری ئیسلامی سەرچاوەکەی بەندایەتیە، کاروکرداری بازارو وەبەرهێنان لەئیسلامدا بەندایەتیەکی گەورەیە و بەو هۆکارە مرۆڤ دەتوانێت لەپەروەردگاری نزیك ببێتەوە، هەر بەهۆکاری خزمەتەکانی کەدەیکات بەکۆمەڵگاکەی، پێچەوانەکەشی، هەر گەندەڵی و فەساد و چەواشەکاری و فرت و فێڵێك خاوەنەکەی بەرمو سەرگەردانی و سەرلێشێواوی دنیاو قیامەت دەبات. تیۆری ئابووری ئیسلامی گرنگی دەدات بەبەرژەوەندی خەڵکی و کۆمەڵگا بەگشتی پێش ئەوەی بەرژەوەندی تاکە کەس بپارێزرێت. پێغەمبەری خودا -

---

[٦٣] أ.د.عبدالجبار السبهاني -سمات الاقتصاد الإسلامي- ل٩

صلی الله علیه وسلم- دەفەرموێت: (لا يؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه)

واتە: کەسێکی موسڵمان ئیمانی دامەزراو نابێت، تا ئەوەی بۆ خۆی پێیخۆشە بۆ برا موسڵمانەکەشی پێیخۆشبێت.

## سیمای گوتاری ئابووری ئیسلامی:

یەکەم: گوتاری ئابووری ئیسلامی جیاکاری لەنێوانی ئامانج و کەرەستەدا دەکات بەڕوونی، چالاکی بەرهەمە ئابووریە ئیسلامیەکان ئاراستەی بەکارهێنەر دەکات، بەکارهێنەر مەبەست بەچالاکی پارە و سەروەت و سامانە، بۆ ئەوەی کەسێکی تەندروست چالاکی گەورەی هەبێت بۆ خزمەتی زیاتر، نەك بەتەنها لەپێناوی سوود و قازانج، بەڵکو ئامانجی گوتاری ئابووری ئیسلامی زیاتر پەیوەندی هەیە، بەبیروباوەڕەوە بۆ ئەوەی ڕزق و کەرامەتی مرۆڤ پارێزراوبێت، لەسەر بنەمای گوتاری قورئانیە، چونکە مرۆڤ خوای گەورە ڕێزی گرتووە و کەرامەتی پاراستووە، «ولقد كرمنا بني آدم...» ٧٠ الاسراء

پاشان مرۆڤ ئاوەدانەکەرەوە و جێنشینکراوی فەرمانی خوای پەروەردگارە لەسەر زەویدا (وإذ قال ربك للملائكة إني جاعل في الأرض خليفة) ٣٠ البقرە

لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ هەموو کارەکانی بۆ بەندایەتیە، جا یەکێك لەکارەکانی مرۆڤ بژێوی ژیانە، بەتاك و کۆمەڵ ئەمەش لەچوارچێوەی سیمای گوتاری ئابووری ئیسلامیدایە، (وما خلقت الجن والأنس إلا ليعبدون) ٥٦ الذاريات..

دووەم: سەروەت سامانە گشتیەکان، بۆ هەمووانە، موڵکایەتی زەوی و زار بۆ هەمووانە، بەیەکسانی دابەش دەکرێت بەپێداویستی مرۆڤەکان، پاشان تێرکردنیان لەپێداویستی ئابووری و سەروەت و سامان بەیەکسان و بەچاوی هاونیشتیمانی، بێ ڕەچاوکردنی ڕەگەز و جۆری پێست و تەنانەت بیروباوەڕیش.

سێیەم: سیمای گوتاری ئابووری کاروچالاکیەکانی کۆمەڵایەتیە، یاخود موڵکی و تایبەتە بۆ هیچ کەس نیە، دەست بگرێت بەسەر سەروەت و سامان و قۆرخکردن و چەواشەکاری، بەڵکو ئاراستەی کۆمەڵگە دەکات بەوەی نە زەرەر بدات لەخۆی و لەکۆمەڵگە و بنەمای (لا ضرر ولا ضرار...) بەکاردێتەوە، جەخت لەسەر پابەندبوون بەئەحکام و باسە بابەتیە ئابوورییەکان دەکاتەوە.

چوارەم: گوتاری ئابووری ئیسلامی لەسەر بنەمای پێکەوە ژیان و مافە جیاوازەکان هەنگاو هەڵدەنێتەوە، وەك ئاوەدانکردنەوە و دادپەروەری و کارکردن و موڵکە تایبەتەکان و پێداویستیەکان، هەموو ئەمانە لەسەر سیستەمی دابەشکردنی ئیسلامی سەرچاوە دەگرێت. کارکردن و موڵکایەتی بەشێوەیەکی ڕەوا هەردووکیان پێکەوە دابەشکەری فەرمان و چالاکییەکان لەناو کۆمەڵگای موسڵماندا و ئەم دوو سەرچاوە موڵکایەتی و کارکردن سەرەکیترین کارو چالاکی و تەوزیفکردنی خەڵکیە بەگشتی و لەهەمانکاتدا وەبەرهێنان و دەستکەوت و سوودەکانە، بەڵام بەو شێوەیەی کەگوتاری سیاسی ئیسلامی لەڕووی ئابووریەوە داوای دەکات.

پێنجەم: گوتاری ئابووری ئیسلامی لەڕێگای توانامەند و خەڵکی پسپۆڕ لەبوارە جیاوازەکاندا و دادپەروەی لەڕووی دابەشکردنی کارو چالاکییەوە، ئەمەش وادەکات بەکارهێنەر و سوودمەند، سوودی باش وەربگرن، ئەرکی ڕێکخستنی ئەم پرۆسەیە لەڕێگای حکومەتەوە دەکرێت بۆ ئەوەی بەرپرسیارێتی لەئەستۆدا بگرێت، تا دادپەورەی و یەکسانی لەئابووریدا بچەسپێنێت بۆ خەڵکی بەگشتی.[٦٤]

---

[٦٤] موسوعة الاقتصاد الإسلامي في المصارف والنقود والأسواق المالية(ب٣...ل ١٣٥)

## ئیسلام و گشتگیری (شمولی)

ئاینی پیرۆزی ئیسلام گشتگیرە، شمولیە، باس و خواستی تایبەتی هەیە لەسەر هەموو فەرهەنگەکانی ژیان و ڕەهەندەکانی هەر لەتاکە کەسەوە تا دەگاتە دەسەلات و حوکمڕانی، لەئاو خواردنەوە تا دەگاتە پەروەردەکردنی منداڵ لە کۆمەڵگاوە تا دەگاتە دامەزراندنی سوپا.

ئیسلام هەموو سیستەمە کۆمەلایەتیەکانی لەخۆگرتووە لەسیستەمی سیاسی و ئابووری و سەربازی و دبلۆماسی..هتد، چارەسەری پێیە بۆ هەموو کێشەکان، ئیسلام دین و دەوڵەتە، ئاینێك نیە پێکهاتبێت لەهەندێك بیرو بۆچوونی کەهەنوتی و گۆشەگیر بێت و تەنها لەبواری بەندایەتی و هەندێك سروت و توقصاتی دینیدا بوونی هەبێت، ئیسلام پێچەوانەی هەموو ئاینەکانی تری ئێستای سەرزەوییە، پێغەمبەرەکەی فەرمانڕەوا بوو، وەزیری هەبوو، ڕاویژکاری هەبوو ڕاوێژیان کردوە، دەستورەکەی سیمای هەموو ڕەهەندەکانی ژیانی تێدا دەستنیشانکراوە، دامەزراوەی سوپا و یاسا مەدەنیەکان لەمیرات و تەلاق و نیکاح... هتد لەخۆ گرتووە.

کاری دبلۆماسی و ئەتەکێتی دەوڵەتبوون و جۆری مامەڵەکردن سیاسی و گۆڕینەوەی نامە و دیدو بۆچوون لەگەڵ سەرکردە و زلهێزەکانی دنیادا ئەنجامداوە، ئاگاداربوون بەڕەوشی سیاسی ناوچەکە و جیهان بەگشتی.. لەدوای پێغەمبەرەکەی - صلی الله علیه وسلم- خەلیفەی پێغەمبەر دەستنیشانکراوە، دوای خەلیفە ئەبوبەکر، ئەمیر و لێپرسراوی ئیمانداران دەستنیشانکراوە کەعومەر بووە، بەدوایاندا حوکم و دەسەلاتی جۆراو جۆر لەناو خودی سیستەمی سیاسی ئاینی ئیسلامدا بوونی هەبووە، ئەزمونێکی دوورو درێژی هەیە لەبەڕێوەبردن و لەسیاسەت و لەڕووی سەربازی و لەڕووی ئابووری..هتد. کەواتە ئیسلام ئاینێکی گشتگیرەو خوای گەورەش ٧٢ جار باسی دەسەلات و حوکمی کردوە لەناو قورئاندا... هەروەها پەروەدگار ڕاستەخۆ لەقورئاندا ئاماژەی بەگشتگیری ئیسلام کردووەو دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ ١٦٢ الانعام

واتە: ئەی پێغەمبەر صلی اللەعلیە وسلم، ئەی ئیماندار بڵێ: بەڕاستی نوێژو خواپەرستی و ژیان و مردنم بۆ خوا، پەروەردگاری جیهانەکان تەرخان کردووە.

### ئیسلام بۆ ئەوە هاتووە کۆیلایەتی نەهێڵێت:

خوای گەورە بەئازادی مرۆڤی دروستکردوە، ئازادی دراوە بەهەموو کەس لەژیاندا، کەس کۆیلەی کەسێکی تر نیە، ئەمەش لەئیسلامدا وا سەپێنراوە کە لەبنەڕەتدا هەموو کەس ئازادە، لەهەڵسوکەوتی، لەهەڵبژاردنی، لەویستی، لەئارەزووی، لەهەموو فەرهەنگەکانی ژیاندا مرۆڤ ئازادە سەراپا، هیچ کەس لەم ژیانەدا هیچی بەسەردا نەسەپێنرێت بۆکارکردن، مەگەر ئەوەی ویست و ئارەزووی خۆی لەسەریەتی بەئازادی دەیکات.
لەسەر بوونیادی ئەم ئازادییە: مرۆڤ لەویست و ئارەزوەکانی خوای گەورە لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکات، خۆ ئەگەر کەسێك هەر شتێکی بەزۆردا بسەپێنیت و زۆرە ملێ بێت لەهەڵبژاردنی خۆی و ئارەزو و ویستی خۆی نەبێت ئەوا پێی ناوترێت ئازادی، یان بەهێز کاری پێبکرێت، لەچوارچێوەی ئازادی و ماف دەچێتە دەرەوە، کەواتە خوای گەورە لەسەر ئەم بنەمایە لێپرسینەوە لەگەڵ مرۆڤەکان دەکات لەقیامەتدا، پێغەمبەرمان - صلی اللە علیە وسلم- لەمبارەیەوە دەفەرموێت: (إن الله تجاوز لي عن أمتي الخطأ والنسيان وما استكرهوا عليه).
واتە: خوای گەورە قەڵەمی لێخۆشبوونی هێناوە بەسەر هەڵەو بیرچوونەوەو بەزۆر لێکردن ئوممەتی ئیسلام.
ئەگەر مرۆڤ بەزۆر کارێکیان پێکرد لەدەسەڵات و ئارەزوی خۆیدا نەبوو، ئەوا بەزۆر دەیسەپێنێت بەسەریدا، لەمبارەشەوە کەبەزۆر کار بەمرۆڤ بکرێت ئازادی تێدا لەدەستبدات، لەئیسلامدا بەمە دەوترێت. زۆرەملێ و ئیجبارکردن، بەپاساو بۆ خاوەنەکەی دەگەڕێتەوە. خوای گەورە لێیخۆش دەبێت، پێچەوانەکەشی ئەوەیە کەمرۆڤ بەئارەزو و وسیتی خۆی کار ئەنجام بدات، ئەوا خوای گەورە لێپرسینەوەی لەسەر دەکات، چونکە خۆی هەڵیبژاردووە دەبێت توانای

وەڵامدانەوەی هەبێت لەقیامەتداو بەرپرسیاریەتی لەئەستۆ بگرێت، یاخود دەبێت چاوەڕوانی پاداشت و سزابێت لەسەری.

بە لەدایکبوونی پێغەمبەری ئیسلام- صلی الله علیه وسلم- ئازادی دەستپێکرد، کاتێك هەواڵی لەدایکبوونی محەمەدیان دایە مامی لەخۆشی لەدایکبوونی کۆیلەیەکی ئازادکرد.!

پاشان وەك پەیامێك بۆ مرۆڤایەتی ئەو کەسەی کەکۆیلە بوو لەماڵی پێغەمبەردا- صلی الله علیه وسلم-، سەرووەرمان کردیە کوڕی خۆی.. ئەو بوو کەرایگەیاند ئیتر کۆیلایەتی باوی نەماوە.

لەناو عەرەبدا شەریفەکانی قورەیش لەسەر "موزدەلیفە" دەوەستان، خەڵکی کۆیلە و جێگاکانیتر لەکاتی حەجدا لەسەر "عەرەفات" دەوەستان، بەڵام پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم- ئەو چینایەتیەی نەهێشت، بەڵکو بەپێویستی دانا دەبێت هەموو مرۆڤەکان وەك یەك لەیەك جێگادا دەبێت ڕابوەستن، لەناو عەرەبدا ئەوەی خەڵکی ئەو ناوچە و بەتایبەت قورەیش نەبوایە ئەوا کویلە و ژێردەستەی قورەیش و شەریفەکانی مەککە بوون، پێغەمبەرمان -صلی الله علیه وسلم- ئەو دیدو بۆچوونەشی کۆتایی پێهینا، بیلالی حەبەشی بەپێی پەتی خستە سەر کەعبەو بانگی پێدا لەسەر کەعبەدا، ئەو پەیامە بۆ مرۆڤایەتی بوو، کەکۆیلایەتی لەئیسلامدا کۆتای هات، مرۆڤ ڕێزی هەیە وە دەبێت ڕێز لەئازادییەکانی بگیرێت، سەلمانی فارسی کۆیلەی جولەکەیە ئیسلام ئازادی دەکات، پاشان دەبێتە گەورەترین سەرکردەی سەربازی ناو هەموو قورەیش و شەریفەکانی، پاشان لەوە گەورەتریش سەرووەرمان لەبنەماڵەی خۆی هەژماری دەکات، سوهەیبی ڕۆمی لەدوای ئەوەی کرێکارێکی دەست ڕەنگین بوو لەناو قورەیشدا، بەڵام بۆ ئازادبوونی خۆی لەناو ئیسلامدا هەموو سەروەت و سامانی خۆی دەبەخشێت، تەنها بۆ ئەوەی لەگەڵ ئیسلام و موسڵماناندا ژیان بکات، ئیتر تام وچێژی ئازادی دەکات.

شەریعەتی ئیسلام هات، وەك سەرەتایەك کڕین و فرۆشتنی مرۆڤی ئازادی قەدەغە کرد: واتە ئەو کەسەی کەکۆیلە نیە نابێت بکرێتە کۆیلە، لەسەر بنەمای

ئەو ئایەتە حەرامیکرد کەدەفەرمویت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ ١٣ الحجرات

واتە: ئەی خەڵکینە ئێمە هەمووتانمان لەنێرو مێیەك دروستکردوە کە باوکە ئادەم و دایکە حەوایە، کردوومانن بەگەلان و تیرەو هۆزانی جۆربەجۆر، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بەیەکەوە، بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا ئەوە تانە کە زۆرتر لەخوا ترسەو فەرمانبەرداری خوایە، بێگومان خوا زانا و ئاگایە بە هەمووان.

هەروەها بەتاوانە گەورەکان ئاماژەی پێکردووە هەرکەس کەسێکی ئازاد بکاتە کۆیلە، واتە: وەك مرۆڤ کوشتن و زینا و... هتد وایە، لەئیسلامدا یاسا دانراوە بۆ کۆیلەکان، بەیاسا ڕێکیخستووە، کەدەبێت پەیمان لەگەڵ هەموو کۆیلەیەکدا ببەسترێت و دوای ئەو ماوەیە ئازاد بکرێت ئەگەر پیاو بوو، بەڵام بۆ ئافرەت هەمانشێوەیەوە ئاسانکاریەکی تر کراوە لەیاسای ئیسلامدا. ئافرەتان دوای شوکردنی و منداڵبوونی لەکۆیلە دەردەچێت، هەرگیز کڕین فرۆشتنی پێناکرێت، یاخود لەیاسای ئیسلامدا ئەگەر بەگاڵتەوە بەکۆیلەکەت بڵێت ئازادی ئەوا دەست بەجێ ئازادە، بەمەرجی یەك شاهید ئاگاداربێت، یان هەر کەسە لەکۆیلەکەی بدات بەلێدانی ئەگەر ئازاریشی پێنەگات لەئیسلامدا ئازاد دەبێت، بێجگە لەوەی کەدەبێت مامەڵەی وەك مرۆڤە ئاسایەکانیتری لەگەڵدا بکات و، نابێت ماندووی بکات، یاخود ئافرەتانی کۆیلە و کەنیزەك بۆ کاری خراپەکاری بەکاربهێنرێت (لەش فرۆشی)، دەست بەجێ قازی لەئیسلامدا ئازادیان دەکات، ئەم یاسایانە لەئیسلامدا مانای وانیە ئیسلام بڕوای بەکۆیلایەتیە، بەڵکو ئیسلام دژی کۆیلایەتیە، بەڵام مامەڵەکردن لەگەڵیدا جیاوازە لەگەڵ باوەڕبوون پێی!

لەئیسلامدا بۆ ئەوەی بنبڕ و کۆتایی ئەو کۆیلایەتیە بکات بەدەیان هەوڵی داناوە بۆ ئازادکردنیان، هەر مرۆڤێك کەفارەتی تاوانێکی بکەوێتە سەری، یاخود لەبەندایەتیەك کەفارەتەکەی بدات، دەبێت کۆیلەیەك ئازاد بکات[٦٥]..

کاری پێغەمبەران بۆ ئازادی و بەدەستهێنانی مافی مافخوراوان بووە. ئەگەر بەوردی تەماشای ئاینی هەموو پێغەمبەران بکەین هەر بۆ ئازادی مرۆڤەکان هاتوون و دەیانەوێت لەکۆیەلایەتی مرۆڤەوە ئازادیان بکەن بۆ بەندایەتی خوا..

چونکە فیرعەون هەموو جولەکەکانی کردبووە کۆیلە وە ئازادی لێگرتبوونەوە زۆرێك لەو هەرەمە گەورانەی میسر بەدەستی کۆیلە جولەکەکان دروستکراوە!!

خوای گەورە ئەم وێنایەمان بۆ باس دەکات لەقورئاندا دەفەرموێت: (وَإِذْ نَجَّيْنَاكُم مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوَءَ الْعَذَابِ يُذَبِّحُونَ أَبْنَاءكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءكُمْ وَفِي ذَلِكُم بَلاء مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ) . ٤٩ البقرة

واتە: بیری نیعمەتی ڕزگاربوونیشتان بکەنەوە کاتێك ڕزگارمان کردن لەدەست دار و دەستەی فیرعەون، کە خراپترین سزا و ئازاریان دەدان، کوڕەکانتانیان سەردەبڕین و ئافرەتەکانتانیان دەهێشتەوە (بۆ کارەکەری و خزمەت) ئەوەی

---

[٦٥] لێکۆڵینەوەیەك لەسەر ئازادی، گۆڤاری ڕێگای هزر، ژمارە ٤، ل ١٦٠

- تێبینی: لەماوەیەکی دیاری کراودا لەئیسلامدا کۆیلایەتی کۆتایی هات، ئەو یاسایانەیشی کەلەئیسلامدا هاتوون، هەمووی بەنەمانی ئەو ڕەوش و حاڵەتە یاساکان مردوون، ئەگەر ئەم تێزە ڕاست بێت، لەیاسای نەرویجیەوە ئەو عیبارەتەکە وەرگیراوە کەیاسایەك بۆ ماوەیەك کاری پێنەکرێت ئەوە دەڵێن ئەو یاسایە مردوە. گریمان ئەگەر دوژمن لەجەنگدا لەگەڵ موسڵماندا دیلیان دەکات یاخود کۆیلە، ئەگەر دیل بوو ئەوە یاسای دیلیان بەسەردەسەپێنێت ـ ئیسلامیش یاسای دیلی هەیە وەك دیل مامەڵە لەگەڵ دوژمنەکانی دەکات، خۆ ئەگەر وەك کۆیلە مامەڵەی لەگەڵ کردن ئەو دەمە قازی موسڵمانان یاخود خەلیفە ئەو یاسایە زیندو دەکاتەوە. یان بەدەنگی ئوممەتی موسڵمان زیندو دەبێتەوە، وەك نموونەی(ئیمزا).

- تێبینی: ئەم تێزانە واتا بەکارهێنانی ووشەی مردو وەك عیبارەت لەڕووی یاساییەوە لەشەرع وەر نەگیراوە، بەڵکو لەپەرەگرافە یاسایە نەرویجیەکان وەرگیراوە.

ئێوە تووشتان هات تاقیکردنەوەیەکی گەورەبوو بۆتان لەلایەن پەروەردگارتانە وە تا پشت بەو زاتە ببەستن و بڕوای تەواوتان پێی هەبێت.

لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت خوای گەورە پێغەمبەری ناردووە بۆ ئەوەی مرۆڤەکان ئازاد بن لەدەستی زاڵم و فیرعەونەکان ڕزگاریان بێت. هەر بۆیە فیرعەون دەیەوێت منەت بکات بەسەر موسادا پێی دەڵێت: ((ئەوە نیە تۆم نەکردۆتە کۆیلەی خۆم و ئازادی تەنانەت لەماڵی مندا گەورە بوویت..))

پێغەمبەر موسا ـ سەلامی خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: ((بێگومان لەسەر زمانی ئەو لەقورئاندا بۆمان باسکراوە. خوای پەروەردگرمان بۆمان دەگێڕێتەوە: (وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ ) ٢٢ الشعراء

واتە: ئەو (بەخێوکردنەشم) ناز و نیعمەتێك نیە کە منەتم بەسەردا بکەیت. چونکە بەهۆی ستەمی ئێوەوە بووە کە لەدایك و باوکم دوورخرامەوە. چونکە تۆ نەوەی ئیسرائیلت کردۆتە بەندەی خۆت و زەلیلت کردوون. وا منت کۆیلە نەکردوە هەموویان کۆیلەن یەك کەس چیە؟ ئەم منەتە چیە دەیکەیت بەسەرمدا گەلەکەم زۆرترە.

کەواتە ئیسلام هاتووە ـ بۆ ئەوەی کۆت و پێوەند و زنجیرەکان بکاتەوە کەمرۆڤەکان لەمرۆڤەکانیانەوە ئاڵاندووە. یاخود بۆ ئاسانکردنی دابونەریتەکانی کۆن و ئەو یاسا قورسانەی کە بەسەر گەلانەوە هەیە..

خوای گەورە لەبارەی ئەوانەشی کەبەزۆر وازیان پێهێناون لەبیرو باوەڕەکەیان ئەوا لێیان خۆشدەبێت..

(مَن كَفَرَ بِاللّهِ مِن بَعْدِ إيمَانِهِ إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ) ١٠٦ النحل

واتە: ئەوەی پاشگەزبێتەوە لەخواناسی، دوای باوەڕهێنانی، جگە لەوانەی کەبەزۆر وشەی کوفر دێت بەزاریاندا دڵیان پڕە لەئیمان و دامەزراوی.

کەواتە مرۆڤ ناتوانێت لەدوو جێگاوە ئاڕاستە وەربگرێت. یان دەبێت کۆیلە بێت یاخود دەبێت بەندەی پەروەردەگار بێت. خوای موتەعال دەفەرموێت: (قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادةً قُلِ اللّهِ) ١٩الأنعام واتە: ئەی پێغەمبەر بەوانە بڵێ کە

شایەتییان دەوێت لەسەر پێغەمبەرایەتی تۆ، کێ هەیە گەورەترین و ڕاسترین شایەتی بدات؟! هەر خۆت بڵێ: خوای گەورە شایەدە لە نێوان من و ئێوەدا.. یاخود خوای گەورە باسی بنچینەی کاری مرۆڤ دەکات کەبۆچی دروستبووە (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ) ٥٦ الذاريات واتە: بێگومان من پەری و ئادەمیزادم دروستنەکردوە بۆ ئەوە نەبێ، کە هەمیشەو بەردەوام هەر من بپەرستن و فەرمانبەردارم بن، کەواتە تەنها بۆ بەندایەتیە[٦٦].

## ئازادبوون بەندایەتی خوایە

بەندایەتی چیە؟

مرۆڤ کەدەبێتە بەندەی خوا لەکۆیلەیەتی بەتەواوەتی ڕزگاری دەبێت..

چۆن؟

کاتێك مرۆڤ دەبێتە بەندەی خوای خۆی، لەکۆیلەیەتی هەموو دروستکراوەکان ڕزگاری دەبێت، ئەوکاتە مرۆڤ سەربەستی تەواوەتی بەدەستهێناوە. ئەم وشەیە هاوەڵان باش لێ تێگەیشتبوون، کاتێك چوون بۆ ڕزگاری گەلان، دەیانفەرموو هاتوین بۆ ئەوەی لەکۆیلایەتی بەندەکانەوە ڕزگارتان بکەین، هەموومان ببینە بەندەی خوا وەك یەك یەکسان بین، لەناڕەحەتی دونیا ڕزگارتان بکەین، تاخۆشنودی و کامەرانی لەبەندایەتەوە وەربگرن بۆ دونیاو قیامەتتان، هەروەها هاتوین بۆ ئەوەی ڕزگارتان بکەین لەهەموو دین و باوەڕەکانیتر، بانگتان بکەین بۆ دادپەروەری ئیسلام، ئەمە گوتاری سیاسی موسڵمان بووە بەدرێژای مێژوو ئێستاشی لەگەڵ بێت... (لقد ابتعثنا الله لنخرج من شاء من عبادة العباد إلى عبادة الله، ومن ضيق الدنيا إلى سعتها، ومن جور الأديان إلى عدل الإسلام).

---

[٦٦] الحرية.. محمد صالح المنجد ل٧

هەروەها عومەری کوڕی خەتاب ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: ((لەکەیەکەوە فێربوون کەخەڵکی بکەنە کۆیلە و ژێردەستە لەکاتێکدا بەئازادی لەدایك دەبن..)) (متى استعبدتم الناس وقد ولدتهم أمهاتهم أحرارا) ئەمە نیشانەی ئازادی ڕەهایە لەئیسلامدا بۆ مرۆڤ و چەندە کاریگەری لەسەر دەسەڵاتدارانی ئەم ئیسلامە داناوە..

عەلی کوڕی ئەبوتالیب ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرموێت: ((مەبە کۆیلەی هیچ کەس خوای گەورە بەئازادی دروستی کردویت)) (لا تكن عبد غيرك وقد جعلك الله حرا)

هەروەها خوای گەورە ئایەتی ناردە خوارەوە بۆ خاوەن پەرتوکە ئاسمانیاکان ببوونە کۆیلە و ژێر دەستەی ئەحبارەکانیان و پیاوە ئاینیەکانیان

(قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ) ٦٤ آل عمران

واتە: ئەی محەممەد - صلى الله عليه وسلم-. بەگاور و جولەکەکان بڵێ:((ئەی ئەوانەی پەرتوکتان بۆ ڕەوانەکراوە وەرن بەدەم بانگەواز و بەرنامەکەیەوە کە هاوبەش و هاوسەنگە لەنێوان ئێمەش و ئێوەشدا ...ئەویش ئەمەیە کە: جگە لە (الله) کەسیتر نەپەرستین، هیچ جۆرە هاوەڵێکی بۆ بڕیار نەدەین، وە هیچ لایەکمان لایەکەیترمان بەپیرۆزو فەرمانڕەوا دانەنێین و لەجیاتی ئەو زاتە نەیپەرستین، خۆ ئەگەر لەم بانگەوازەدا سەرپێچیان کرد و گوێیان پێنەدا، ئەوە پێیان بڵێ: کە ئێوە شایەت بن ئێمە موسڵمانین و ملکەچی فەرمانی پەروەردگارین)).

خوای گەورە باسی هەموو پێغەمبەرانی کردوە پلەی بەرزکردونەتەوە بەبەندەی خۆی بانگی کردون (وَاذْكُرْ عَبْدَنَا دَاوُودَ) ١٧ ص

واتە: چیرۆکی بەندەی خۆمان داود ـ سەلامی خوای لێبێت ـ یاخود بۆ سەروەری مرۆڤایەتی- صلى الله عليه وسلم- کەخوای گەورە پلە و پایەی بەرز کردۆتەوە بەبەندە ناوی هێناوە، چونکە ئازادبووە لەهەموو کۆلایەتی دروستکراوەکان، دەفەرموێت: (تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَى عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيرًا) ١الفرقان

واتە: بەرز و پیرۆز و پاك و بڵندە ئەو زاتەی کەجیاکەرەوەی حەقەلەناحەق، واتە: قورئانی دابەزاندووە بۆ سەر بەندەی خۆی - محەمەد صلی الله علیه وسلم- تا ببێتە هۆشیارکەرەوەی هەموو جیهان (تا ڕاستیەکان ڕوون و ئاشکرابن). یاخود لەجێگای تردا دەفەرموێت: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ الْكِتَابَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُ عِوَجًا) ١ الكهف.

واتە: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کەقورئانی بۆ سەر بەندەی خۆی - محەمەد صلی الله علیه وسلم- ڕەوانەکردوە، بەڕاستی هیچ کەموکوڕی و ناتە واویەکیشی تیا بەدی ناکرێت. نموونەگەلێکی تر هەیە لەمبارەوە لەسەر پێغەمبەرمان و هەموو پێغەمبەران ـ سەلامی خوایان لێبێت ـ.

**چەند وێنایەکی ئازادی کە ئیسلام بەخشیویەتی بەمرۆڤ:**

خوای گەورە ئازادی لەبەندایەتی و لەبوارەکانی تردا کەبەخشیویەتی بەمرۆڤ.. جیاوازی هەیە لەگەڵ هەموو دروستکراوەکانیتردا، ئازادی لەبەندایەتیدا مرۆڤ بەویست و ئارەزوی خۆی دەیکات؛ ئازادە لەکردنی و ئیرادەی خۆیەتی بەتەواوی، هەموو دەزانین ڕۆژوو مرۆڤی موسڵمان کاتێك بەڕۆژوو دەبێت لەوپەڕی ئازادی خۆیەوەیە کەس چاوی لێی نیە ئەگەرچی بەتەنهاش بێت، ئەو خۆی لەخواردن دەگرێتەوە ئەگەر لەژوورێکدا هەموو جۆرە خواردن و خواردنەوەیەکی لێبێت، ئەمەش لەبواری سایکۆلۆژی مرۆڤدا ئیرادەیەکی بەهێزی پێدەبخشێت دەتوانێت دەست بەسەر ئارەزووەکانیدا بگرێت، یاخود نوێژی بەیانیان هەموو مرۆڤێکی موسڵمان بەویست و ئیرادە و ئارەزووی خۆیەتی کەهەڵدەستێت، ڕاستە پاداشتی لەسەر وەردەگرێت ئەگەر نەیکات ئەوا سزا دەدرێت، خۆ سزاکە لەئێستادا بەرجستە نیە، بەڵکو باس لەمیتۆدو ژیانێکیتر دەکرێت، کە بەتەواوەتی جیاوازە لەم ژیانە و دونیایەدا..

کەواتە مرۆڤ بەتەواوەتی ئازادە لەهەموو بوارەکاندا، خوای گەورە هەموو ئازادیەکی بەخشیوە بەمرۆڤ بەرەهایی، مەگەر ئەوەی کەزیان بەخشە بەمرۆڤ و

زیانی کەسانیتر دەدات ڕێگری لێکردوە، بۆ ئەوەی ئازادی کەسانیتر بەهۆکاری ئازادی خۆتەوە پێشێل نەکرێت.

**ئازادیەکانی مرۆڤ:**

مرۆڤ ئازادە لەخواردنی، لەجلوبەرگی، لەهاتوچۆی، لەهەڵبژاردنی پیشەی، لەچۆنیەتی کارکردنی، لەکڕین و فرۆشتندا، لەوەی بەکرێی دەگرێت دەیداتە کرێ، کەواتە مرۆڤ لەهەموو هەڵسوکەتێکیدا ئازادە، تەنانەت ئازادە لەوەی ژن دەهێنێت یاخود شوودەکات، کێ هەڵدەبژێرێت، هەروەها، ئەم ئازادیانە ئیسلام بەرهەمی هێناوە بۆ خەڵکی بەگشتی، تەنانەت ئافرەت دەبێت ڕەزامەندی دەرببڕێت لەسەر هەڵبژاردنی هاوسەری، ئافرەت داوای خۆی لەسەر نەبوو ئەو پرۆسەیە بێ ڕەزامەندی ئافرەت هیچ ئەرزشێکی نیە و پرۆسەکە دانامەزرێت، پێغەمبەر-صلی الله علیه وسلم- دەفەرموێت: (**لا تنكح البكر حتى تستأذن، قالوا: كيف أذنها؟ قال: أن تسكت**).. واتە، مۆڵەت لەکچان بخوازن بۆ بەشوودانیان، فەرموویان: ڕوویان نایە، فەرمووی: بێدەنگ بوونی نیشانەی ڕەزامەندیەتی کەواتە: ئەگەر هەر شتێك کۆت و پێوەندکرا ئەوە گەشە ناکات، تاماوەیەك بڕ دەکات دوای ئەوە هەر شتێك بێت دەڕزێت، یاخود دەپوکێتەوە، هۆی گەشەی ئیسلام لەبەرامبەر هەموو بیر و بۆچونەکاندا و شارستانیەتەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ ئازادکردنی مرۆڤەکان.

بەڵام ئێستا لەشێوەیەکی هاوچەرخدا مرۆڤەکان کۆیلە دەکرێت، بەناوی ئازادیەوە، بەڵکو مرۆڤ کۆت و پێوەند دەکەن دوور دەکەوێتەوە لەو ئازادیەی کەخوای گەورە وەك دیاری بەخشیویەتی بەمرۆڤ هیچ پا و پێوەندێکی بۆ دانەناوە، بەڵکو کۆیلەکردنی ئێستا وەك سەدەکانی پێشوو نیە، بەزنجیر و کۆت و پێوەندیان بکەن لەکێڵگە و کارگە گەورەکاندا کاریان پێبکەن بەخۆڕایی، ئەم جۆرە بەندایەتیە لەسەردەمانی ڕابوردوودا بووە، بەڵام ئێستا مرۆڤ بەمۆدێرن

دەکەنە کۆیلەی بیروباوەڕی خەڵکانیتر، بەهۆکاری بیروباوەڕی مرۆڤەکانەوە دەسەڵاتی تەواوەتی دەکێشن بەسەر خەڵکانیتردا (هەیمەنەتی) خۆیان دەسەپێنن خەڵکی کۆیلەی بیرو بۆچوونەکانیان دەکەن.

بە ناوی ئازادیەوە خەڵکی هەڵدەخڵەتێنن لەڕاستیدا کۆیلایەتیە، هەندێك لەخەڵکی بەناوی ئازادیەوە بۆتە کۆیلەی شەهوەتەکانی، بەهۆکاری ئەم شەهوتەیەوە ڕەفتاردەکات شەهوەتەکەی ئاڕاستەی دەکات و دەیجوڵێنێت دایدەنیشێنێت، ڕەفتاری پێدەکات.

هەر شتێك ناو ناخی مرۆڤ لەتوانای خۆی بردە دەرەوە نەیتوانی دەست بەسەریدا بگرێت، ئەوە شەهوەتە و کۆیلەی دەکات.

## هەندێك نموونەی شەهوەت..

قسە کردن شەهوەتە.. خەڵکانێك هەن کۆیلەی قسە کردنن، لەوتەکانیاندا حەقت بۆ دەکەنە ناحەق و بەپێچەوانەوە ناحەق دەکەنە حەق، ئەم جۆرە بوونەتە کۆیلەی ئارەزووی قسەکردن، نموونەی زۆر هەن لەسەرکردەکانی ئەمڕۆ بەم شێوە ڕەفتار دەکەن سەروەت و سامانی خەڵکی بەناوی ئازادیی و دیموکراسی پاوەند دەکەن، سامانی ئەو خەڵکە بەهەدەر دەبەن و فەساد و گەندەڵی لەبەرچاوی خەڵکیدا دەرازێننەوە، مرۆڤ لەو جۆرە کۆیلایەتیە، تەنها بەبەندایەتی ڕزگاری دەبێت، دەتوانێت ئازاد بێت، لەبەرئەوەی چاودێرێك هەیە مافی خەڵکیتر پێشێل نەکات.

یاخود کۆیلەکانی شەهوەتی پارەو سەروەت و سامانی زۆرن، یاخود ئافرەت هەیە بەکیلۆ ئاڵتونی هەیە زۆرجار هەر بۆ ئەوەی زێڕەکانی زیاد بکات لاشەی خۆشی بۆ دەفرۆشێت و بۆتە کۆیلەی زێڕەکانی.

ئازادیی بۆخۆی غەریزەیە و حەزە، بەڵام خەڵکی واز لەئازادیی دێنێت و دەبێتە کۆیلەی شەهوەتەکانی، هەروەك ئاماژەم پێداوە، زۆرجار مرۆڤ ئەم شەهوەتانەی هەڵیدەسوڕێنێت، هانی ئەدات بۆ هەموو شتێکی قەدەغەکراو.. ئیتر دەبێتە کۆیلەی ئارەزووەکانی بەناوی ئازادییەوە.

هەیە کۆیلەی ئافرەتێکە، یاخود کۆیلەی پێکە عارەقەکەیەتی، یان مادە بێهۆشەکەرەکان، بۆ ئازادیەکەی خۆی کەدەیەوێت بەدەستی بهێنێت ماڵی خەڵکی تر وێران دەکات ئازادییان پێشل دەکات و دزی دەکات بۆ تێرکردنی حەزەکانی، ئیتر هەموو ئەمانە ناتوانن تەندروستانە مامەڵە لەگەڵ دروستکراوەکاندا بکەن دەبنە بەندەی هەموو دروستکراوەکان و کۆت پێوەندی ئافرەت و عارەق و مادەی بێهۆش و پارە و جلوبەرگ دەبێت.

دەبێتە دز بۆ ئازادیی رەها بۆ ئەوەی حەزەکانی تێربکات، پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: (تعس عبد الدينار، تعس عبد الدرهم) واتە: خەڵکانێك هەن بەندەی دینار و دەرهەمن یاخود (تعس عبد الخميلة، تعس عبد الخميصة) هەندێکی تر کۆیلەی جلوبەرگن.

یاخود هەیە عاشقە خەون بەعیشقەکەیەوە دەبینێت هەمیشە لەبیریایەتی، یاخود بۆ ئەو دەنوسێت بۆ خاتری ئەو دەژی و دەمرێت، ئەمە لەئاینی پیرۆزی ئیسلامدا کۆیلەیە ئازاد نیە، چونکە عاشقەکەی زنجیری کردۆتە ملی و بەئارەزوی خۆی رایدەکێشێت، بەڵام دینداری و بەندایەتی هەموو ئەم حەزانەی تێدایە و بەهەمان شێوەیە، بەڵام رێکیدەخات، مرۆڤ ئازادی خۆی لەدەست نادات.

بۆنموونە ئەو کەسەی ئارەزووی شەهوانی لەگەڵ ئافرەت، یاخود پێچەوانەکەی ئافرەتە حەزی بۆ پیاوە، لەئیسلامدا رێگەی پێدراوە، بەڵام لەرێگای پرۆسەی هاوسەرگیریی، ئەو کردارەی کەکەسێکی تر دەیکات هیچ رێکخستنێکی پێوە نیە، تەنها کۆیلەی حەزەکانیەتی ئەم کردارەی ناتەندروستە لەئیسلامدا بەزینا ناو دەبرێت، بەڵام هەر هەمان کردارە، چونکە رێکخراوە بەپرۆسەو گرێبەندێکی هاوسەرگیری مرۆڤ بەخێرو چاکە بۆی دەنوسرێت، کەواتە مرۆڤی موسڵمان لێرەوە ئازادیەکەی دەبینرێت و لەهەردوو دنیادا سەربەرزە و لەناو کۆمەڵگەیشدا. لە ئەنجامی ئەم لێوردبوونەیەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کەبەندایەتی بۆ خوا مرۆڤ ئازاد دەکات، ئیتر لەدنیا و دینار و لەخۆشییەکانی ژیان بەشێوەی ناتەندروست رزگارت دەکات.

زانایانی ڕەوشت بەتایبەت ئیمامی غەزالی زۆریان لەم نموونەیە باسکردووە کەمرۆڤ کاتێك ئازاد دەبێت بەمشێوەیە ڕەفتار بکات، کەدەفەرموون: پارە و سەروەت و سامان وەك گوێدرێژ وایە لای مرۆڤی ئازاد، تەنها کەرەستەن بۆ گەیاندنی پێداویستیەکانی مرۆڤ.

ژیانیش وەك جێگای دەست بەئاوگەیاندن (تەوالێت) وایە، کەمرۆڤ پێویستی پێبوو دەچێتە ناوی و خۆی بەتاڵ دەکاتەوە دێتە دەرەوە.

کەواتە مرۆڤ ئەوەندە پێداویستی بەگوێدرێژەکەیەتی، کە لەجێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تری بگەیەنێت، بەڵام خۆ ناکرێت ئەم گوێدرێژە لەناوماڵ و ژیان و لەسەر نانخواردن و هەموو ژیانی داگیربکات، تەنها بۆ پێداویستییەکەی خۆی بەکاریدەهێنێت.

تەوالێتش ناکرێت خەڵکی عاشقی ببێت بەهەمیشەیی لەو جێگایەدا بمێنێتەوە، تەنها بۆ کاتی پێداویستی خۆیەتی ناکرێت شەو و ڕۆژ لەو جێگایەدا بەسەر بەرێت.

زانایانی ڕەوشت دەڵێن: ((ئەگەر لەبەر خاتری هەر شتێك کارت بۆ کردو ژیانت بۆ تەرخان کرد، کەواتە تۆ بەندەی ئەو شتەی کە بە شوێنیدا وێڵیت، پێچەوانەکە ی بەندایەتی خوای گەورەیە، کەئازادی کردویت، هەموو شتەکانیتر لەقەزاو قەدەری خوای گەورەدا دەبینێتەوە باکت بەهیچ نیە لەم ژینەدا، چونکە ئازادی، ئەگەر مرۆڤ پەیوەستبوو بەپەروەردگارەوە بەدڵنیاییەوە ئازاد دەبێت، نموونەی ئەویشمان بینی کۆیلەکان پەیوەستبوون بەخواوە، هەموو ئازاد بوون، وەك: بیلال و سەلمان و سوهەیب ـ ڕەزای خویان لێبێت ـ ئەگەرچی کۆیلەبوون، بەڵام کەخوایان ناسی ئازاد بوون..

ئیتر ڕەوەند بەرەوەند شانازیە بۆ ئازادیخوازان.

**پێناسەی ئێمە بۆ ئازادی لەئیسلامدا**

چەمکی ئازادیی لەئیسلامدا واتای ئەوەیە کە لەبەر خوا خۆشەویستیمان بجولێت، لەبەر خوا ڕقمان هەڵسێت، لەبەر خوا ببەخشین، لەبەر خوا هەڵچین و توڕەبین، هەر بۆ خواش بژین، لەپێناویشیدا شەهید ببین، ئەم چەمکە پێویستە لەدڵماندا چەکەرە بکات، کە بەمشێوە بیرمانکردەوە ئەوا ئازادی لەناخماندا دەستپێدەکات، ڕزگارمان دەبێت لەکۆیلایەتی مرۆڤەکان و حەزەکان و دروستکراوەکانی دەوروبەرمان.

ئیسلام ئازادی ڕەهای نیە، بەڵکو چوارچێوەیەکی بۆ داناوەو بەیاسا ڕێکیخستووە بۆ ئەوەی کاریگەریی لەسەر مرۆڤەکان دروست نەکات.

**خوا پێنج چەمکی بەخشیوە بەمرۆڤ کەبریتیە لە:**

یەکەم: سروش (فیطرەت)

دووەم: ژیری (عەقڵ)

سێیەم: پەیام (قورئان)

چوارەم: پێغەمبەر

پێنجەم: ئازادی

کەواتە بۆئەوەی ئازادییەکە لەسەر ڕێڕەوی مرۆڤایەتی بڕوات دەستی بەسەردا بگیرێت نەچێتە ناو یاسای دارستان بەو چوار خاڵەکە (سروش و ژیری و پەیام و پەیامبەرە) ئازادی مرۆڤ ڕێکدەخرێت.

هەندێك لەدوژمنانی ئەم ئیسلامە هەندێك دروشم ئەدەن بەگوێی خەڵکیدا، نە بنەمای هەیە نەڕاستی وەك ئازادی بێ قەید وشەت.!

ئەمە لەکوێی دونیادا جێگای دەبێتەوە، هەموو ئازادییەکانی دونیا پێوەندێکی بۆ دانراوە، دەشێت لەوڵاتانی (پێشکەوتوو خوازدا) لاشەی ئافرەتان هەرزان فرۆش بکرێت، ئەشێت هەموو جۆرە مەی خواردنێك و چێژی خۆشییەکانی تێدا

بەدیبکرێت، بەڵام ئەم ئازادیانە لەجێگایەکەوە بۆ جێگایەکیتر گۆڕانکاریی بەسەردا دێت، دەبێت مرۆڤ رێز لەدابونەریت و عورف و ئاینەکانی بەرامبەر بگرێت، ئەگەر مرۆڤی موسڵمان بڕواتە ناو کۆمەڵگەی جولەکە نابێت قەدەغەکراوەکانی ئەوان بەکاربهێنێت ئەگەرچی لای موسڵمانیش رێگە پێدراوە (حەڵاڵە)، یاخود بوزی، یان مانگا پەرست، تەنانەت بۆی نیە ئەگەر قەدەغە بێت لەکۆمەڵگەیەکی وەك هیندستاندا بڵێ وەحا! چونکە رێزی کۆمەڵگەکە دەگرێت، خوای گەورە رێزی مرۆڤی گرتووە.

موسڵمانانیش کەئازادن رێزی ئازادی بەرامبەریان دەگرن، سنوری خۆیان دەزانن و سنوری بەرامبەریان نابەزێنن، بەڵام ئەم وتەیەی ئێمە مانای وانیە کەوڵاتی موسڵمانان هەمووی داگیرکراوە و ئازادی موسڵمان پێشلکراوەو ئیتر ممارەسەی بەهاکانی ئیسلامی نەکەین و ئەوەی کەبەسەرمانا سەپێنراوە بەناوی عەلمانەیەت و دیموکراسی...هتد ڕوبەڕووی ئەو فەرهەنگە نامۆیانە نەبینەوە.

ئیسلام ئازادی بەخشیەوەتە هەموو ئاینەکانیتریش، بۆ نموونە لەهەموو دونیادا تەنها ئیسلامە بەئاشکراو بێ پەردە لەناو قورئاندا باسی لەئاینەکانیتر کردووەو دانی بەماف و بوونیاندا ناوە.

بەڵام نابینی بەدڵنیاییەوە هیچ کام لەئاینەکانیتر مافی موسڵمان و دانیان نابێت بەئاینی ئیسلامدا کەئاینە!

ئیسلام تەنانەت دانیناوە بەئاینی مەجوسیەکاندا، لەسەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا مەجوسەکان هاتن داوای مافی ئاینەکەیان کرد. فەرمووی: چیتان دەوێت؟

داوایان ئەوە بوو لەئاینی ئەواندا «یاسای فیودەت» هەیە واتە: مەحەرەم لەیەکتر مارە دەکەن، دایك لەکوڕ و کچ لەباوك و خوشك و برا لەیەکتری..

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز فەرمووی: لەئاینەکەتاندا رێگەدراوە؟ گوتیان بەڵێ، فەرموی ئازادن ئەوەی لەئاینی خۆتاندا هەیە ئەتوانن ممارەسەی بکەن!

ئیسلام بەمشێوەیە ئازادی بەخشیەوە بەنەیارەکانی.

ئازادی لای موسڵمان هاوشێوەی بیروباوەڕەکانی تر نیە.

ئازادی لای موسڵمان ئەمانەتە، دادپەروەرییە، ڕاستگۆییە، واتە: بەمانا گشتیەکەی بەرپرسیارێتییە، دەرنەچوونە لەچوارچێوەی سروشتی مرۆڤ (فیترەت)، گەردن کەچیە بۆ ئەو زاتەی کەدروستیکردویت، دەرنەچوونە لەیاساکانی ئیسلام، گوێڕایەڵیت ئازادت دەکات، پێچەوانەکەشی گومڕاو کۆیلەت دەکات.

خوای گەورە لەسەر ئەم بڕگە یاسایە لەقورئاندا دەفەرموێت: (وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ)٣٦ الأحزاب

واتە: بۆ هیچ پیاوێکی ئیماندار یان ژنێکی ئیماندار، نیە کاتێك کەخواو پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێك بدەن ئەوان سەرپشك بن لەئەنجامدانی ئەو کارە، چونکە ئەوەی سەرپێچی بکات لەفەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی ئەوە ئیتر بە ئاشکرا گومڕاو سەرلێشێواوە. چونکە ئەگەر خوای پەروەردگار دادوەر بێت لەنێوانی مرۆڤەکاندا باشترە، یان مرۆڤ خۆی، بێگومان پەروەردگارمان.. سەید قوتب دەفەرموێت: ئەم قورئانە کەهاتووە لەگەڵ ناخی مرۆڤەکان ئاخافتن دەکات، بۆیە لێرەدا بڕگە یاساییەکەی تری ئیسلامی دێنینەوە لەباسی ڕێکخستنی ئازادیی، خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا )٥١ النور

واتە: بەڵام گوفتاری ئیمانداران کاتێك بانگ دەکرێن بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی، تا فەرمانڕەوایی بکات لەنێوانیاندا، تەنها ئەوەیە کە دەڵێن: بیستمان و گوێڕایەڵین بۆ هەموو فەرمانێکی شەرع، هەر ئا ئەوانەشن سەرفراز و سەرکەوتوو.

ناکرێت ئێمەی موسڵمانی ئازاد بەیاسای خوا و پێغەمبەرەکەی کەمینەیەك ئەم یاسایانەیان بەدڵ نیە بیسەپێنن بەسەرماندا و پێمانبڵێن: ((دەبێت یاسای میرات نەمێنێت، یان یاساکانی تری ئیسلام لەکۆمەڵگای ئیسلامیدا نەمێنێت، یاسای دەستکردی مرۆڤ بەسەرماندا بسەپێنن)).

ئازادیی موسڵمان لەهەموو جێگایەکدا پێشێلکراوە: لەیاسادا یاسای ئیرهابی بۆ دانراوە، لەزیندانەکاندا دووجار ئازادیی پێشێلدەکرێت بەناوی دیموکراسی و مافی مرۆڤ، گوانتانامۆ و ئەبوغرێب دوو نموونەی بەرجەستەی بەناو ئازادیخوازانن.

دیکتاتۆرە ڕمزا قورسەکان نموونەی پێشلکردنی مافەکانی مرۆڤی موسڵمانن، ئازادییان ماوەی چەندین ساڵ لەژێر پێیاندا دانابوو، ئەوانیش هەموو ئیدعای عەلمانی بوون و دیموکراسیان دەکرد.

ئازادیخوازان و دیموکراسیخوازن بۆ موسڵمان ئامادەبوون ئازادیان پێشێل بکەن و لەسەر سندوقی دەنگدان بۆ ئەوەی موسڵمانان دەرنەچن ئامادەی هەموو ساختە و تەزویرێك بوون، وڵاتی ئازادی و مافی مرۆڤەکان، عێراق و ئەفغانستان و سۆماڵ و چیچان و فەلەستین یان..هتد، داگیرکرد..

ئازادیخوزان و دیموکراسیخوازن - زۆرینەی چەکی بایەلۆجی و کیمایی و جینۆساید و..تاد، هەر بەسەر گەلانی موسڵماندا تاقیکردەوە.

بەناوی ئازادیی چەکی ئەتۆم دروستدەکرێت بۆ پێشێلکردنی ئازادیی موسڵمانان.

پێویستە تەرازووی ئازادیی بەیەکسان تەماشا بکرێت، نەك تاك لایەنە بەلای خۆتان دایبشکێننەوە، ئەوەی لەسەر دەسەڵاتە و خەڵکی دەچەوسێنێتەوە ئازادیخواز و عەلمانیە و دیموکراسیخوازەکانن کەچی ڕەخنە لەئیسلام دەگرن، بەڕاستی چەواشەکارییە، ئازادیی ئێمەی موسڵمانە پێشلکراوە.

## بنەمای ئازادیی لەئیسلامدا

بنەمای ئازادیی ئیسلام لەسەر دوو پایە دادەمەزرێت: لاضرر و لاضرار

یەکەم: زیان بەکەس مەگەیەنە.

دووەم: زیان بەخۆت مەگەیەنە.

یاخود دەتوانین بڵێین: لەسەر حەڵاڵ و حەرام دامەزراوە..

بەڵام پرسیار لای ئەوانەی، کەعەلمانی و دیموکراتیخوازن باسی ئازادی دەکەن، دەڵێن: ((ئایا ئەوە باشتر نیە، کەخەڵکی بەئارەزوی خۆی ئازادیەکانی دەستنیشان بکات؟))

لەوەڵامی ئەو پرسیارە ئەوەی پاك بێت، خوای گەورە حەڵاڵی کردووە، ئەوەی پیس بێت خوای گەورە حەرامی کردووە، دەڵێین ئادەی ئێوە ئەگەر دەتوانن

پێمانبڵێن، یەك شتی پاك خوای گەورە حەرامی كردووە، یان یەك شتی پیس لەئیسلامدا حەڵاڵە؟ ئازادیمان بەم پێوەرە خواییەیە. ئادەی وەرن بزانم وەڵامتان چیە؟ ئەم چەمكە بەكراوەیی بۆ ئێوە بەجێدێڵم، تارۆژی قیامەت دەرفەتتان هەیە بۆ وەڵامدانەوە؟

دڵنیام ناتوانن وەڵام بدەنەوە

(....وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ....)١٥٧ الأعراف

واتە: هەرچیەك پاكو چاكە بۆیان حەڵاڵ دەكات و هەرچی پیس و ناپوختە لێیان حەرام دەكات

لەسەرەوە باسی شەهوەتمان كرد، بەڵام مرۆڤ بەسروشتی خۆی كۆمەڵێك شەهوەتی هەیە، ئەگەر هاتوو ئەم شەهوەتانە دەستی بەسەردا نەگیرێت ئەوا وەك بەنزینی سەیارە وایە، ئەگەر لەناو تەنكی خۆیدا بێت بۆ كاری تایبەتی خۆی بەكاربێت سوتەمەنیەكی زۆر باش و چاكە، بەڵام هەر ئەو بەنزینە ئەگەر لەدەرەوەیدا بێت تەنكیەكەی لێی بچێت، پاشان هیچ شتێك نەبێت پارێزگاری لێبكات بەبزیسكێك ئاگری بچووك هەمووی دەسوتێت كەسیش سوود لەووزەكەی نابینێت، هەر لەبەرئەوەیە زۆرینەی مرۆڤ دەشێت هەڵبژێرن كەپیاو لەپیاو مارە بكرێت، یاخود ژن لەژن.. یان خواردنەوەی مەی و مادەهۆشبەرەكان یاساغ نەبێت، ئایا دەشێت زۆرینەی خەڵك لەسەر ئەم ڕایە بێت لەناو كۆمەڵگە یەكی موسڵمان هەموو چاو بنوقێنین بڵێن باشە؟

**ئەمە ئازادیە یان نەهامەتیە؟**

بێگومان نەخێر، چونكە ئەو كاتە بەدەنگی زۆرینە كۆمەڵگە بەرەو خۆكوژی دەبەین، نموونەی دیموكراسی و ئیسلام وەك: دوو خێزان وان منداڵ پەروەردە دەكەن، خێزانی دیموكراسی بەناوی خۆشەویستییەوە منداڵەكەیان ئازاد دەكەن بۆ خواردنی هەموو جۆرە شیرینیەك، تاهەموو ددانەكانی دەرزێت، پاشان لەهەرزەی و موراهقیدا بۆ ئەوەی ئارەزووەكانی تێر بكات بەناوی ئازادییەوە

تووشی هەرچی نەخۆشی شازە دەبێت، لەخواردنی مەی و حەزی جوتبوون، دزی و تەنانەت بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانی پەنا دەباتە بەر هێز و کوشتنی خەڵکی بۆ ئازادی خۆی ئازادی خەڵکی تر پێشل دەکات.

خێزانی دووەم کە موسڵمانن : هەموو کارەکانی کردوەتە بەرنامەو بەگوێرەی ڕەوشی منداڵەکەی، پاشان پێگەیشتنی هەرزەکاری پەروەردەی دەکات و بۆئەوەی مرۆڤێکی تەندروستی لێدەربچێت بۆ کۆمەڵگە، نموونەی ئەوەی کەخەڵکی خراپ زۆرە لەناو کۆمەڵگەی ئێمەدا و دزی و گەندەڵی و مافی خەڵکی پێشێل دەکرێت، تەنانەت سەروەت و سامانی وڵاتی موسڵمانان بەهەدەر دەڕاوت. هۆکاری سەرەکی و نەهامەتی بۆ خەڵکی عەلمانیەت و دیموکراسیەکەیەتی، لەوکاتەوەی خۆی سەپاندووە بەسەر گەلی موسڵماناندا هەمیشە ئازار و نەهامەتی و مەینەتباری کردوە، بۆیە میللەتی موسڵمان هەر بەرمو دواوە دەگەرێتەوە، چونکە بەرهەمی عەلمانیەت و دیموکراسیە کەخەڵکی بەوشێوە پەروەردەکراوە، تا خاوەنی ئیسلام بووین ئیسلام پەروەردەی دەکردین هەموو خەڵکی سەرزەوی چاوەڕێی دەستی ئێمەی موسڵمان بوو کەعەلمانی هات ئێمە دواکەوتین.

نموونەی دیکە بۆ زیاتر بەرچاو ڕوونی خوێنەر

ئەوەی، کەلای موسڵمان حەرامە و خوای گەورە بەدەق حەرامیکردوە ڕێك لەولاتانی دیموکراسیخوازدا پێچەوانەکەی دەبینیت و زیاتر برەوی پێ دەدرێت، لەکاتێکدا هەموو ئەو شتانە پیسە و هەموو دنیا دان بەپیسی ئەو بەهاو چەمکانەدا دەنێت، پرسیار ئەوەیە ئەی بۆ ڕەواج و پەرەی پێئەدەن بەزۆرینەی دەنگ، بێگومان لەبەرئەوەی شەهوەتی هەموو خەڵکیە..

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنْصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ )٩٠ المائدة

واتە، ئەی ئەوانەی، کەباوەڕتان هێناوە دڵنیابن کە عەرەق و قومار و پەیکەر و فاڵ، کار و کردەوەیەکی پیسن و شەیتان بۆتانی دەڕازێنێتەوە، کەواتە ئێوە

خۆتانی لێ دووربگرن و خۆتانی لێ بپارێزن، بەڵکو سەرفرازیی و بەختەوەریی بە دەستبێنن لەهەردوو جیهاندا.
ئازادی لەخۆکوژیدا نیە، ئازادی لەخەڵك کوشتنیشدا نیە، ئازادی ئەوەی زیان بەکەس نەگەیەنێت[٦٧].

**مافی ئافرەت:**

گوتاری ئیسلامی لەمەڕ ئافرەت لەهەندێك بواردا نەبێت هیچ جیاوازییەك وەك ماف لەگەڵ پیاودا ناکات، مەگەر لەئەرکدا جیاوازیان بکات، لەدوای ١١ سێبتەمبەرەوە مافی ئافرەت تارادەیەك کاڵ بویەوە، بەڵام پێشتر هەر ئافرەت و هەڵوێستی موسڵمانان داخۆ چییە لەبەرامبەر ئافرەتاندا، کە١١ سێبتەمبەر ڕوویدا ئەم باسە تارادەیەك کاڵ بویەوە گوتاری سیاسی ئیسلامی زیاتر قسە و باسەکانی لەسەر جیهاد و شۆڕش و خەبات و ئیرهاب چڕکردوە..

- پێشتر باس لەوەدەکرا، کە ئافرەت مافی نیە لەئیسلامدا؟
- ئافرەت بێ ئەقڵە، چونکە لەفەرموودەدا هاتووە؟
- خەتەنەی ئافرەت؟
- حەوا لەبەر خاتری ئادەم دروستکراوە؟
- بۆ ڕێگا لەفرەژنی نەگیرێت؟

زۆریتر لەم باس و خواستانە داوادەکرا، گوتاری ئیسلامی چییە لەمبارەیەوە، هەوڵدەدەین گوتاری ئاینی ئیسلامی لەمەڕ ئەم چەند تێزو باسانە بخەینەڕوو.

[٦٧] گۆڤاری ڕێگای هزر ژمارە ٤ ل ١٧٨

ڕێڕەو نموونەی ئافرەت و پیاو لەمافە گشتیەکاندا

لەپلەو پایەدا وەك یەکن لەئیسلامدا بەهیچ شێوەیەك جیاوازی لەنێوان هەردوو ڕەگەزەکەدا نیە. بەڵگەشمان بۆ ئەم وتەیە فەرموون: سەیری سورەتی (ئەحزاب) بکەن: (إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيراً وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا) ﴿٣٥﴾

واتە: بەڕاستی پیاوان و ئافرەتانی موسڵمان، پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار، پیاوان و ئافرەتانی ملکەچ و فەرمانبەردار، پیاوان و ئافرەتانی ڕاستگۆ، پیاوان و ئافرەتانی خۆگر، پیاوان و ئافرەتانی لەخوا ترس، پیاوان و ئافرەتانی بەخشەندە، پیاوان و ئافرەتانی ڕۆژووان، پیاوان و ئافرەتانی داوێن پاك و ئەو پیاو و ئافرەتانەی کە زۆر یادی خوا دەکەن، بەخشین و لێبوردەیی و پاداشتی زۆر مەزن و بێ سنووریان لەلایەن خوای گەورەوە بۆ ئامادەکراوە هەر کە دنیایان بەجێهێشت پێی شاد دەبن.

زیاد لەدەیان جێگای تردا هاوشێوەکەی ئەم ئایەتە ودوبارە بۆتەوە بۆ یەکسانی ژن و پیاو! بۆ ئەوەی باشتر وێنای بکەین بۆتان، لەئیسلامدا بەمشێوە سەیری ئافرەت دەکرێت. چۆن شەو هەیەپێیدەگوترێت: زەمەن، ڕۆژیش بەهەمان شێوە پێی دەگوترێت زەمەن، هەریەك لەم زەمەنانە تام و چێژی خۆی هەیە. ئافرەت و پیاو هەریەك لەم دوو ڕەگەزە پێیاندەگوترێت مرۆڤ. کەسیان لەمرۆڤایەتیان کەم نابێتەوە بەهۆکاری ڕەگەزەکەیەوە. ئەمەش لە ئایەتەکاندا باسکراوە و ئاماژەمان پێداوە لە ئایەتەکەدا جوان ڕوون دەبێتەوە. کەواتە مافی گشتی پیاو و ژن وەك یەکن بێ جیاوازی، بەڵام کاتێك دێتەسەر وردەکاری ژیانی ئافرەت. سروشتی زۆر لەپیاو جیاوازترە. یاخود پێچەوانەکەیەتی، بۆ نموونەکەباس لەئافرەت دەکەین هەمیشە بیری ئەو ناسکە. خەیاڵی لای ڕەنگی جوان و سور و پەمەیی و بۆنی

گوڵ و هەموو شتێکی ناسکە، بەڵام پیاو لەبیر و خەیاڵیدا هەمیشە بیری لای پارە پەیداکردن، دەرنەفیز، پلایس زیندان، سیاسەت، تۆڵەکردنەوە، هەوڵی زیاتر، هەموو شتێکی زبرە، هەرچی ئافرەتێکە دەیەوێت پیاو بێنێتە ناو دنیای خۆی، هەرچی پیاوە لەهەوڵی ئەوەدایە کەئافرەتان بهێنێتە ئەو دنیایەی خۆی، لێرەدا ئیسلام ئەم پارسەنگیەی ڕاگرتووە و هەردووکیان دەبێت سنوری خۆیان بزانن، چونکە دوو ڕەگەزی جیاوازن لەڕووی لاشەییەوە و لەڕووی بیرکردنەوەوە.

کەواتە زۆر کەمکردنەوەی هەردوولایانە، کە مافەکانییان لەهەموو شتێکدا یەکسان بکرێن و هەردوو ڕەگەز وەك یەك تەماشا بکرێت، ئاخر چۆن ئافرەتێك کە لەماوەی نۆ مانگدا منداڵێك بەسك هەڵبگرێت پاشان مافی وەك مافی پیاوێك بێت کەنازانێت ئازاری چەندە قورسە، یاخود پیاوێك هەموو قورسایی بژێوی دەکەوێتە سەرشانی چۆن وەك ئافرەت دەبێت سەیر بکرێت، کە هەریەك لەم تە وەرانە باس و خواست و توێژینەوەی دەوێت ،بۆ ئەوەی لەگەڵ ناخی مرۆڤەکاندا وتوێژی لەسەر بکرێت، بەڵام دروشم و وتەی شاعیرانە لە هیچ کۆمەڵگایەکی ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتیدا جێی نابێتەوە، ئیسلامیش هاتووە کە وتوێژ لەگەڵ ناخی مرۆڤدا دەکات، بەڵام ئەگەر خەڵکانێك سەرچاوەی پێناسەکان لەخودی ئیسلامەوە ناهێنن، هەڵەدەکەن لەکۆمەڵناسی لەباری دەروونی مرۆڤەکاندا، لە کۆتایی ئەم تەوەرەدا، خوای گەورە هەموو ئافرەتان بەگوڵ ناو دەبات!..

(وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ الْحَيَاةِ الدُّنيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ) ١٣١ طه

واتە: تۆ چاوەکانت مەبرە هەندێك لەو خێزانانەی کە دوور لەخوان لەهەندێك ناز و نیعمەت بەهرەوەرمان کردون، چونکە ئەوە گوڵی دنیایە کە: ڕەنگی، شێوەی، بۆنی، تەمەنی، بەردەوام نیە، ئێمەبەو ناز و نیعمەتانە دەمانەوێ تاقییان بکەینەوە، بێگومان ڕزق و ڕۆزی پەروەردگارت لە بەهەشتدا چاکتر و بەردەوامترە.

گوتاری دووەم: ئافرەت بێ ئەقڵە؟ ناچارین فەرموودەکە وەك خۆی دابنێین بۆ ئەوەی زیاتر بتوانین ڕاڤەی بکەین (ما رأيت من ناقصات عقل و دين أذهب للب

الرجل الحازم من إحداكن يا معشر النساء) لێرەدا هەموو ڕاڤەکارانی ئەم فە رموودەیە لەسەر ئەوە کۆکن، کە ئافرەتان بەهۆکاری سوڕی مانگانەیان ناقص دینن وەك پێغەمبەر - سەلامی خوای لێبێت - دەفەرموێت، چونکە بۆ ماوەیەك لە نوێژ ئەگەر ڕەمەزان بێت لەڕۆژو بەدوور دەبن ئەمەش کارێکی سروشتیەکە ئافرەت لەماوەدا ناقص دینە!

لەمەڕ ئەقڵەوە ئەگەر جوان سەیری فەرمودەکە بکەین شتێکی تر دەبینین فەرمودەکە ئەگەر وەك خەڵکی عەرەبی نەزان بیکەین بەکوردی دەبێت بڵێین، ((ئافرەتانی بێ ئەقڵ پیاوانی ئاقڵ هەڵدەخەڵەتێنن!)) جا چۆن لۆژیکێکە پیاوانی خاوەن ئەقڵ ئافرەتانی بێئەقڵ هەڵیانبخڵەتێنن، کەواتە بەمشێوەیە نیەو وا ڕاڤە ناکرێت لێرەدا وشەی (للب) واتای ئەقڵە وشەی (عقل) واتای سۆزو هەست و نەستی ئافرەتە، هەروەها وشەی (الحازم) مانای پیاوێکی خاوەن هێزر و کەسایەتی بەهێزە، کەواتە ڕاڤەکەی بەمشێوەیە، ئافرەتان بەهەست و سۆزی خۆیان پیاوانێك ئەگەرچی خاوەنی ئەقڵ و کەسایەتی بەهێزبن دەچنە ژێر ڕکێفیان زوو بەقسەیان دەکەن.

گوتاری سێیەم، باسی خەتەنەی ئافرەتە، لای هەمووان ئاشکرایە کە ئیسلام لە ڕووی تێگەیشتنی شەرعەوانیەوە (فقهە) زۆر بەرفراوانەو زۆرجار لەناو میللەتاندا عورف دەسەپێنرێت بەسەر خەڵکیدا وەك، ئاین فەرزی دەکەن، بۆ نموونەلای زانایانی سعودیە پەچە (نیقاب) فەرزە، بەڵام ئەلبانی هەر لەو ناوچەدایە ڕەتیدەکاتەوەو کتێبی لەسەر نوسیووە، کە بەهیچ شێوەیەك فەرز نیە، خەتەنە لەهەندێك عورفی وڵاتانی ئەفریقیدا فەرزیان کردووە، نە پێغەمبەری خوا ئیقراری لەسەر کردووە نەبۆتەفەرز و نە سوننەت، هیچ نیە تەنها لەعورفی گەلانی تردا بوونی هەیە، لەهەر جێگایەك لەو وڵاتانە شێوەی خەتەنەکە جیاوازە ، ئەگەر فەرز بوایە دەبوو هەموو کەس لەئاستێك ئەو فەرمانەی بەجێبهێنایە، بەڵام تەنها عورفێکە هیچ پەیوەندیی بەئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە نیە، هەر بەو هۆکارەیە کەمترین باسمان لەسەر ئەم تەوەرەیە هەیە، چونکە نەهیچ بەڵگەیە

ك نەهیچ ئایەت و فەرمودەیەك لەبەردەستدایە، كە راستبن و لەسەری بدوێین، بەوەندە كۆتایی پێدێنین، كە هیچ پەیوەندی بەئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە نیە.

گوتاری چوارەم: ئادەم و حەوا لەهەموو ئاینەكانی تردا بەتایبەت لەئاینی بەهرامی، شوشەنگی، میترائیسمی، مەسیحی، ئاینی دەستكاریكراوی جولەكە، كە ئافرەت سەرچاوەی نەهامەتی بەدەرنانی ئادەمە لە بەهەشت، هەموو تاوانە كە دەخرێتە پاڵ حەوا، كە بەقسەی ئەو هەڵخڵەتاوە كورت و پوخت ئافرەت بەبوونەوەرێكی ترسناك و وەحشەتناك تەماشا بكرێت، بەڵام لەئیسلامدا رێك پێچەوانەی ئەو ئاینانەی ترە، لەئیسلامدا ئادەم بەرپرسە بە هۆكاری بەرپرسی ئادەمەكە حەواش وەدەرنراوە لە بەهەشت، چونكە حیوار لەگەڵ ئادەمە نەك حەوا. ئادەم هەڵساوە بەكارەكە لەسەرەتادا نەك حەوا بۆ بەڵگەی ئەم وتەیە زیاد لەچوار جێگا ئەم باسەدەكات بۆمان، سورەتی البقرة ئایەتی(٣٠ ـ ٣٩) هەروەها سورەتی الأعراف ئایەتی (١١ ـ ٢٥) سورەتی طه ئایەتی (١١٥ ـ ١٢٦) لەچەند جێگایەكی تردا باسكراوە ئەوەندە بەسە وەك بەڵگە، كە ئادەم تاوانەكەی ئەنجامداوە لەسەرەتاوە حەوا شوێنكەوتووی ئادەم بووە نەك پێچەوانەكەی.

پرسیاری ئەوە دەكرێت ئەی بۆ ئادەم لەسەرەتاوە دروستبووە یا ئافرەت دروستبوایە؟ هەموو بوونەوەر، كەدروستبووە هەموو لەسەر سیستەمی نێر و مێ دروستبووە، هیچ شتێك نیە لەسەر ئەم زەمینەدا لە نێرو مێ پێكنەهاتبێت، ئەم پرسیارە وەك بازنەی بەتاڵ وایە هەرگیز ناگەیتە ئەنجام، چونكە ئەگەر حەوا لە سەرەتاوە دروست بوایە،دەبوو ئادەم هەر دروستبكرێت، پرسیاری ئەوە دەكرا ئادەم بۆ خاتری حەوا دروستبووە گومانی تێدانیە هەردووكیان بۆ خاتری یەك دروستكراون ئاماژەمان پێداوە هیچیان لە مرۆڤێتی خۆیان دەرناچن، وەك ئاو كە لەئۆكسجین و نایترۆجین دروستبووە، كە ئەم دووانە بەبێ یەكتری ناتوانن ئاو دروست بكەن، وەك ئەوەی كەبەیەكەوە یەكدەگرن و دەبن بەئاو كەسەرچاوەی ژیانە، كەلەپێكهاتەی ئەم ئەتۆمەدا نێر و مێ دەردەكەوێت، كە ئۆكسجین لە بەرگی دەرەوەی خۆیدا پێویستی بەدوو ئەلەكترۆن هەیە تا پڕ ببێت، هەر

ئەتۆمێکی هایدرۆجینیش لەبەرگی دەرمووەیدا ئەلەکترۆنێکی هەیە، کەدەیەوێت لەدەستی ڕزگاری ببێت، بۆیە ئەم یەککگرتنە دروستدەکات لەگەڵ ئۆکسجین، بە هەردووکیان ئاو پێکدەهێنن، ئەم نمونەیە بۆ ئەوەیە کە هەموو لەم ژیانەدا پێویستمان بەیەکترە، چ جای ئەوەی کەنێر و مێیەك مرۆڤایەتی پێکدێنن، ئەمە کەی وتەیە مرۆڤ جارێك وەك منداڵانی بەر دەرگا بیر لەوە بکاتەوە کامیان بەگ بێت و کامیان پاش بەگ، یان قرەبێت، خەڵکی خاوەن فکر هەرگیز بیر لەوە ناکاتەوە.

گوتاری پێنجەم: فرەژنی، خوای گەورە لە قورئاندا لەسەرەتای سورەتی نساء باسی ئەوەی کردوە کە پیاو دەتوانێت چوار ژن لەکاتێکدا کۆبکاتەوە، بەمەرجی دادپەروەر بێت لە نێوانیاندا، نەیارانی ئیسلام پێیانوایە: ئەم چوار ژنە لەیەك کاتدا فەرزە! نەخێر بەڵکو تەنها ڕێگاپێدانێکە بۆ پیاوان، کە دەتوانن ئەو کارە ئەنجامبدەن، بۆ نموونە لەولاتی هۆڵەندا و ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا و زۆرێکیتر لە ولاتانی تر پیاو دەتوانێت پیاو مارەبکات، ژن دەتوانێت ژن مارەبکات، لەهۆڵەندا واخەریکە دەبێتە یاسا ئافرەت دەتوانێت خۆی لە ئەسپ، یان سەگ مارە بکات، هەرچەندە لەهیندستان ئاساییە، واتە: یاسای تەلاق، یاسای وراسەت، جیابوونەوەی بۆ دادەمەزرێنن، بەلام ئەم یاسایە فەرزکراوە بەسەر خەڵکیدا، گومانی تێدانیە نەخێر، ئەم فرەژنییە لەهەندێك جێگادا چارەسەری کۆمەڵگایە لە نەهامەتیەکانی، ئافرەت کە لەو نێوەندەدا بێ پیاو ماونەتەوە، چونکە سروشتی ئافرەت واهەڵکەوتوە حەزدەکات لە سێبەری پیاوێکدا بحەسێتەوە، بەلام سروشتی پیاو وانیە هەمیشە پێیخۆشە زیاتر لەبەشی خۆی پەلبهاوێت و سەیری ئافرەتانی تر بکات لەکاتێکدا خۆی خاوەنی خێزانە، ئاشکرایە ئیسلام وەك سەید قوتب دەڵێت: ((ئاخافتن لەگەڵ ناخی هەموو مرۆڤەکان، لەئیسلامیشدا لەبنەڕەتدا خوای گەورە وایداناوە، کەئادەمی دروستکردوە یەك حەوای بۆ دروستکرد نەك چوار حەوا، بەڵکو ئەوی تر ڕێگا پێدراوە، زۆرجار ئەم باسە پێچەوانە دەکەنەوە دەڵین: ئەی بۆ ئافرەتێك خاوەنی چوار پیاو نەبێت؟

ئایا مەبەست ئەوەیە منداڵەکەی نادۆزێتەوە لەکامیان بێت، دەڵێن: ((ئەو بیانەوەشت نەماوە چونکە ئێستا (DNA) ئاشکرای دەکات منداڵی کامیانە!!))

لە وەڵامی ئەم پرسیارە نامەعقولەدا دەڵێین: ((عیللەت لەئافرەتدا نیە کەچوار پیاوی هەبێت، بەڵکو عیللەت لەچوار تۆوی پیاودایە کەتیکەڵ بێت بەرەحمی ئافرەت توشی هەرچی نەخۆشی و دەردەسەرییە دەیکات، دەبێت بەرێگای پاککردنەوە و خەستەخانەوە بێت، چونکە ئەو ئاوانەی پیاو، کەتێکەڵ دەبێت لەرەحمی ئافرەتدا هەمووی دەبێتە دەردی کوشندە بۆ ئەو ئافرەتە..!

بۆیە شێخی شعراوی لەئەمریکا لەکاتێکدا کەوەزیری ئەوقاف بوو بانگێشتکرابوو ئەو پرسیارەی ئاراستەکرا، ئەویش گوتی: ئەو ئافرەتە سۆزانیانەی ئەمریکا کەبە ئاشکرا باجیان لێدەستێنن و لاشەیان دەفرۆشن پشکنینی پزیشکیان بۆ دەکرێت ئەوانیش گوتبوویان هەر چوار پیاوێك کەدەچێتە لای دەبێت پشکنینی پزیشکی بۆ بکرێت، لەوەڵامدا گوتی خۆتان وەڵامی خۆتان دایەوە، چونکە عیللەت لەتۆوی پیاودایە[٦٨].

## جیهاد و خەبات و شۆڕشگێڕی

### شۆڕشگێڕی و سیاسەت لەئیسلامدا بنەماکەی جیهادە:

هەموو کۆمەڵ و دەستەیەکی ئیسلامی پێویستیان بەتیۆرێك هەیە بۆ سیاسیەتی بزاڤی ئیسلامی واتە پێش ئەوەی باسی دیدو تیۆری ئیسلامی بکەین پێویستە بزانین سیاسەتی ئیسلامی چیە؟

کەواتە سیاسیەت: بریتیە لەحیکمەت پاشان کۆمەڵی لێدروست بکرێت، تا دەوڵەت بەبانگەوازێکی گشتی وجیهانی (خیلافەت) بۆ لوتکە و ترۆپك و جێنیشینکردن) شارستانیەت( بەرمو ڕاستی و حەق).

ئەم چەمکانە پێویستیان بەشیکاری هەیە

---

[٦٨] التفسیر الشعراوي سورە النساء ئایەتی یەکەم..

**حیکمەت و کاری بەکۆمەڵ:**

هەموو لەسەر ئەوە کۆکن، کەحیکمەت واتە: هەستی پێگەیشت و ڕاستی لەبیرکردنەوە کۆکردنەوەی کۆمەڵێك خەسڵەت بەبانگەوازچی، کەتایبەتمەندی ئەوەیە لەواقعدا ئەو ئیسلامە دەکاتە ئایدۆلۆژیا، تا بەبانگەواز و گەیاندنی ئیسلامەکە بیگەیەنێتە ئامانج.

ئەمەی باسمانکرد تێگەیشتنە لەچەمکی حیکمەت لەلایەن تاکی موسڵمان.

ئەگەر بەتەواوی دیاری بکەین، کەحیکمەتی کاری بەکۆمەڵ چیە دێینە سەر ئەو ڕایەی، کەهەموو بڵێین واتە: سیاسەت، کەواتە لەئیسلامدا چەمك و حیکمەت تێگەیشتن لێی. واتە: سیاسەت، ئەگەر بڵێین حیکەمەت سیاسەتی تاکی موسڵمانە، کەواتە سیاسەت ئەوەیە، کەحیکمەتی کاری بەکۆمەڵەکەیە، لەسەر ئەم بنەمایە، دەتوانین بڵێین دید و بۆچوونی سیاسی ئیسلامی دیارە و ئەمە بنەماکەیەتی لەژێر ڕۆشنایی چوار حیکەمەت کەبریتیە لە:

ڕموش ـ واقع و راستی حەق و مرۆڤ و ئامانج.

ئەم گرێدراوانە بەیەکەوە هەموو توخمی ئەو ئاستە کۆمەڵسازیەیە لەبانگەواز و دیاریکردنی چوارچێوەی گشتی تیۆری سیاسی بۆ بزاڤ و گۆڕانکاری.

هەریەکێك لەم چوار توخمە، ئەگەر نەبوون لەکاری کۆمەڵسازی و بانگەوازەکەدا، ئەوە لەئاستی دیاریکردنی بزاڤە گۆڕانکاریەکە کەم دەکاتەوە لەچوارچێوەی خۆیدا ناهێڵێت، هەموو ئەم تیۆرەی، کەباسمانکرد و پارێزراوە بەهێزی سەربازی و خەباتکاری کەجیهادە .

واتە: جیهاد یەکێکە لەفەرزەکانی ناو ئیسلام.. زۆرێك لەزانایانی کۆن و نوێ، لەوانە عزی کوڕی عەبدولسەلام، تادەگاتە عەبدوڵلا عەزام هەندێك لەوانە پێیانوایە جیهاد روکنێکە لەئیسلام، واتە: لەگەڵ شایەتومان و نوێژو ڕۆژو زەکات و حەج.. کردوویانە بەشەش پایە ئەویش جیهادە!..

جیهاد و شوڕشگێڕی لەئیسلامدا لەسەرەتادا دژی کافر و موشریکەکان کراوە، جیهاد لەسەرەتاوە هەر لەمەککەوە فەرز کراوە، پاشان خەڵکانیك لێیان تێکچوە

لەگەڵ قیتالدا کە لەساڵی ٢ ی کۆچی لەمانگی شەعباندا فەرزکراوە بۆیە جیهاد پێنج جۆرە..

یەکەم: جیهادی نەفس

دووەم: جیهادی قیتال و سەربازی

سێیەم: جیهادی موڵك و سامان

چوارەم: جیهادی گوتنی حەق بەزمان بەرامبەر بەدەسەڵاتی خراپەکاران و زاڵمان

پێنجەم: جیهادی شەیتان..

هەموو ئەم جیهادانەی باسمانکرد پەیوەستن بەتاکی مرۆڤەکانەوە، تەنها ئەدەبیاتی سەربازی و جیهادی قیتال نەبێت، کەپەیوەستە بەدەوڵەت و دەسەڵاتی ئیسلامی یاخود گروپ و حیزبە ئیسلامیەکان.

ئەم خەبات و شۆڕشگێڕییە لەجیهاد بووە بەسێ بەشەوە لای هەندێك لەو ڕێکخراو و گروپ و حیزبانە..

یەکەمیان، پەکخستنی جیهاد: زۆر شلگیرن وەك یەککگرتوو، سەلەفیە مەدخلیەکان نزیکن لەگروپی قادیانیەکانەوە کەبڕوایان بەجیهاد نەماوە وەك کاری مەیدانی، تەنها لەتیۆردا باسی فەزڵ و کاری شۆڕشگێری جیهادی دەکەن، بەڵام لەواقیعدا بوونی نیە، پەکیانخستوە (تعطیلیان)کردوە، تا ئەم کاتەی ئێمەی تێدا دەژیین بەمشێوەیە هەنگاویان ناوە، ئیتر لەداهاتوودا ئەگەری ئەوەی هەیە کە گۆڕانکاری لەخۆیاندا بکەن!

دووەمیان: زیادەڕەوی هەموو ئیسلام لەجیهادی قیتالدا دەبیننەوە، سەنگەر و جەبهەیان لەگەڵ هەموو دنیادا کردۆتەوەمو ئەوەی لەگەڵ خۆیان نەبێت بەکافر و مورتەدی دەزانن، کوشتن و لەملدانی حەڵاڵە، نموونەی ئەم جۆرانە قاعیدە و تالیبانە لە ئەفغانستان، یاخود گروپی بۆکۆحرام و هەندێکیتر لەو کۆمەڵانە کەئیستا تاڕادەیەك نەماون وەك هیجرمو تەکفیر... هتد.

سێیەمیان: نێوەندگیرن واقیعەکە دەناسن بەگوێرەی ڕەوش و واقیعەکە بیردەکەنەوە دەستدرێژی ناکەن و سەنتەری هێزی خۆشیان دەپارێزن لەوانە حەماس و حیزبی تەحریر.. هتد[٦٩] جیهادی قیتال و سەربازی دوو جۆرە لەناو ئیسلامدا جۆری یەکەم پێیدەگوترێت جیهادی دەفع واتە: پاڵپێوەنان و خۆپاراستن.

**جۆری دووەەم پێیدەگوترێت جیهادی داواکردن (طلب)**

جیهادی دەفع برتییە لەو خەبات و کۆششەی کەخەڵکی دەیکات لەسەر خاك و نیشتیمان و سەروەت و سامانی خۆی و ماڵ و خێزانەکەی، پاراستنی شەرەف و کە رامەتی خۆی و خانەوادەکەی، ئەمە لای هەمووان ناسراوە. ئەم جیهادو کۆششە پێیدەگوترێت دیفاع لەخۆکردن و پاراستنی گیانی خۆتە.

جیهادی (طلب): برتییە لەو کۆشش و خەباتەی، کە تائێستا موسڵمان بەکەمی لێی تێگەیشتوون، بۆیان قوت ناچێت لەم سەردەمەدا لەبەرئەوەی کەخۆمان دواکەوتوو و هیچ نەزانین و شارەزانین لەدینەکەمان، بۆیە زۆر بەدەگمەن خەڵکانێکمان هەبێت لەجیهاد و کۆششی (طلب) تێبگەین کەبانگەوازێکە بۆ ئەم دینەو ئەم ئیسلامە کە دینی کۆتاییە لەدوای ئەم ئاینە هیچ ئاینێکیتر نایەت، کە ووشەکانی ووشەی خوای باڵادەستە، لەسەر شانی یەك بەیەکمان پێویستە، کە ئەم دینە بۆ خەڵکی ڕوونبکەینەومو بانگەوازی بۆ بکەین، تا ئێستا چواریەکی جیهان ئەم ئاینەی پێگەیشتووە!! مەبەستیش لەوەی کە پێغەمبەر- صلی الله علیەو سلم- ناردووە تەنها بۆ عەرەب نیە، بەڵکو بۆ هەموو جیهانە، کەواتە

[٦٩] فیقه الجهاد دراسة مقارنة لاحکام وفلسفته في ضوء القران وسنة.. نوسینی: دکتۆر یوسف القرضاوي ل٢٦ -٢٧ بەرگی یەکەم..

یەکەم کاری کۆشش و خەباتی جیهادی طەڵەب بریتیە لەبانگەوازکردن بۆ ئاینی ئیسلام، نەوەکو وەك ئەوەی خەڵکی تێگەیشتووە شەڕکردنە لەپێناوی ئیسلامدا، دوو تێگەیشتنی جیاوازە، بیروباوەڕ بەزۆر بڵاو ناکرێتەوە، بەڵام بانگەواز لەسەر هەموو لایەکە، مەرج نیە (طلب) بکەی بەچەك و قیتال بێت.

دەبێت لەوەتێبگەین، کە ئەرکی سەرشانمانە بگەڕێین بەم جیهانەدا بۆ بانگە وازکردنی ئەم ئاینە ئەگەر موسڵمان ڕوونی نەکاتەوە خۆ ئەم ئەوروپیانە دەڵێن: عیسا کوڕی خوایە! یان خەڵکانێکیتر گا ئەپەرستێت، یان خەڵکانێك هەر نازانن پەرستن چیە؛ هەیەدار دەپەرستێت یان ڕۆژ دەپەرستێت.. هتد.

کەواتە کێن ئەوانەی کەئەو نەوە نوێیەیان تێبگەێنن کەخوا لهکەس نەبووە، کەسیشی لێ نابێت؛ کێن ئەوانەی بەخەڵکی دەڵێن: خواکەتان مانگا و گاو مشك نیە، کەواتە لەسەرمانە کە هەوڵ بدەین بۆ بانگەوازی دینی خوا؛ بەندایەتیەکی ڕاست و دروست لەناو خەڵکیدا بڵاوبکەینەوە کەخوای گەورە ئێمە بەئومەتێکی شاهید ناوزەدی کردووین، دەبێت بپرسین بۆ؟ کەخوای گەورەدەفەرموێت: (وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا) البقرة ـ ١٤٣)

واتە: هەروەك چۆن ڕێنمایمان کردن بۆ قیبلەی ئیبراهیم (علیه السلام)، ئا بەمشێوەیە کردومانن بەئومەتێکی دادپەروەر چاکترینی ئومەتەکان بۆئەوەی لە ڕۆژی قیامەت ببن بەشاهێد لەسەر خەڵك کەوا پێغەمبەرەکان پەیامی خواییان بەخەڵکی گەیاندومو پێغەمبەریش ببێت بەشاهێد لەسەرتان کەپەیامی خوایی بەئێوە گەیاندووە...

کەواتە کەئەرکەکەی خۆتت زانی کەتۆ شاهێدی، سبەی ڕۆژ لەقیامەت خوای گەورە لێتدەپرسێتەوە، دەڵێی خوایەگیان ڕۆیشتم دینەکەی تۆم بڵاوکردوە گوێیان بۆ نەگرتم، یاخود گوێیان لێگرتم کاری تۆ لێرە تەواو بوو، بەڵام تا ڕۆژی مردن تۆ دەبێت هەر بانگەواز بکەیت !!. لای نوسەر ئەمە جیهادی (طلب)ـە

گوتاری جیهاد و شۆڕشگێری ئیسلامیان لەسەر دامەزراندوە، نەك تەنها قیتال مەبەستمان بێت..

لێرەدا دەبێت شتێکمان لەبیر نەچێت ئەویش بریتیە لەوەی کەسروشتی مرۆڤ وا هەڵکەوتووە یان بڕوات پێدەکات، یان بەدرۆت دەخاتەوە، وەیان خەڵکانێك ئەوانیش بیروباوەڕێکی تر دەپەرستن، خەڵکانێکی تر سوود وەردەگرن بەم پەرستنە سەروەت و سامانیان دەستدەکەوێت ڕێگریت لێدەکەن، یان دەسەڵاتدارێکی زاڵمە بۆ مانەوەی دەسەڵاتی خۆی کەخەڵکەکەی لەچواردەور بمێنێتەوە سوودی لەبێباوەڕی ئەوان وەرگرتووە بۆ هاتنە سەر دەسەڵات بێ شك و گومان دژایەتیت دەکات بۆسەو کەمینت بۆ دادەنێت، بەسوپا و شمشێرەوە دێنە بەردەمت خۆ ناکرێت تۆ بڵێیت، ملم ئامادەیە بۆ سەربڕین؛ بێگومان دەبێت تۆش سوپات هەبێت و شمشێرت هەبێت بۆ گەیاندنی بانگەوازەکە ئەگەر دەوڵەت و دەسەڵاتت هەبوو..!

ئەم چەمکی بانگەوازە پێویستی بەشمشێر نیە لەئیسلامدا، بەڵام کاتێك بەرامبە رەکەت ڕێگات لێدەگرێت و شمشێرت لێدەردێنێت ئەوکات تۆ پێویستت بەسوپا و شمشێر دەبێت، کەواتە فکر بەفکر، گفتوگۆ بەگفتوگۆ، هەرکات بەرامبەرەکەت شمشێری دەرهێنا دەبێت تۆش ئامادە بیت..

موسڵمانان کەدەچنە جێگایەك خەڵکی ناکوژن لەسەر ئەوەی کەموسڵمان نین، بانگەوازەکە دەکەن کێ وەریگرت سەرفرازە، ئەوەی وەرینەگرت و گوێی بۆ نەگرت خۆی زەرەرمەندمو بەجێی دێڵێت بۆ خوای گەورە، ئەوە خوا خۆی حوکمی دەدا لەقیامەت، کەواتە تۆ بۆت نیە هیچی لێبکەیت تەنها بانگەواز بۆ خەڵکەکە دەکەیت، وەك ئیمامی عومەر فەرمووی: بەسوپاکەی کەچوونە ناو خەڵکەکەوە ئاگاتان لەجوتیاران وخەڵکی ڕەش و ڕووت بێت، چونکە بەسروشتی حاڵ خەڵکی بەدوای ژیاندا دەگەڕێت و حەزی بەئاژاوەنیە، ئەوەی کە ئاژاوە دەنێتەوە ئەوەیە کەدەسەڵاتی لەکیس نەچێت، لەڕاستیدا خەڵکی ئەوەی خێر بێت خێرا دوای دەکەوێت!!

عومەری کوری خەتاب کاتێك وتار بۆ هێزەکان دەدات گوتی: اتقوا الله في الفلاحين، اتقوا الله في عموم الناس. وهم المغلوبون على أمرهم، الذين لا يهمهم مصلحة الحاكم هذا أو ذاك، إنما يريدون أن يتعلموا أين الخير فيتبعوه، اتقوا الله في هؤلاء، يقول: ولا تقتلوا إلا من قاتلكم...

موسڵمان هەرگیز ژن و منداڵ و پیر و پەککەوتە ناکوژێت، بەڵکو شەڕی شەرەفمەندانە دەکات لەگەڵ هێزو تواناداراندا دەجەنگێت، چونکە موسڵمان بە س لەگەڵ سوپادا دەجەنگێت، ئەوە مایەی سەربەرزی موسڵمانانە کە لەهیچ مێژوویەکی باوەڕپێکراودا نەبووە، کە موسڵمانان خەڵکی ڕەش و ڕووت بکوژن بۆیە چوونەتە هەر جێگایەك خۆشەویستییان لەدڵی خەڵکیدا چەسپیوە، خەڵکی زوو باوەشی بۆ کردونەتەوە، کەلەواقیعدا ڕوشەکە لەبەرچاوە نموونەی وەك میسر سەربازی ئیسلام بەرەو میسر بەڕێکەوتن مەسیحیەکانی میسر ڕاستەوخۆ چوونە ناو سوپای عەمری کوڕی عاص دژی سوپای ڕۆم جەنگیان کرد، ئەم مێژووە موسڵمان نەیاننوسیوە، بەڵکو قەشە یوحنا نوسیویەتی بەناوی مێژووی میسر، کەدەڵێین میسر واتە: لیبیاو سودانی ئێستا، چونکە خەڵکی میسر بێزاربوون لەدەسەڵاتی ڕۆمی ئەرتۆدۆکسی، وڵاتی میسر تا سەدەی هەشتی هیجری زۆرینە هەر مەسیحی بوون و ناسراوبوون بەئەرسیوونەکان بەحوکمی ئیسلام ڕازیبوون، لەگەڵ موسڵمان دژی خاچ پەرستان جەنگیان کردوە!..

کەواتە موسڵمانان تەنها لەگەڵ گومڕاو دەسەڵاتدارانی خاوەن بەرژەوندی خۆیان و ورگە زلەکانیان دەجەنگن ، بۆیەپێویستە سوپا لەگەڵ خەڵکانی بانگەواز جیابن، کەواتە بانگەواز ناکرێت مەگەر سوپای ئیسلام پاڵپشتی نەکات[٧٠]

خەڵکانێك دەپرسن باشە بۆ دەبێت سوپا لەگەڵ بانگەوازخوزاندابن؟

ئەوەتا ئێستا لەئەوروپا خەڵکانێك بانگەوازی خۆیان دەکەن و کەسیش سوپایان بۆ ناهێنێت و مزگەوتیان هەیە و چالاکیان بەردەوامە: ئازادن لە کارەکانی خۆیان

---

[٧٠] قصة الاندلوس..دکتۆر راغب السرجاني..پێشەکی کتێبەکەی بەرگی یەکەم ل ٧

لەمزگەوتەکانداو ڕێکخراوی تایبەت بەخۆیان هەیە. ئەوەتا لەمالیزیا و لە ئەندەنوسیا و لەفلیپین ئەو ئەزمونە بوو کە بەشمشێر ئیسلام بڵاونەبویەوە؟
لەڕاستیدا ئەم گوتەیە لەزەمینەی واقعدا وانیە. هەر گوتەیەکە دووبارە دەبێتە وە؛ ئەو ئازادیە ڕێژەییە واتە: فلتەرێکی بۆ دانراوە لەچوارچێوەی یاسایەکدا خۆی دەبینێتەوە. کەرۆژئاوا دیاریکردووە. ئەمە کەباسی لێوە دەکەین ڕاستە ئێمە لەم زەمینەیدا دەژین. هەروەها ئەو وڵاتانەی کە ئەم ئیسلامە لەڕێگای بازرگانیەوە چۆتەناوی تەنها وەك نوێژو ڕۆژوو کۆمەڵێك لەتقدیسی دینی سەیر دەکرێت وە ئیسلام بۆتە ئاینێکی ڕاهیبیانە تەنها وەك سۆفیەکی سادە ئەم ئاینە پیادە دەکەن کەوا لەهەندێك کاتدا شەرمی لێدەکەن باسی بکەن بەداخەوە ئەم ئاینە سروشتی بەو شێوەیە نیە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێوسیتی بەڕوبەربوونەوەی چەك نیە و مرۆڤەکان تا ڕادەیەکی باش دەتوانن ئاینەکانی خۆیان بڵاوبکەنەوە. لێرەوە ئەوە دەردەکەوێت کەجیهادی طەڵەب بوونی ماوە موسڵمانان بەردەوامن لەگەیاندنی دینەکەی خوای پەروەردگار لەجیهاندا!
بۆ ئەوەی زیاتر لەسروشتی ئەم ئاینە بزانین دەبێت بزانین کەئەم دینە دینێکی گشتگیرەو لەسەر هەموو فەرهەنگەکان تایبەتمەندیی خۆی هەیە. بەجیاواز وتەی خۆی هەیە لەسەر هەموو شتەکان: بۆ شەرم بکەین لەوەی کە ئەم ئیسلامە خاوەنیەتی کەلە هەموو جوانەکان جوانترو لەهەموو گەورەکان گەورە ترو بەپێزترە. دەبێت لەوە تێبگەین کەسروشتی ئەم ئیسلامە لەڕووی تاکەکەس بەزۆر نیە. خەڵك ئاینی خۆی بەدەستی خۆی هەڵدەبژێرێت. هیچ کەس بۆی نیە بەزۆر بیسەپێنێت وە بێ نیازین لەم ووتەیە وەك موسڵمان. چونکە نەسیاسەت دەکەین. نەدروشمیشە. نەسابوون لەپێدانی کەسیشە. بەلای ئێمە بڕوامان وایە دەبێت ئیسلام فەرمانڕەوایی سەر زەوی بکات ئەمە دیکتاتۆری نییە بەزمان حاڵی ئێستا ،بەڵکو کێبڕکێی دەسەڵاتە بەئاشکرا دەڵێین دەمانەوێت دەسەڵاتی خوا بچەسپێت لەسەر زەویدا. هەموو مرۆڤایەتی بیر لەوەدەکاتەوە کەدەسەڵاتی خۆی بچەسپێنێت. بۆ نموونە فارس ئیمپراتۆریەتی دامەزراند. ڕۆم کردی. لەسەردەمی

تازەدا ڕوسیا کردی، ئێستاش وا ئەمەریکا خەریکە. لێرە پێویستە پرسیارێك بکرێت بۆچی بۆ ئەوان ڕەوا بێت بۆ موسڵمان بقەبێت؟

لەکاتێکدا بەرنامەکەی ئێمە لەوەی ئەوان جوانترو بەوێژدانترە؛ نە هیندە سورەکانی لەناو بردوەو نە ناکازاکی و هێرۆشیمای وێران کردوە یان نەهیتلەری نازی، نەمۆسۆلۆنی فاشی، نە لینین و ستالینی دیکتاتۆری دروستکردوە. نەوەك تەتارو بەربەری نەبووە. کەواتە ئیسلام زۆر جوانە. بۆ پیادەکردنی پێویستی بە سوپا هەیە. تا دادپەروەری خۆشنودی بۆ خەڵك دەستەبەر بکات خەڵکانێك لەوانەیە بپرسن بۆ سوپا؟

لەبەرئەوەی ئەگەر تەماشای زلهێزانی دنیا بکەیت دەبینیت ئەو هەموو چەکیئە تۆم و کیمیایی و موشەکە دروستدەکەن. لەدواییدا دەڵێن بۆ پاراستنی ئاشتی لە ناوچەکەدا. ئەو کەسەی کە ماڵوێرانی دروستکرد بۆ مرۆڤایەتی و تەقینەوەی دروستکرد نۆبڵ بوو، کە ئێستا بووە بەخەڵات بەسەر خەڵکانێکی کارامەدا دابەش دەکرێت!!

لەهەموو ئەو کاتەکاندا پێویستت بەسوپاو هێز هەیە بۆ ئەوەی خۆتی پێبپارێزی ئێستا بۆمان دەردەکەوێت کەگوتاری جیهادو شۆڕشگێری کارێکی زۆر سروشتییە کەئەم ئیسلامە خاوەنی سوپاو هێزی تایبەتی خۆی هەبێت. نەك بۆ شەڕەنگێزی، بەڵکو بۆ پاراستنی خۆی و خەڵکەکەی کەفەرمانێکی خوای پەروەردگارە. کە دەفەرموێت:

( إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنجِيلِ وَالْقُرْآنِ وَمَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ مِنَ اللَّهِ فَاسْتَبْشِرُواْ بِبَيْعِكُمُ الَّذِي بَايَعْتُم بِهِ وَذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ) ١١١ التوبة

واتە: بەڕاستی خوا گیان و ماڵی لەئیمانداران کڕیووە بەوەی کە بەهەشت بۆ ئەوانە و بەشیانە. پەروەردەگارێکی بەخشندەیە. هەر خۆی بەخشێنەری گیان و ماڵ و سامانە. کەچی ئاوا مامەڵەدەکات لەگەڵ ئیمانداران، نرخێکی نەبڕاوەیە. نرخێکی زۆر گەورەی بۆ بڕیارداوە. کاتێك لەپێناوی ئەودا دەیبەخشن (ئەوانە

دەجەنگن لەپێناوی ئاینی خوادا، دوژمنانی ئاینی خوا دەکوژن لەگۆڕەپانی جەنگدا، یان دەکوژرێن و شەهید دەکرێن، ئەو پاداشت و بەڵێنە بەراستی لەسەر خوایەو باسکراوە لەتەورات و ئینجیل و قورئاندا، جا کێ هەیە بەقەدەر خوا بەوە فاو بەئەمەك بێت بۆ جێبەجێکردنی بەڵێنەکانی، کەواتە زۆر دڵخۆش و کامەران بن بەو مامەڵەیەی کەئەنجامتانداوە، بەو فرۆشتن و کڕینەی کە لەسەری ڕێککەوتوون، بێگومان هەر ئەوەشە سەرفرازی و سەرکەوتنی نەبڕاوەو بێ سنوور.

کەواتە، هەرگیز شەرم لەوە نەکەین کەبڵێین ئەم ئیسلامە بەهێز و سوپا بڵاوبۆتەوە، دەبێت بزانین، کەئەمە مافی خۆمانە ئەوەی دەیەوێت پێتانبڵێت کە ئەم ئیسلامە بە بازرگانی بڵاوبۆتەوە ئەوە من بەدۆستی ئەم ئیسلامەی نازانم؛ دەیەوێت لەئیسلام کەم بکاتەوە، لەکەسایەتی موسڵمان کەم بکاتەوە، ڕازی نین بەو وشەیە، بەڵکو ئەو جەنگانەی کەئیسلام کردویەتی هەمووی سەروەرین و دەبێت ئەوە بزانین کەئەگەر کەسێك باسی جەنگەکانی ئیسلامی کرد، دەڵێین چی لێدەزانیت لەو جەنگانەمێژووەکەی بڵێ، ئەگەر گوتی: ئیسلام هەر خەریکی پیاو کوشتن بووە هەمیشە شەڕو شۆڕی کردوە دینەکەی بەشمشێر خنیوە بەمێشکی خەڵکیدا..

لە وەڵامی ئەم گوتارە ناواقیعەدا باسی واقیعێك دەکەین، کە بەبەراورد ڕاستیەکەمان بۆ دەردەکەوێت، ئەویش هاتنی سوپای تەتارە، بەشمشێر هەموو جیهانی ئیسلام و تەنانەت ئەوروپای گرت، ئایا لەموسڵمانەکان چوونە ناو دینی تەتار، یان تەتار هاتە ناو دینی ئیسلام، بەدڵناییەوە تەتار هەموو هاتنەناو ئیسلام، کەواتە بەشمشێر بیروباوەڕ هەرگیز بڵاونابێتەوە..

ئەگەر بەئەقڵێکی ماددی بیربکەینەوە، لەئەمریکا ساڵی ١٩٦٠ ز لەهەموو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا ١٣٠ هەزار موسڵمان هەبووە. ئێستا ٨ ملیۆن موسڵمان هەیە، بەچی بڵاوبویەوە؟

بەدڵنیاییەوە بەهیجرەت و بانگەواز، یاخود ئەوروپا، لەبەریتانیا و فەرەنسا و ئەڵمانیا سوید و دانیمارك و نەرویج یان بابڵێین یەکێتی ئەوروپی تەنها ١٦ملیۆن موسڵمانی تێدایە، هەموو ئەوروپا بێجگە لە تورکیا ٥٣ ملیۆن موسڵمانە، ئادەی کام شمشێر ئەمانەی موسڵمان کرد؟(*) دائیرەتولمەعاریفی ئازاد

مانای وانیە ئێمە جوانکاری بۆ هەموو مێژووی ئیسلامی بکەین لەگوتاری سیاسی ئیسلامی لەڕووی جیهاد و خەباتگێڕیەوە ، دڵنیاین لەوەی کەکاری ناپوختە و چەوت و چەوتێلی تێدابووە، بەڵام پێوەری بکەین لەگەڵ ئەو خێروبیرەی کە بەخشیویەتی کەمترە کە دەبێتە مشتێك لە خەروارێك.

گوتاری جیهاد و شۆڕشگێری، بۆ پاراستن و سەروەت و سامان خەڵکی و پاراستنی ئاینی خوای گەورەیە.

کەمە ئاینیەکان و بێدینەکان واتە: پەیمان پێدراوەکان (اهل الذمة) لەدەسەڵاتی ئیسلامیدا و وەرگرتنی جزیە لێیان

لە ئیسلامدا هاونیشتیمانی لەئەهلی زیمەدا بوونی هەیە: ئەگەر هاونیشتیمان بوو هاوشێوەی موسڵمان مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، واتە: دەسەڵات و هێزی موسڵمان زۆربوو بەسەریدا ئەوا دەبێتە هاونیشتیمانی و لەئەهلی زیمە دەردەچێت.

کاتێك موسڵمانان چوونە ناو خاکی میسر بەسەرکردایەتی عەمری کوڕی عاص لەساڵی ١٩ کۆچیدا، ڕازیبوون بەدانی جزییە بەموسڵمانان، چونکە خۆیان نەساڕایی (ئەریسیون) بوون واتا یەکتاپەرست بوون، بۆیە بەبێ جەنگ ڕازیبوون بەحوکمی موسڵمانان و مەقویس ئامادەی دەربڕی کەجزیە بداتە موسڵمان لەسایەی ئەواندا بژی و دەسەڵاتەکەی خۆشی بمێنێتەوە و وەلائی بۆ ئیمپراتۆری بێزەنتی نەمێنێت، وەلائی دایە موسڵمانان...!

موسڵمانان ڕازیبوون، تاسەدەی شەشی کۆچی موسڵمانان کەمینە بوون لەمیسردا جزیە وەردەگیرا تاسەردەمی مەمالیك، بەڵام لەدوای ئەوەی موسڵمانان زۆربوون و ئەهلی نەسرا کەم بوونەوە ئەوانیش بوونە هاونشتیمانی.

لەسەر بنەمای شاری مەدینەی پێغەمبەری خوا مامەڵیان لەگەڵدا کرایەوە، چونکە کاتێك، کەپێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم- چووە شاری مەدینە، جزییە لەموشریك و جولەکە و بێدینە ئەعرابیەکانی ئەو شارە وەرنەگرت، بەڵکو هەموو لەسایەی دەستورێکدا کۆبوونەوە کەدەستوری هاووڵاتیبوون بوو، لەشاری مەدینەدا بەسەرکردایەتی پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم-، خۆیان خەڵکی شارەکە بوون، پاشان دەسەڵاتی موسڵمانان بەسەریاندا دەڕۆیشت و موسڵمانان زۆرینەیان پێکهێناو لەژێر ڕکێفی موسڵماناندا بوون، بۆیە جزیە وەرنەگیرا.

## جزیە چییە؟

خەڵکانێك وادەزانن جزیە لەئیسلامدا بۆ سەرشۆڕکردن و زوڵملێکردنی خەڵکانی ژێردەستەیە، هەرچەندە لەمێژوودا تائێستا هەرگەل و هۆزێك لە جەنگدا سەرکە وتبێت بەسەر بەرامبەرەکەیدا ئەوا ئەو هەندێك یاساو ڕێسای بۆ دادەنێت، کە ئەمە بەردەوام لەکۆن و نوێدا هەیەو دەبینرێت لەنەتەوە یەکگرتوەکانیش ڕێگەی پێدراومو وەك یاسایەك چەسپیووە، واتە: مافی سروشتی ئەو دەسەڵاتەیە کەلەجەنگەکەدا سەرکەوتووە، بۆ نمونەکاتێك ئەمریکا چووە وڵاتی عێراق و ئەفغانستان، کۆمەڵێك یاساو ڕێسای هێنایە ئەو وڵاتانە بەئارەزوی خۆی سەروەت و سامانی خەڵکەکەی وەك چەتە ئەدزێت بۆ خۆی، بەڵام دەبێت بزانین و تێفکرین ئایا لەئیسلامدا جزیە چییە و بۆچی بەکاردێت و هۆکاری چییە؟

پێناسەی جزیە: ئەم وشەیە لەبنچینەدا وشەیەکی عەرەبییەو لە سێ پیت پێکهاتووە کە بریتین لە: ( ج. ز. ی) بەواتای (جَزاءُ بما صنع) پاداشت لەوکردارەی کردوتە، یان عەرەب

دەڵێت: "جزى يجزى" وە ئەم وشەيە داتاشراوە لەوشەی پاداشت وەك تەبەری دەڵێت: (بمعنى أنهم أعطوها جزاء مامُنحوا من الامن) واتە: دانی پاداشتێکە بۆئەوەی ئاسایشت بپارێزرێ. لەزاراوەی ئەمڕۆدا وەك زەریبە دێت، لەسەر جولەکە و نەسرانی و مەجوسییەکان دانراوە، هەروەها لە موشریکەکان وەردەگیرێت لە سەر بۆچوونی کۆمەڵێك لەزانایانی ئیسلام، بۆئەوەی دەسەڵاتی ئیسلامی پارێزگارییان لێبکات، ئەگەر نەیتوانی پارێزگاریان لێبکات ئەوا نابێت جزیەیان لێوەربگرێت.

**لەوانەیە پرسیارێك بێتە پێشەوە بۆچی دەبێت جزیە وەربگیرێت؟**

ئەو کەسانەی کەباس لەدامەزراندنی دەوڵەت دەکەن یەکێك لەبنەماکانی سیستەمی دەوڵەت ئەوەیە کە: باج (زەریبە) لەخەڵکەکەی وەردەگرێت، بۆ نمونە لەهەموو وڵاتێکی دنیادا زەریبە هەیە، لەوڵاتێکی وەك نەرویژ لە (٣٦٪) زەریبە لە خەڵکی وەردەیگرێت، لەزۆربەی زۆری وڵاتانی ئەوروپیدا هاوشێوەی ئەم ڕێژەیەیە، لەڕاستیدا ئەمەخوێن مژینی خەڵکە، جگە لەوەی بەچەندین ڕێگە پارەی ترت لێدەسێنن، وەك پارەی ڕێگەوبان، فڕێدانی خۆڵ و خاشاك، کارەبای سەرشەقامەکان لە خەڵکی وەردەگرێت. کاتێك باس لەدەزگای یارمەتیی کۆمەڵایەتی (سۆسیال) دەکرێت، ئەمە هیچ پارموپولی حکومەت نییە، بەڵکو پارەی دەیان کەسی وەك ئێمەومانانە کەکاردەکەین لەئێمەی دەسێنن بۆ ئەوان، ڕاستە وەك سیستەمێك ئەوە پیادەکراوە، بەڵام لەڕاستیدا هیچ دادوەرییەکی پێوە دیارنییە، سیستەمی مشەخۆری پێدەگوترێت: کەلەسەر ژیانی خەڵکی بەخێوبکرێت، بەڵام لە ئیسلامدا باجو زەریبە نییە، موسڵمانان هاوشێوەی جولەکەو نەسرانییەکان زەکاتیان لێوەردەگیرێت، ئەوەی موسڵمانان ناونراوە بە زەکات و ئەوەی ئەهلی زیمە پێیدەگوترێت: جزیە، کە ئەمە پارەیەکی کەمە و لەبەرامبەریدا سەربازی ناکەن بۆ دەوڵەتی ئیسلامی، چونکە سەربازیکردن لە دەوڵەتی ئیسلامیدا بەندایەتییە، ئەوانیش کەموسڵمان نین و لەو بەندایەتییە

بێبەشن و لەبری ئەوە پارەیەکی کەمیان لێوەردەگیرێت، کەئەمە تەنها پارەیەکی سەرەتاییە، ئەم پارەیە پێشتر جولەکەو نەسرانییەکان لەفەرمانڕەوایی خۆیاندا وەریانگرتووە لەخەڵکانی ژێردەستی خۆیان، تەنانەت عەرەبیش پێش هاتنی ئایینی ئیسلام وەریانگرتووە.

هەرکاتێك جولەکەکان یان نەسرانییەکان فەرمانڕەوایی ناوچەیەکیان کردبێت و موسڵمانانیان لەژێردەستدا بووبێت پارەیان بەزۆرداری لێوەرگرتوون و ئەوان ناویان ناوە (جیبایە) سەرانە، ئەو کەسانەی کە ڕەخنەدەگرن دەبێت جیاوازیی لە نێوانی زەریبەی ئێستا و جیبایەی کۆن و جزیەی ئیسلامدا بکەن، ئەوکاتە دەردەکەوێت، کە ئەم ئیسلامە بۆ هەموو کەسێك خێر و بەرەکەت بووە، وشەی جیبایەش سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ وشەی جابی، چۆن کاتێك جابیی پاس پارە لەسەرنشینەکانی وەردەگرێت، ئەم وشەیەش لەوەوە هاتووە کەسەرانی فەرمانڕەوای ئەو سەردەمە دەبوو جیبایە لەهەموو کەسێك وەربگرن لەمنداڵ و لاو و پیر، خۆ ئیسلام جزیە لەهەموو کەس وەرناگرێت، نە لەمنداڵی وەردەگرێت، نە لەژنی وەردەگرێت، نە لەهەژار و پەککەوتەی وەردەگرێت.

**پێویستە کێ جزیە بدات؟**

هاتنی ئیسلام دادپەروەری و خۆشنودی و کارئاسانی بوو بۆ هەموو خەڵکی، جزیەلەخەڵکی بێباوەڕ بە ئیسلام وەردەگیرێت بریتین لەکۆمەڵێك کەس:

یەکەم: لەئیسلامدا بەس پیاوان جزیەیان لێوەردەگیرێت و لەئافرەت وەرناگیرێت.

دووەم: لەکەسی گەورە و ئەوەی کەبەتەمەنی بلوغ گەیشتوە وەردەگیرێتو لە منداڵ وەرناگیرێت.

سێیەم: جزیە لەخەڵکی تەندروست باش، کەتوانای کارکردن و سەربازیکردنی هەبێت وەردەگیرێت، لەخەڵکی نەخۆشو پەککەوتە و کەمئەندام وەرناگیرێت.

چوارەم: جزیە تەنها لەدەوڵەمەندانی ئەهلی کیتاب وەردەگیرێت وەك نەسرانی و یەهودی، هەروەها مەجوسی و موشریکەکان ئەگەر دەوڵەمەندبن، واتە: کاتێك توانای پارەدانیان هەبێت، جزیەیان لێوەردەگیرێت، بەڵام ئەگەر لە ناو ئەو

کۆمەڵانەدا هەژار و بێدەرەتان هەبوون ئەوا لە بەیتولمالی موسڵمانان پارە وەردەگرن و دەبێت بەخێویکرێن.

پێنجەم، جزیە لەڕاهیبـو حاخام و ئەو کەسانەی کەخۆیان ساغکردۆتەوە بۆ عیبادەتی دینەکەی خۆیان وەرناگیرێت، بەڵکو جزیە تەنها لەو کەسە وەردەگیرێت، کە توانای جەنگ و کوشتاری هەبێت لەدژی موسڵمانان.

**بەهای جزیە چەندە؟**

ئەگەر سەرنج بدەین لەو کەسانەی کە ڕەخنەدەگرن لەجزیە، کە گوایە بەزوڵم و زۆرداری و سەرشۆڕکردنی گەلانیتر دایدەنێن، ڕونمانکردەوە، کە موسڵمانانیش لە بەرامبەریدا زەکات دەدەن، بزانین شەرعزانان لە ساڵێکدا بەهای جزیەیان چەند و چۆن داناوە لەشەریعەتی ئیسلامدا؟

**موسڵمانانو بێ باوەڕان چەندێك پارەیان لێوەردەگیرێت؟**

نمونەی جزیە وەرگرتن دەخەینەڕوو، لەئەندەلوسدا لەو سەردەمەدا موسڵمانان چەندێك پارەیانداوە وخەڵکی ئەندەلوسیش چەندێك پارەیانداوە لەسەر ئەو مەرجانەی سەرەوە کەباسمانکرد جزیەیان لێسەندراوە، ئەو کەسانەی کەتوانای جزیەدانیان هەبووە هەموو ساڵێك (١)دیناری ئەندەلوسیان بەخشیوە، بەڵام موسڵمانان (٢،٥٪)ی سامانی خۆیان بەزەکات لێوەرگیراوە، ئەگەر شانبەشانی موسڵمانان بجەنگایە ئەواجزیەیان لێ وەرنەدەگیرا و هەقی خۆیشیان دەدرایەوە، ئەگەر ئەم جزیەیە بەراورد بکەین لەگەڵ زەریبەی هەرسەردەمێکدا هەمیشە ئەهلی زیممە پارەیەکی ئێجگار کەمیان بەخشیوە بەموسڵمانان، ئێستا لەزۆر وڵاتدا دەبێت (٣٦٪) زەریبە بدەن، یان زۆرجاریش دەگاتە (٥٠٪) ئێستا زانیمان کەهەمیشە جزیە کەمتر بووە لەزەکاتی موسڵمانان و کەمتریش بووە لەپارەی زە ریبەی وڵاتان.

پێغەمبەری خوا- صلی الله علیەوسلم- فەرمانی پێکردوین، کەقورسایی نەخەینە سەر ئەهلی کتاب وەك لەم فەرمودەیەدا ئاماژەی بۆ کردووە و دەفەرموێت، ( ألا

مَنْ ظَلَمَ مُعَاهِدًا، أَوْ انْتَقَصَهُ، أَوْ كَلَّفَهُ فَوْقَ طاقَتِهِ، أَوْ أَخَذَ مِنْهُ شَيْئًا بِغَيْرِ طيبِ نَفْسٍ فَأَنَا حَجِيجُهُ يوْمَ الْقِيَامَه." أى أنا الذى أخاصمه وأحاجّه يوم القيامه. )رواه أبوداود والبيهقى فى سننهما، والحديث أورده البانى فى السلسلهالصحيحه.

واتە: هەرکەسێك زوڵم بکات لەپەیمان پێدراوێك، یان ئازاری بدات، یان کارێکی پێبکات کەلە توانای ئەودا نەبێت، یان شتێکی لێوەربگرێت کە بەرەزامەندیی ئەو نەبێت، من پشتوانی لێناکەم و ڕووبەڕووی دەبمەوە لەڕۆژی قیامەتدا.

**گوتاری پێغەمبەرایەتی محەمەد -صلی الله علیەو سلم-و خەلیفە پێگەیشتووەکانی.**

**سەرکەوتنی گوتاری سیاسی و ئاینی پێغەمبەری خوا صلی الله علیەو سلم:**

گوتاری پێغەمبەری خوا -صلی الله علیەو سلم- سەرچاوەکەی وەحییە، لەلایەن خوای گەورە ئاڕاستەکراوە، هۆکاری سەرکەوتنەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کات و شوێن، لەو سەردەمەدا خەڵکی لەسەردەمی زوڵم و خۆسەپاندن و نەبوونی فیکر ئەقڵ خوارفیات – دواکەوتووی کۆمەڵایەتی و ڕەوشت و سیاسی بووە.

لەشارستانیەتەکانی ئەو سەردەمەدا، دابەشبوون بەسەر دوو ئیمپراتۆری گەورەی جیهاندا فارس و ڕۆم، هەندێك شارستانیەتی دوور لەو ناوچەیەدا کەهاتنی وەحی بووە.

وێنایەکی مێژووی دەخەینە بەرچاو بۆ ئەوەی گوتاری پێغەمبەر - صلی الله علیە و سلم- جوانتر دەربکەویت خوێندنەوەیەکی واقعی بۆ گوتاری پێغەمبەرایەتی بکەین.

پێغەمبەری خوا - صلی الله علیە وسلم- زۆر بەجوانی بۆمان شیدەکاتەوە، کەئەم ئیسلامە گوتارێکی پارسەنگیی هەیە لەڕووی سیستەمە کۆمەڵایەتیەکان،

خوای گەورە خۆی لەقورئاندا دەفەرموێ: (إنا كل شيء خلقناه بقدر) واتە: هەموو شتێك بەئەندازە و پارسەنگی دروستکراوە.

هەربۆیە لەوەڵامی ئەوەدا کەباس لەماوەی پێش ئیسلام دەکەین وەڵامەکەی ئەوەیە هەتاکو تۆ تاریکی نەبینی بەهای ڕۆشنایی و نور نازانی، پێغەمبەری خوایە - صلى الله عليه وسلم- پێش هاتنی خۆی باسی ڕەوشێکی ژیانمان بۆ دەکات بۆچی لەو سەردەمە هاتووەو هۆکارەکەی چیە؟ کە لەو شوێنەوە دەستپێکردوە، خۆی بۆمان باس دەکات- صلى الله عليه وسلم- لەفەرموودەیەکی قودسیدا کەئیمامی موسلیم ڕیوایەتیکردوە لەعیازەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) زۆر بەجوانی حاڵەتی گوتاری ئەو سەردەمەمان بۆ باس دەکات و دەفەرموێ: إِنَّ اللَّهَ نَظَرَ إِلَى أَهْلِ الأَرْضِ، فَمَقَتَهُمْ عَرَبَهُمْ وَعَجَمَهُمْ إِلا بَقَايَا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ

واتە: خوای گەورە سەیری ئەم زەویەی کرد، ئەگەر سەیر بکەین شتێکی زۆر سەرسوڕماوی تێدایە کەباس لە (مقت) دەکات لەوپەڕی نارەحەتی و ناهەمواری چۆنیەتی بێزاربوون لەسەر زەویدا نیشان دەدات، خوای گەورە کەسەیری زەوی کرد بینی لەعەرەب و عەجەمەکان زۆر و خراپەکاریی دەکەن بێزارییەك و ڕقیکی زۆری لەو سەردەمە بوو، پاشان دەفەرموێت: (بقايا) لەزمانی عەرەبیدا بۆ شتی کەم دێ: واتە پەیڕەوانی پەرتوکە ئاسمانیەکان کەم کەمابوونەوە خەڵکی زۆر کەم کە پەیڕەوییان دەکرد مابوونەوە لەسەر زەویدا کەباشە کاربێت پیاو چاك بێت و لەڕووی سیاسی و ڕەوشتی کۆمەڵایەتی.

باس لەگوتاری سەردەمانێك دەکەین، کەهێشتا پێغەمبەرایەتی دەستی پێنەکردوە، ئەم سەردەمە کەپێغەمبەری خوا -صلى الله عليه وسلم- باسیدەکات خوای گەورە سەیری زەوی کردوە ئەم زەویە هەموو خراپەکار بوون، هیچ کەسێکی باشی تێدا نەماوە، تەنها خەڵکێکی کەم نەبێ، بۆ نموونە لەو سەردەمەدا شارێك نەبووە خەڵکێکی باشی هەبێ، بەڵکو لەجێگایەکدا پیاوێکی باش هەبووە، لەخوراسان پیاوێکی باش هەبووە، هەروەها لەمیسر بەهەمان

شێوە، تورکیا بەمشێوەیە بەهەزارەها میل پیاو باشێك هەبووبێ... ئەمە بەگشتی پێش پێغەمبەری خوایە
-علیه الصلاة والسلام- خەڵکی زۆر لەنارەحەتی و ناهەمواری بووە، چۆن ئەم قسەیە بسەلمێنین خەڵکی سەر ئەم زەمینە ئەوەندە خراپەکاربوون، وەرن باپێکەوە ئەم سنورانە ببڕین و باسی بکەین و بڕۆین و سەیرێکی ژیار و شارستانیەتی و باروگوزەرانی جیهانی ئەو سەردەمە بکەین و گوتاری سیاسی چی بووە؟

ئەگەر تەماشایەکی نەخشەی جیهان بکەین سەرنج بدەین ئەو دەمە جیهان دابەشبوو بوو بەسەر چەند ئیمپراتۆرێتێکدا کەهەمووی خراپەکار و زاڵم و تاغوت بوون لەوانە بریتی بوون لە:

**شارستانیەتی رۆما و گوتاری ئەو ئیمپراتۆریەتە**

چەند ساڵێك بەر لەهاتنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) (٦٠٠ ـ ٦٠٣ز) چۆن ئێستا دنیا دابەشبووە بەچەند هێزێکی گەورە بۆ نموونە ئەمریکا و ڕوسیاو فەرەنساو ئینگلترا....هتد، هەر وڵاتە دەسەڵات و توانای خۆی هەیە ئەو سەردەمەش چەند دەسەڵاتێك بەگشتی توانای خۆیان هەبووە بەسەر زەویدا، یەکێك لەوانە دەسەڵاتی ڕۆم بووە..
لەوانەیە خەڵکێك بڵێ باشە بۆ باسی ڕۆم بکەین؟ چ ئیشێکمان بەڕۆم هەیە؟ خوای گەورە سورەتێکی بەناوی (روم) ناوناوە، کەخوای گەورە باسی کردوە گرنگی خۆی پێداوە، سورەتی ڕۆم باسی دەوڵەتی ڕۆما دەکات ئەبێ بزانین هۆکارەکەی چییە، کەپێغەمبەری ئازیز - صلی الله علیه وسلم- لەوپەڕی نارەحەتی و دژواریدا بووە خوای گەورە سورەتێك دادەبەزێنێت باسی ڕۆم دەکات گوتاری سەربازی و سیاسیمان بۆ دەخاتەڕوو، خەڵکێك پێشبینی دەکرد ئەو سەردەمە سەردەمی مەککی بووە، ئەبوایە باسی تکوینی بیروباوەڕو ئیمانی هاوەڵە بەرێزەکانی پێغەمبەری خوای - صلی الله علیه وسلم – بکردایە، ئەبێ

هۆیەکی خۆی هەبێ کەئەم دینە هیچ شتێکی عەشوائی نیە، هەموو شتێك بەتەوازن و ڕێکخستنە، چونکە دەستنیشانی گوتاری ئەوانمان بۆ دەکات تا پێچەوانەی ئەو گوتارە، گوتاری پێغەمبەرایەتی دابڕێژێت.!
دەوڵەتی ڕۆمی ئەو سەردەمە دەوڵەتێك بوو، کەسێ بەشی قارەی ئەوروپای گرتبوەوە، زۆربەی وڵاتانی ئاسیای گرتبوەوە، لەدوای ئەوەی کە شەڕی ناوخۆ لە دەوڵەتی ڕۆم ڕویدا بوون بەدوو بەشەوە...
بەشێکیان پایتەختەکەیانە کەڕۆمای ئێستایە ڕوخا، کۆمەڵێکیتر، کەڕۆمەکان گرتیانە دەست پایتەختەکەیان کرد بەپایتەختی قوستەنتینیە پاشاکانیشیان بەقەیسەر ناودەبرا، ئەو سەردەمەی کەپێغەمبەری خوایە - صلی الله علیە وسلم- تیایدا هات پاشای ڕۆمەکان لەقوستەنتینیە ناوی (هرقل) بوو.

**لە بواری دیندا:**

با بزانین ژیان و ژیار و شارستانیەتی ئەمان چۆن بوون و چۆن ژیاون گوتاری سیاسی و ڕەوشتی و کۆمەڵایەتیان چی بووە، خەڵکانێك بوون هەمیشە شەڕیان بووە لەناوخۆیاندا بەشێوەیەك تەنانەت مرۆڤەکان بە "دووپێ هەڵواسیوە بەمشار لەناوەڕاستدا کردویانە بەدووکەرتەوە"، تەنها بەهۆی بیروباوەڕەوە لەنێوان خۆیان کەدوو هۆز بوون، نەسارەکان جیابوونەوە بەهۆی ناکۆکیەوە و لەت بوون و بوون بە بەدوو دەوڵەت، ئەوەندە جیاوازیان تێکەوتبوو ڕقیان لەیەکتربوو، یەکتریان دەکوشت، گۆشت و خوێنی جگەری یەکترییان دەخوارد، کۆمەڵێکیان مەزهەبی (ئورتودۆکسی) یان هەبوو کەپێی دەگوترا (کەنیسەی ڕۆژهەڵات)، کۆمەڵێکیتر مەزهەبی (کاتۆلیکی)یان هەبوو پێی دەگوترا (کەنیسەی ڕۆژئاوا)، ئەم دووانە بەدرێژایی مێژوو بەهەزارەها ساڵ پێش ئێستا و هەتا ئێستاش شەڕیان کردوە بەملیۆن خەڵکیان لەیەکتر کوشتوە، پاشان ڕۆما لەناو کەسنیسەی ڕۆژهەڵاتدا لەبەر زۆری ڕاجیایی کەهۆزی (منوفیسیەکان) یان پێدەوترێت توانیان دەسەڵاتی قوستەنتینیە بگرنە دەست، هەرچەندە زۆربەی زۆریشیان بڵاوببوونەوە بەناو میسرو حەبەشە، لەدواییدا باسی لێوە دەکەین.

ئەمە بەگشتی لەڕووی دینداریانەوە بوو کەئەم دوو دەسەلاتە کەوتبوونە شەڕ لەگەڵ یەکتریدا.

ئەگەر سەیری لایەنی ڕەوشتی ڕۆما بکەین، کەچۆن لەڕووی ئەخلاقیەوە لەناوچوون، کەئێستا ئێمەی تێدا دەژین وەك ئەو زەمەنەی لێهاتووە. چۆن؟

**بواری ڕەوشتی:**

مێژوونووسان بەگشتی دەگێڕنەوە لەسەردەمی"هرقل" پێش هاتنی پێغەمبەری ئازیز -صلی الله علیه وسلم- هەرچەند خۆی لەژیاندا بووە. بەلام پێغەمبەرایەتی دەستی پێنەکردوە. خەڵکی ئەو سەردەمە لەناویاندا "عزوبەت" واتە: هاوسەری لەناویاندا ڕوو لەکۆتابوون کردبوو. چونکە ئەوەندە ژن و ژنخوازی گران ببوو کەس نەیدەتوانی ژن بهێنێ لەو سەردەمەدا ئەم باسی دوو ولاتی ڕۆمایە. زیناکردن و داوێنپیسی و شەڕواڵپیسی لەناو خەڵکەکەدا بلاوببووەوە. بوبوو بەشتێکی ئاسایی هەروەك ئێستا کە لەئەوروپا دەبینین ئەوانەی کە لەئەڵمانیاو بەریتانیا و ئەمریکا و ولاتانیتر.. دەبینی: (ئافرەتێك بەدرێژایی چەندین ساڵ لەگەڵ کوڕێکدایە دەڵێی بۆچی نایهێنی و نایکەیتە ژنی خۆت دەڵێ: ژن هێنان قورسە ئاخر ئەگەر ژن بهێنم، ئەبم بەهاوبەشی ژیانی، بەڵکو هەر لەگەڵیا ڕائەبوێرم باشترە لەژێر ناوی هاوڕێیەتی و ڕەفاقەت و گێڵ فرێندو... )هتد

ئەو سەردەمە بەو شێوەیە زیاتر خەڵك گرنگیان نەدەدا بەبواری هاوسەرگیریی، بەڵکو لەبیرکرابوو، خەڵك زیاتر ڕووی لەفەساد و داوێنپیسی بوو..

بەرتیل (ڕەشوە) ببوە شتێکی ئاسایی وەك ئەوەی موچەخۆرەکانی دامودەزگای دەوڵەت ئیشیان نەدەکرد، بەبێ وەرنەگرتنی بەرتیل، خەڵکی ڕۆم هەمیشە حەزیان لەکوشتنی یەکتربوو، بۆ نموونە لەوسەردەمەدا گیانلەبەرێکیان دەهێنا، گیانلەبەرەکە لەگەڵ مرۆڤەکان شەڕیان دەکرد هەروەك شێرو پڵنگ لەگەڵ مرۆڤ شەڕیان پێدەکردن، سەرکردەکانی ڕۆما و خەڵکەکە کۆدەبوونەوە و پێدەکەنین بەو دیمەنانە ئاسوودە دەبوون، یاخود شتێکی دیکەهەبوو پێیان دەگوت (گلادیاتۆر) لەوانەیە بپرسن ئێستا ئەو دیاردانە نەماوە ئەو سەردەمە

پێویستیکرد پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم- خاوەن گوتاری تایبەت بێت، بەلاّم ئێستا کوا خەڵکانێك بەدوایی ئەوانەدا دەگەڕێ؟ وەکو گیانلەبەران لەگەڵ مرۆڤدا شەڕبکات، ئەم دیاردەیە بەردەوامە تا ئێستا دەبینرێت لەناو خەڵکیدا، ئەوەتا دەبینین لەئیسپانیا " گا" بەرەڵا دەکەن لەناو خەڵکیدا و پێدەکەنن و چێژی لێدەبینن هەر بەجلی سەردەمی ڕۆمەوە ئەم دیاردە باوە ناونراوە بەشارستانیەت، کەئێستا ئێمە دەیبینین، شێوەی گلادیتۆر نەماوە، بەلاّم ئیستا لەئەمریکادا زیاد لە٢٠ پیاو کۆدەکەنەوە هەریەکە دەمانچەیەکیان ئەدەنێ لەسەر سەری یەکتر دادەنێن، لەناو هەر دەمانچەیەکدا یەك فیشەکی تێدایە ئەگەر فیشەکەکە بەر پەلپیتکە کەوت ئەو دەکوژرێت، ئەگەر نا ئەو دەمێنێتەوە، تا لەناو ئەو بیست کەسە دووکەس دەمنێتەوە هەریەك لەوان چەندجار دەمانچەکە دەچرکێنن تا ئەو کاتەی یەکیکیان لەناودەچن، ئەمە ئێستا لەولاّتانی ئەمریکادا زۆر باوە لەولاّتانی ئەوروپای شەرقی تا ڕادەیەك دەکرێت، کەگەورەترین قومارە لەجیهاندا.

**بواری سەربازی:**

لەکاتی شەڕدا شەڕێکی زۆر دڕندانە و گەورەیان دەکرد، هەروەك لەسەردەمی قیسەرەکان کەپێی دەوترێ سەردەمی (فسفسیان) قەیسەرێکی ڕۆمی بوو زۆر ڕقی لەجولەکەکان بوو، هات شاری قودسی ئێستا کەپێی دەگوترا، ئورشەلیم بۆماوەی ٥ مانگ ئابڵوقەی ئابووری خستە سەر قودس وەك مێژوونوسان دەڵێن: (لەسێپتەمبەری ساڵی ٧٠ میلادی) بەتەواوی ئەو شارە کەوتە دەست ڕۆمەکانەوە، ئەگەر سەیری ئەم دەوڵەتە بکەین دەبینین چیانکرد بەیەهودی چەندە دڕندانە ڕەفتاریان کرد لەگەڵیاندا، لەسەرەتادا ڕۆمەکان هەموو جولەکە کانیان کۆکردبوەوە ئەو مێژووە ناونراوە بەدۆڕاندنێکی ترسناك لەبەرامبەر ڕۆمادا، مەگەر جولەکەکان لەسەردەمی (بوختەنەصردا) ئەوەندەیان لێ کوژرابێت، ئەم پیاوە لەڕۆما هەستا بەوەی کەگوتی: چی یەهودی هەیە بەدەستی خۆیان ژن و مناڵیان بکوژن، بەشێوەیەکی گشتی یەهودیەکان حەزیان بەژیانە، هەستان

بەوەی ژن و منداڵەکانیان بەدەستی خۆیان کوشت تەنها بەهۆی مانەوەی ژیانی خۆیان.
پاشان پادشای ڕۆم داوای لێکردن قورعە بکەن لەنێوان دوو جولەکەدا کەئەبوایە یەکێکیان براکەی خۆی بکوشتایە! وەك مێژوو دەگێڕنەوە زۆر بەکەمی لەقودس خەڵك مایەوە و ئەوانەی توانیان ڕایانکرد و ئەوانەی کەمانەوە هەموو لەناوچون.
ئەمە لەڕووی حاڵەتی ڕەوشتی و شەڕ و جەنگیانەوە بوو.

**بواری کۆمەڵایەتی:**

لەڕووی کۆمەڵایەتیانەوە دەوڵەتی ڕۆما باجێکی زۆری خستبووە سەر ئەو خەڵکە واتەوایلێهاتبوو خەڵکەکە بەگشتی هەژاربوون هەتا ئەو سەردەمەی باسی لێوە دەکرێ، ئەو سەردەمە فەیلەسوفی گەورە بەناوی (ئەفلاتون) کتێبێکی هەیە بەناوی (جمهوریە افلاطون) یاخود بەعەرەبی پێیدەوترێ (صاحب الفکر مدنیە الفاضلە) یاخود (یتوبیا)، لە ئەندێشەی خۆیدا ئەفلاتون باسی لێوەکردوە و دەڵێت: لەو شارەدا هیچ بەندەیەك مافی هاوڵاتیبوونی نەبووە با خەڵکی ئەو شوێنەش بووبن، ئەمە وای لێهاتبوو خەڵکەکە زۆربەی ببووە بەندەی دەسەڵاتدارەکان،زۆربەی خەڵك هەژاربوون، لەڕێگای ئەم یاسایەوە هەرکەس خەڵکی ڕۆما نەبوایە بەبەندە و کەنیزەك هەژماردەکرا لەدەوڵەتی ڕۆمادا، ئەمە باسی گوزەرانی وڵاتی ڕۆما بوو بەگشتی.

بەهاتنی پێغەمبەری ئیسلام گوتاری پێغەمبەرایەتی، هیچ جیاوازی لەنێوانی بیلالی حەبەشی و صوهەیبی ڕۆمی و سەلمانی فارسیدا نەدەکرد..
جەنگ و روبەڕووبوونەی پێغەمبەری خوا -صلی اللە علیە وسلم- بۆ گەیاندنی گوتاری یەکتاپەرستی و بڵاوبوونەوەی خواناسی و ئازادکردنی بەندەکان بووە.
هەرگیز گوتاری پێغەمبەرایەتی هەوڵی نەداوە ببێتە خاوەن باڵەخانە و دەوڵەمەندی و دوای سەروەت سامان کەوتبێت، گوتاری بۆ ئەوە بووە برایەتی نێوان گەل وهۆزەکان ڕێکبخات و جەنگ و ئاشوب نەمێنێت، بازاڕی لەدەستی

جولەکەکاندا دەرهێنا بۆ ئەوەی خەڵکی دەستەنەخواری جولەکە نەبن و بازاڕ قۆرخ نەکەن[٧١].

لە شارستانیەتی فارسدا خراپتربوو لەڕوم، با گوزەرێك بەناو گوتاری سیاسی دە وڵەتی پارسیا یاخود فارس یان ساسانیەکاندا بکەین:

**شارستانیەتی پارس (فارس)..**

پێشهاتنی پێغەمبەری خوا صلي الله علیه و سلم، فارس دەسەڵاتێکی زۆریان هەبوو، هەروەکو دەوڵەتی ڕۆم چۆن پادشایان هەبوو فارسیش پادشای خۆیان هەبوو بەناوی (کیسرا) بار و ڕەوشی ژیار و شارستانیەتیان بەهەموو پێوەرێکی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی لەخراپترین بار و گوزەراندا بوون، لەڕووی دینیشەوە بەهەمان شیوە بوون، مێژوونوسان خۆیان باسیدەکەن، دەوڵەتی ساسانی یاخود دەوڵەتی فارسی کەکوردیشیان داگیرکردبوو، "کەئێستا خەڵکێك هەمیشە باسی ئەوەدەکەن دەڵێن: ئیسلام هاتووە وڵاتی ئێمەی داگیر کردوە. وەرن سەیر بکەین کەچۆن ئەو دەوڵەتەی پێیدەگوترا: دەوڵەتی ساسانی یاخود دەوڵەتی پارس چۆن ژیانیان بەسەربردووە، شارستانیەتیان پیکهێناوە گوتاری سیاسیان چیی بووە؟!"

**بواری ڕەوشتی:**

لەناو ئەمانەدا هاوسەرگیری نەبوو لەسەردەمی کیسرای یەزگورد کە (یەزگوردی دووەم)ی پێدەوترێ، ئەم پیاوە کچەکەی خۆی مارەکرد، لەناو ئاینی زەردەشتیەتدا محرەم نامێنێ... دایك لەکوڕی مارە دەکرێ باوك لەکچی خۆی دایك لەکوڕی خۆی، ئا بەمشێوەیە لەناو ئاینی زەردەشتیەتدا بڵاوبووە لەسەردەمی کیسرا (بورهامی جوبین)ی پێیدەوترێ، ئەم کابرایە خوشکی خۆی هێنا، ئا بەمشێوەیە لەڕووی ئەخلاقییەوە ڕوخابوون هەتا لەسەردەمی (قوباد)، " ئێمە دوو قوبادمان هەیە قوبادێك لەسەردەمی ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) لەدوای

[٧١] العالم قبل الاسلام.. د. راغب السراجاني ل١٨

شۆڕشی جەلەولاو خانەقین و شارەزور کرا دژی فارسەکان، کەسیك بەناوی "قوباد" کەپیاویکی کوردی موسڵمان بووە زۆرجار بەشوێنکەوتووی پیغەمبەر دانراوە، چونکە قوتابی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس بووە – والله اعلم- ئەوەی دەیەوێ زانیاری زیاتر دەستکەوێت دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەی مێژوویی ئیبن ئەسیر کتێبی (کامل في التاریخ)"

لەسەردەمی قوبادی فارسدا فەیلەسوفێك هەبووە بەناوی (مەزدەك) ئەم پیاوە فەلسەفەیەکی داهێنا ڕووداوێکی دروستکرد لەدەوڵەتی فارسدا یەکسانی دامەزراند لەنێوان خەڵکدا وەکو ئەم فیکرە شوعییتەی ئێستا هەیە، واتە: "ئیشتراکیەت"، گوتی هەموو خەڵکەکان یەکسانن!..

ئەمە بەڕووکاریی شتێکی جوان و ئاساییە، بەڵام لەناوەخندا خەڵك وایلێهات نەیاندەزانی ئەرك و مافی خۆی چیە؟ ڕێزی خەڵك نەئەگیرا، وایلێهات خەڵکی لەسەروەت و ساماندا یەکسان بوون، بەهەمانشێوە بەرامبەر ئافرەتیش یەکسان بن، واتە هیچ کەسێك خاوەندارێتی هیچ شتیك نیە ئەو شوعییەتەی کەئێستا خەڵك ئیشی بۆدەکات "مەزدەك" دایناوە هەتاکو مارکس لەدواییدا گەشەی پێداوە و بەناوی ماددیەتی فیورباخی، یان ڕاڤەکردنی مێژوو و مەسەلەی دیالەکتیکی هاتووە و کاری لەسەر کردوە، تا بووەتە ئایدۆلۆژیەك و خەڵکیك شانازیی پێوەدەکات، ئەمەش خەڵکی بەهێز دەچووە ماڵی خەڵکی لاوازو تواناو دەسەڵاتی نەبوو پارەو ژنی داگیر دەکرد، شوعییەت ببووە دینی سەردەمی کیسرا بەناوی قوبادەوە بوو، با جیاوازییەك بکەین لەگەڵ ئەو یەکسانیەی مەزدەك و ئەو یەکسانیەی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - دەفەرموێت: ( وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا) وەرن با پێوەریك بکەین، کەپێغەمبەری خوا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێ: (ئەگەر فاتیمەی کچم دزی بکات دەستی دەبڕم) کامیان یەکسانیە؟ بێگومان ئەوە گوتاری پێغەمبەرایەتیە - صلى الله عليه وسلم-

**بواری کۆمەڵایەتی..**

لەڕووی کۆمەڵایەتیشەوە پیرۆزییەکی زۆر گەورەیان دابوو بەکیسراکانیان واتە کیسرایان بەپیرۆز ڕادەگرت ئەوان وایان هەستدەکرد خەڵکی ئەو سەردەمە، کەخوێنی خوا "نعوذبالله" تێکەڵبوە لەگەڵ خوێنی کیسراکانیان واتە ئەمان لەسەرو یاساوە و بەبەرزی ڕایاندەگرتن، هەتا دەهاتنە بەردەمی کیسراکان سوجدەیان دەبرد، تافەرمانی نەکردایە بەوەی سەری لەسوجدە بەرز بکردایەوە سەری بەرز نەئەکردەوە، ئەوەندە بوغراو خراپەکاربوون لەناو کیسراکانیاندا بەچینایەتی دەوەستان لەبەرامبەریاندا، ئەوانەی نزیك بوون لەکیسراکانیانەوە چینی (کاهینەکانیان) پێدەوترا (ئاگرموان) یان (ئۆترۆبان) دوو بۆ پێنج مەتر دووربوون لەکیسراکانەوە..

پاشان کاربەدەست و وەزیر دێتە پێشەوە ئەوانیش ئەبوایە لەپشتی ئەوانەوە بوەستانایە، پاشان خەڵکێك وەك سەفیرو ئەوانەی سەردانیان دەکرد ١٠مەتر دووربوون لێیەوە خەتیان دەکێشا لەو خەتەبمێننەوە، ئەگەر خەڵکێکی تر بهاتایە قسەی لەگەڵ بکردنایە ئەبوایە پارچە قوماش بپێچن بەلوتیانەوە بۆئەوەی ئەو ژینگەیەپیس نەکات، ژینگەی پاك بۆ کیسرا دروستبکرێت.

بەڵام وەرن جیاوازییەك بکەن لەگەڵ گوتاری پێغەمبەری خوایە -صلى الله عليه وسلم- (كان رسول الله صلى الله عليه وسلم إذا استقبله رجل فصافحه لا ينزع يده من يده حتى يكون الرجل ينزع، ولا يصرف وجهه عن وجهه حتى يكون الرجل هو الذي يصرفه، ولم يُرَ مقدمًا ركبتيه بين يدي جليس له(أي يتواضع لجليسه فلا يمد رجله أمامه). روى ذلك الترمذي وابن ماجه عن أنس رضي الله عنه).

کاتێك یەکێکی ببینیایە پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم - تەوقەی لەگەڵ بکردایە، تا ئەو کەسە دەستی لەدەستی موبارەکی دەرنەدەهێنایە پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه وسلم- دەستی دەرنەدەهێنا، هەتا لەو فەرموودەیەدا دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا دەم و چاوی قەد لەدەم و چاوی ئەو کەسە وەرنەدەگێڕا، کەقسەی لەبەرامبەردا دەکرد، سەروەرمان دائەنیشت لەسەر ئەژنۆ

دەستی دەخستە نێوان ئەژنۆکانیەوە وەك تەوازوعێك بۆ ئەو کەسەی کە لەبەرامبەریدا دەوەستا، ئەگەر سەیر بکەین پادشاکان هەمیشە خۆیان لەگومڕاییدا دەژیان، ئەگەر بەراوردێك بکەین دەبینین، کە ئەم پادشایانە چۆن ڕەفتاریان کردوە، پاشان پێغەمبەری خوا- صلی الله علیه وسلم- کەهیچ کەسێك ئەو توانایەی نەبووە وەك ئەم ئازیزە ڕەفتاربکات.
لەناو چینایەتی دەوڵەتی فارسدا کە بەیەکسانی باسی ژیانی کۆمەڵگەیان دەکرد، مرۆڤەکان دابەش کرابوون بەسەر چەند چینێك؛

چینی یەکەم: چینی کیسراکان بوون ئەمانە ڕاقیترین خەڵك بوون.
چینی دووەم: " ئەشراف" بریتی بوون لەحەوت خێزانی شەریف لەدەوڵەتی فارسدا تەنها ئەو حەوت خانەوادەیە هەبوون کە بەناوبانگ بوون و کەس لەوان شەریفتر نەبوو.
چینی سێیەم: رجال دین، یاخود پیاوانی ئاینی.
چینی چوارەم: هێز و سوپا و پیاوانی جەنگ.
چینی پێنجەم: نوخبەی ڕۆشنبیرەکان وەك پزیشك و شاعیر و نوسەر و ئەدیب و ساحیرەکان، لەو سەردەمەدا زۆر گرنگیان بەخورافیات داوە.
چینی شەشەم: چینی دەهاقین ئەم چینە هەمیشە گەڕاون بەلادێ و شار بۆ کۆکردنەوەی سەرانە و باج و خەراج.
چینی حەوتەم و کۆتایی: چینی هاولاتیانە بەگشتی لە٩٠٪ ی ئەم خەڵکە خەڵکی هەژاربوون، بریتی بوون لەکرێکار و بازرگان و سەرباز و کۆیلە....هتد، ئەمانە هەموو مافیان وەك یەك بووە، هەتا لەشەڕدا لەپێشەوە وەك سەنگەر ئەم خەڵکەیان بەکاردەهێنا، هەروەك خالیدی کوڕی وەلید ڕەزامەندی خوای لێبێت لەشەڕی (ئوبەلائدا) لەو شەڕەدا کەپێیدەگوترێت (ذات السلاسل)، ٦٠هەزار کەسیان بەستبوەوە بۆئەوەی ڕانەکەن لەبەرامبەر موسڵمانەکاندا ئەوەندە گرنگیان بەخەڵکەکە نەئەدا بەزنجیر ئەیانبەستنەوە بۆئەوەی ڕانەکەن..

بۆیە کیسرا وایدەزانی، کەموسڵمانەکان هەڵدێن لەڕووی سوپای فارسدا، بەڵام خالیدی کوڕی وەلید دەڵێت: لەشەڕی ئوبەلائدا نامەم بۆ ڕۆستەم نارد و لەم نامەیەدا دەڵێت: (جئتكم برجال يحبوون الموت، كما تحبوون أنتم الحياة).. من بەخەڵکێکەوە هاتووم کەئەوان مردنیان خۆشدەوێ، چەند ئەوان مردنیان خۆشدەوێ ئەزانم ئێوەش ئەوەندە ژیانتان خۆشدەوێ، بۆیە ئەم ئیسلامە ئاوا سەرکەوتووە..

وەرن پێکەوە با سەیری ئێستامان بکەین کاتێك خالیدی کوڕی وەلید ئەو قسەیە دەکات لەبەرئەوەی پێغەمبەری خوا بەئاشکرا بۆمان باسدەکات لەفەرموودەیەکدا دەفەرموێ: ئێوە لەبەرئەوە ئاواتان لێهاتوە هیچ ئەرزشیکتان نەماوە وەك کەفی سەردەریاتان لێهاتوە، لەبەرئەوە (تحبون الدنيا) دنیاتان خۆشدەوێ، لەمردنیش دەترسن ئەوان لەو سەردەمەدا خۆشەویستی مردن لەدڵیاندا بووە، ئەمەش وەك نموونەیەکی دیکە لەگوتاری سیاسی پیغەمبەر - صلی الله علیەوسلم - خستمانە پێش چاوتان.

**بواری سیاسی:**

لەڕووی سیاسییەوە ئەوان ئەهلی ساسانیان پێدەگوترا تەنانەت منداڵێکی بچوکیشیان (ئەردەشیری کوڕی شیروانی) حەوت ساڵ بەئارەزووی خۆی حوکمی ئەدا، بۆیان نەبوو قسەیەك بکەن، یاخود کچێك بەناوی (بۆرانی کچی کیسرا) بەو ناوە هاتووە تەمەنی چەند ساڵێك بووە توانیویەتی بڕیاربداو هەموو کەس ڕێز و حورمەتی لێگرتووە..

**بواری ئاینی:**

دەوڵەتی فارس ئاگریان پەرستوە، ئاینیان زەرادەشتی یاخود دینی زەرادەشتی، مێژوونووسان باسیان کردوە ئەم زەرادەشتیانە ئاگریان بەپیرۆز ڕاگرتووە، هەموو ئاگرێکیان بەپیرۆز ڕاگرتووە، تەنانەت زۆرجار خەڵکی نەیتوانیوە ئاگر بەکاربهێنێت لەبواری ئاسنگەری و پیشەسازیدا... هتد.

هەربۆیە لەوسەردەمە دەوڵەتی فارس ناسرابوو بەدەوڵەتێکی کشتوکاڵی و بازرگانی، ئەگەر شتێکیان پێوسیت بوایە لەدەوڵەتی دەرموەی خۆیان هێناویانە. لەبیروباوەڕی ئەواندا ئاگریان بەپاك و بێگەرد داناوە، هەرچەندە ئەترۆبانێکیان بکردایەتەوە کەئاگرەوانی پێدەوترێت یاخود "مەعبەدێکیان " بکردایەوە ئەبوایە ئافرەتێکیان بکردایە بەقوربانی یا کوڕێکی نابالغیان بکردایە بەقوربانی[٧٢].

**شارستانیەتی ئەوروپا و ئەسکەندناڤیا گوتاری سیاسی:**

ولاتانی ئەوروپا بەشی ئەسکەندناڤیا و ئەلمانیا و...هتد. ئەو ناوچانەی ڕۆم دەستی بەسەریاندا نەگرتبوو.لێرەدا نموونەی مێژوونووسێکی فەرەنسی دەهێنینەوە کەناوی (ڕینو)یە ئەم پیاوە باس لەگوتارو ڕەوشی ئەوان دەکات دەڵێت: (پێش هاتنی ئیسلام خەڵکی ئەو سەردەمە خەریکی تاوان بوون تەنانەت ڕایاندەکرد لەپاك و خاوێنی و مەدەنیەت نەمابوو لەنێوانیاندا، لەجاهیلەتدا دەژیان هەمیشە خەڵکێك بوون گەڕاون بەدوای پیسی کەبەساڵ خۆیان نەشوشتوە، بەلای ئەوانەوە وابوو ئەو پیسیە کە لەسەر لاشەیان کۆدەبێتەوە ئەوا خێرو خێراتیان دەستدەکەوێت و بەنەمری و سەربەرزی دەمێنێنەوە، هیچ زانست و زانیارییەك نەبووە، خەڵکی سەرەتایی ژیاون) ئەگەر بەراوردێك بکەین لەگەڵ یەکەم ئایەت کەبۆ پێغەمبەرەکەمان - صلى الله عليه وسلم- هاتە خوارەوە خوای گەورە دەفەرموێ: (أقراء) واتە: بخوێنە لەشوێنێکدا کەنیوە دورگەی عەرەبە، ڕینۆ باس لەئەوروپا دەکات بەدەیەیەك پێش هاتنی پێغەمبەر دەڵێ: (مسرحية للحروب و أعمال الوحشية) ئەوە گوتاری سیاسی ئەوروپا بووە، شانۆیەك بووە بۆ شەڕ و کردەوەی دڕندانە و بەربەری.

مێژوونووسێك بەناوی (گۆستاف لۆبوون) کتێبێکی هەیە بەناوی (حضارة العرب) لەو کتێبەدا باس لە ١١ ساڵ پێش هاتنی پێغەمبەرایەتی محەمەد دەکات -

---

[٧٢] العالم قبل الاسلام.. د. راغب السراجانی ل٢٠

صلى الله عليه وسلم- و باسی ئەوروپا دەکات دەڵێت، هەموویان لەبەربەریەتێك و هەمەجیەتێك ژیاون کەتواناى ئەوەیان نەبووە بەدواى مەعریفەدا بگەڕێن و کەسێکى خوێندەواریان نەبووە، وایلێهاتوە شانازى بەو جەهالەتەوە بکەن... پادشاکانیشیان شانازیان بەنەخوێندەوارییانەوە دەکرد، لەسەدەى ١١و ١٢ ى میلادى پاشان ئەوان هەوڵى مەعریفە و زانست و پێشکەوتنیان دا، ئەگەر بەراوردى بکەین سەدەى ٤ى هجرى دەکات، ئەگەر سەیرى سەدەى ٤ و ٥ ى هجرى موسڵمانان بکەین دەبینین لەچ هێز و تواناو دەسەڵاتێکدابوون.

مێژوونووسێکى ئەندەلوسى بەناوى (صاعد) لەسەدەى ٥ى هجرى ساڵى ٤٦٢ هجریدا لە (طولەیطلە) ئەم کتێبەى نوسیوە هەر لەوێش مردوە، ئەو لەتولەیتلە دەژییت و کتێبێکى نوسى بەناوى (طبقات الأمم) لەو کتێبەدا باس لەحاڵەتى دەوڵەتانى ئەوروپا دەکات بەتایبەت ئەسکەندەناڤیا (دانمارك، سوید، نرویج، فنلندا) پۆلێنیان دەکات و دەڵێ؛ (هم أشبه بالبهائم منهم بالناس) واتە؛ وەك ئاژەڵ ناویان دەبات، هیچ توانایەکیان نەبووە، تەنها خواردنیان خواردوە حیوانیان سەربڕیوە بەبێ برژاندن خواردویانە، کەسێکیتر باس لەئەوروپا دەکات بەناوى (إبراهیم طرطوشى) ئەمیش خەڵکى ئەندەلوسە خەڵکى شارى (جلیقیە)ى کە ئێستا بەناوى (کلیە) ناو دەبرێ لەباکورى ئیسپانیایە لەنزیك فەرەنسادا، باس لەوە دەکات خەڵکى ئەوێ بەگشتى خۆیان نەدەشوشت تەنانەت دەڵێ؛ (**أهل غدر ودناءة أخلاق لا يتنظفون ولا يغتسلون في العام إلا مرةً أو مرتين بالماء البارد، ولا يغسلون ثيابهم منذ يلبسونها إلى أن تنقطع عليهم، ويزعمون أن الوسخ الذي يعلوهم من عرقهم تصحُّ به أبدانهم**)

واتە؛ هەموویان خەڵکیکى ناپاك بوون ئەهلى غەدربوون لەساڵێکدا یەکجار خۆیان دەشوشت، یان دووجار ئەویش بەئاوى ساردو جل و بەرگیان نەدەشوشت، واهەستیان دەکرد ئەم پیسییە وەکو دەستکەوتنى خێر و نزیکبوونەوەى خوایە.

ئەگەر بەراورد بکەین لەگەڵ گوتارى پێغەمبەرایەتى و هاتنى دینێك، کەدێت فەرمان دەکات لەشەو ڕۆژیکدا ٥ جار دەست و دەم و چاوو قاچ بشوات، لەهەموو

جەنابەتێکدا (غوسڵ) لەڕۆژی هەینی غوسڵ دەربکەین، لەڕۆژی جەژندا غوسڵ دەرکەیت، هەتا گەورەترین بەندایەتی ڕۆژی هەینییە، بەڕێزترین بەندایەتیە لەکاتێکدا ئەگەر (پیاز) یاخود (سیر)ت خواردبێ دەبێ لەو بەندایەتیە خۆت دووربخەیتەوە!، ئەمەش بەرزی مرۆڤ دەردەخات لەلای ئیسلام، چونکە دوورخستنەوەی خۆتە بۆ پاراستنی موسڵمانانی دیکە.

ئینجا لەڕووی پاراستنی مافی خەڵکیەوە ئیسلام تەنانەت مافی کافرو بێباوەڕەکانیش دەپارێزێت و بەئەرکی سەرشانی دەزانێت، خوای گەورەدەفەرموێت: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لاَّ يَعْلَمُونَ﴾ ٦ التوبة

واتە: خۆ ئەگەر کەسێك لەهاوەڵگەران داوای پەنای لێکردیت ئەی پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم- ئەی ئیماندار، ئەوەتۆش پەنایبدە، گوێی لەفەرمودەکەی خوا (قورئان) دەبێت، پاشان بیگەیەنە بەو شوێنەی دەیەوێت و ماڵ و گیان و ژیانی تیایدا پارێزراوە، ئەم میهرەبانیە لەبەرئەوەیە ئەوانە کەسانێکن نازانن خواناسی چیە.

کەسانیتر وەکو ئیبن فەضلان ئەویش لەئەندەلوس ژیاوە باس لەوە دەکا، کەهەمیشە خەریکی خراپەکاری بوون بۆ نموونە لەکتێبەکەیدا باسی ئەوە دەکات کاتێك ڕێزی سەیدیان گرتبێ، (سید) بەمانای خاوەنی بەندە بووبێ. کە بمردایە ئەوانەی لەگەڵیدا بوون بەندەکان یاخود ئافرەت و جاریەی هەبووایە ئەهاتن سەرخۆشیان دەکرد، هەندێك طقوساتی دینییان پێدەکرد، پاشان ملیان لەدوولاوە دەبەستەوە بەگوریس لەدواییدا دوو کەس ڕایاندەکێشا تائەمرد!

خەنجەرێکیان دەکرد بەدڵیا، تا خوێنەکەی بەسەریدا دەهاتە خوارەوە خوێنەکەی دەکەوتە سەر سەیدەکەی، هەروەها باسی ئەوەش دەکات وەك ڕێزێکە بۆ سەید و پیاوەکەی ئەو کارەیان ئەنجامداوە.!

ئینجائەوە پێوەر بکەن بەگوتاری ئاینێك کە...

پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم- لەفەرموودەیەکدا کەموسلیم ڕیوایەتیکردوە دەفەرموێت: (مَنْ لَطَمَ مَمْلُوكَهَ أَوْ ضَرَبَهُ فَكَفَّارَتُهُ أَنْ يَعْتِقَهُ) واتە: هەرکەسێك شوختێ بخاتە بەندەکەی خۆیەوە یاخود لێدانێکی لێ بدات، ئازارێکی بدات کفارەتەکەی تەنها ئەوەیە دەبێ ئازادی بکات، ئەوان ڕێزی سیدەکەیان گرتوە کەخاوەنی بەندەکە بوە، بەلاّم کەبەرامبەریدا سوتاندویانن یان کوشتویانن ئەمە بەگشتی حاڵەتی ئەوروپا بوو، پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم- مافی بەندەکە دەست نیشاندەکات تا وای لێدێت ئیسلام بەندە ناهێڵێت، لا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: عَبْدِي وَأَمَتِي، كُلُّكُمْ عَبِيدُ اللَّهِ، وَكُلُّ نِسَائِكُمْ إِمَاءُ اللَّهِ، وَلَكِنْ لِيَقُلْ: غُلامِي وَجَارِيَتِي، وَفَتَايَ وَفَتَاتِي..

هەروەها پێغەمبەر- صلی الله علیه وسلم- دەفەرموێت: بەبەندەو کەنیزەکانتان بڵێن، کورەکەم، یان کچەکەم، وەیان وەك منداڵی خۆتان هاوسەرگیریان بۆ بکەن لەکوڕ و کچ، لەجل و بەرگی خۆتانیان لەبەر بکەن، هەروەها لەو خواردنەی دەیخۆن بیاندەنێ[٧٣].

**شارستانەیتی میسر..**

لە میسر چی ڕویداوە پێش هاتنی پێغەمبەری خوا -علیه الصلاة والسلام-، لەسەرەتاوە زانیمان دوو دوڵەتی ڕۆمان هەبووە، دوڵەتێکیان بەتەواوی کۆتایی پێهات، سەردەمی (کلیۆپاترا) لای هەموان زانراوە (هۆکتافیۆس) لەساڵی ٣١ پێش میلاددا میسری گرت، پاشان لەسەردەمی (ئۆختۆص) قەیسەرێکی تربوو توانی دوڵەتی ڕۆژئاوا بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.

[٧٣] قراءة سیاسیة للسیرة النبویة: محمد رواس قلعەجی ل١١-١٣

لەساڵی ٤٦٧ی زاینی و اتا نزیکە ١٥٠ساڵ پێشهاتنی پێغەمبەری خوا -علیه الصلاة والسلام- دەوڵەتی ڕۆمانیای ڕۆژئاوا میسری خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، ئەم وڵاتە چیان کرد..!

پاش ئەوەی ڕۆژئاوای میسری خستە ژێر دەستی خۆیەوە دووبارە دەوڵەتی ڕۆمی ڕۆژهەڵات توانی دەست بگرێ بەسەر میسردا لەشەڕێکدا دژی کەنیسەی ڕۆژئاوایی هات و میسری کرد بەجێگەی مەخزەنی خۆراکی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی، ئابووری نزم بومەوە خەڵکەکەی دورخستەوە لەهەموو بوارێکی زانست و زانیاری و پێشکەوتن وکۆمەڵگەکەی بەرەو دواکەوتویی برد، تەنانەت ڕۆما سوڵتەی لەدەسەڵاتی میسری سەند بۆخۆی، ئەوەشی مابوو بۆ ئەوەی شۆڕش بەرپا نەبێ کۆمەڵێکی دروستکرد وەکو ئەم خەڵکەی ئێستا، کەدەبینین وەك ئەمریکا هەرکەس لایەن و نفوزی خۆی بێ ئەوا دەیهێنێ و دەیخاتە سەر وڵاتەکە بۆئەوەی شۆڕش کپ بکاتەوە زۆری خەڵکەکە لەدژیان هەڵنەستێ، پاشان باجی لەسەر خەڵکی میسری دانا، باجی لەسەر زەوی و زاری خەڵکی و مەڕوماڵات لەسەرفرۆشتن و کەلە و پەلی ناوماڵ دانا، کەمێژوونوسان باسی لێوە دەکەن، باجی گواستنەوەی دانابوو تەنانەت باجی لەسەر ژنهێنان و شوکردن دانابو.

ئەمەی کەباسمان کرد لەم ڕۆژگارەدا هەیە، هەروەك لەهەندێك وڵاتی وەك نەرویج کاتێك لەشارێکەوە دەچیتە شارێکیتر باجی ڕێگا دەبێ بدەیت، لەو سەردەمەشدا باج لەسەر قەبر و دفنی مردووەکانیان سەندوە، بەهەمان شێوە ئێستاش هەروایە کەسێك بمرێ باجی لێدەسەندرێ، هەر ئەو ڕوداوانە دووبارە دەبێتەوە لەئێستا و ڕابردوشدا کەڕویدابو.. باجی تەلەفزیۆن کەئێستا هەیە هەمان باجە کەلەسەر کەل و پەل و پێداویستی ماڵ لەو کاتەدا سەندراوە ئێستاش بەردەوامە لەم وڵاتانەدا، هەربۆیە هەمیشە دەڵێین: مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە گوتارەکەش دووبارە دەبێتەوە، لەسەروی هەموویانەوە ئەشکەنجەیەکی

زۆری دەدان تەنها لەبەرئەوەی ئەوان کاتۆلیکی بوون و لەژێر چەتری نەسرانیە ئۆرتۆدۆکسیەکاندابوون[٧٤].

**شارستانیەتی چین:**

پاشان وڵاتێکیتر بەناوی چین کەئیمپراتۆریەت بوون خاوەنی سێ ئاین بوون، بە٠١سال پێشهاتنی پێغەمبەری خوا -علیە الصلاة والسلام-

یەکەم ئاینیان پێی دەگوترا (لاوتستۆ) ئەم دینە دینێکی کرداری نەبووە، شتێکی بێهودە بوو خەڵك زۆربەکاری نەهێناوە، بەڵام دینی لاوتوستۆ باوبوە.

ئاینی دووەم؛ بەناوی (کۆنفۆشیۆس) ئەوانیش بەگەورەیی فەلسەفە و دەسەڵاتدارانی چین ناودەبرێ، لەدواییدا دەبێتە ئاین و یاسای بۆدادەنرێ دەیپەرستن.

ئەم ئاینە باس لەژیان دەکات، کەژیان شتێکی بێهودەیەو هیچ گرنگییەکی نیە بەئارەزوی خۆتە پەرستنەکان وەك دارپەرستن، ئاو، مشك و...هتد.ئازادی داوە مرۆڤەکان چی دەپەرستن.

ئاینی سێیەم؛ دینی (بوزا یاخود بودا) ئەمیش فەیلەسوفێك بووە توانیویەتی شەریعەتێك دانێ لەسەردەمی خۆیدا هەندێ بنەمای ئاینی و ئەخلاقیشی هەبووە، خەڵکی دائەبڕی لەکۆمەڵگە ئەبێتە ڕاهیب و وەك سۆفیگەرییەکی ئەو سەردەمە دەگێڕنەوە وشەی تەسەوف لەوسەردەمەی بوزاوە سەرچاوەی گرتوە هەتا هاتووەتە ناو ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە، هەرچەندە زۆرێکیش پێش بوزا هەر تەسەوف هەبووە و لەسەردەمی مەسیحی و جولەکەو دوای ئەوانیش هەر هەبووە[٧٥].

---

[٧٤] الاسیره وبناء الامم د.راغب السرجانی ل ١٢

[٧٥] هەمان سەرچاوەی پێشوول١٢

**شارسانیەتی هیند:**

ئیمپراتۆریەتێکیتر هەبوو بەناوی (هیند) هندستان یەکێك بوو لەو دەوڵەتە بەتوانا بەهێزەکانی سەرزەوی ١٠ ساڵ پێش هاتنی محەمەد - صلى الله عليه وسلم- لەو وڵاتەدا هەموشتێك ڕێگاپێدراو بووە بۆ پەرستن، شێوەی جۆراوجۆر هەیکەل هەبووە بۆ پەرستن خەڵك شاخ و ڕوبار وەك ڕوباری (کنج) کەزۆر موقەدەسە لەلایان، معادن، مانگ، قەڵەم، ئاڵتون، زیو، شمشێری دەستی خۆیان و ئەستێرەو مشك و گیانلەبەرانیان پەرستوە، تا ئێستا مانگا و مشك و سەگ دەپەرستن لەو وڵاتەدا مانگا پەرستن باوبوە، کەزۆربەی زۆری زانایان خەبیرن لەکۆمپیوتەر و تەنانەت شارەزایانی بواری چەکی ئەتۆمی ئەو وڵاتە زۆرێك لەسیاسیەکان مانگا دەپەرستن، لەڕاستیدا ئەمەشتێکی سەرسوڕما و سەیرە.

لە سەردەمی کۆندا لەهیندستاندا برسییەتێك ڕووی کردە ئەوان لەجێگایەکدا کەمشکیان دەپەرست، خواردنی مشك قەدەغەکرابوو تەنها مشکیان سەرنەدەبڕی ئەو ماڵانەی کەگەنمیان کۆکردبوە، مشکەکان هەمویان خوارد!.

**بواری ڕەوشتی:**

لەڕووی جنسیانەوە هاوسەرگیری شتێکی ئاسایی نەبوو، کەس هاوسەرگیری نەئەکرد ئافرەتێکیان بەدڵ بوایە ئەیان توانی بیبەن بۆخۆیان بەتایبەت کاهینەکانیان بەبەندایەتیان دەزانی، کاری خراپەکاری و فاحیشە لەمەعبەدەکان ئەیانکرد ئەیانشوبهاند بەوەی کەشتێکی ئاینیە، لەگەڵ منالّ و پیر و گیانلەبەراندا هەرشتێك ئەوان ئارەزو و حەزیان لێبوایە دەیانکرد، دەیانگوت ((مادام خۆشی مرۆڤەکانە لەخواردن و سێکس و خەوتندایە، کەواتە بەبەندایەتیان دادەنا)).

**بواری کۆمەڵایەتی:**

لەناو ئەوانیشدا چینایەتی هەبوو دابەش کرابوون بەسەر ٤ چین:

چینی براهیمە: دەسەڵاتدار و کاهینەکانیان بوون هەمیشە پادشا ئەبوایە کاهین بوایە واتە: پیاوی ئاینی بوایە.

چینی دووەم (شترای): ئەمەش پیاوانی جەنگ و ئازاکانیان.

چینی سێیەم (ویش) ئەمانیش بازرگان و جوتیاربوون خاوەنی زەوی و زارو سەروەت و سامان بوون.

چینی چوارەم (شۆدەر) ئەم چینە هیچ شتێکیان بۆنە بوو بیکەن لەزمانی عەرەبیدا پێیان گوتراوە: (منزوبوون) ئەم چینە لەگەڵ گیانلەبەران هەژمار دەکران.

لە یاسای هیندستاندا براهیمەکان ئەوکەسانەی خاوەنی دەسەڵات بوون دەیانتوانی ئیش بە خەڵکی بکەن بەبێ ئەوەی پارەشیان بدەنێ.

ئەم چینی"شۆدەر"ە دەبوو خزمەتی کاهین و دەسەڵاتداری هندستانیان بکردایە ئەگەر پێڕەوی بکەین بەگوتاری پێغەمبەرایەتی - صلى الله عليه وسلم- ئیبن ماجە ڕیوایەتیکردوە لەئیمامی عومەرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کەدەفەرموێ: (أَعْطُوا الأَجِيرَ أَجْرَهُ قَبْلَ أَنْ يَجِفَّ عَرَقُهُ)، پارەی خاوەن کرێ بدەن بەو کەسەی کەبەکرێ گرتوتانە، تا عارەقەکەی ووشك نەبوەتەوە.

ئەگەر شودەرێك بەهێزبوایە و تورەیان بکردایە لەبراهیمێکیان بدایە لەکەسێکی دەسەڵاتداری بدایە وەك ئیبن ئەسیر باسی دەکات دەڵێ: (دەستیان دەبڕی)، ئەگەر دابنیشتایە لەحزوری براهیمێك ئەوا پشتیان بەئوتو ئەسوتاند (کەوی)یان پێدەوت، یاخود شودەرەکان قسەیەکی بە براهیمە بگوتایە یەکسەر زمانیان دەبڕی، خۆ ئەگەر بهاتایە لەوانەی کەئەپەرسترا بۆنموونە: سەگ و بۆق و کونەپەپوو و پشیلە، یەکێك لەم گیانلەبەرانە بکوژرایە وەکو ئیبن کەسیر دەڵێ: (وكفارة قتل الكلب والقطة والضفدعة والبومة مثل كفارة قتل الشودر سواء بسواء) هەر کاتێك هەرکەسێ بیکوشتایە لەمانە ئەبوایە کەفارەتی بدایە،

کەفارەتەکەشی کوشتنی پیاوێکی شودەر بوو، سبحان الله کاتێك خوای گەورە پێمان دەفەرموێت: (ولقد كرمنا بني أدم) هەموشتێك لەپێناو و لەبەرخاتری مرۆڤەکانن، لە هیندستاندا ئافرەتەکانیان هیچ گرنگییەکی نەبووە لەکۆمەڵگە، ئەتوانرا ژن بێ و ئیشی پێبکرێ و زۆرجار هیندەکان ماڵ و سەروەت و سامانیان لەقومار دەدۆڕاند ژنەکانیان دائەنا لەبەرامبەردا، پێغەمبەری خوا -عليه الصلاة والسلام- دەفەرموێت: (اسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا) وەسێتیکرد لەگەڵ ئافرەتان باشبین، یاخود دەفەرموێت: (النِّسَاءُ شَقَائِقُ الرِّجَالِ) ئافرەتان هاوڕێ و هاوسۆزی پیاوانن.

یاخود (خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لِأَهْلِهِ) باشترینتان ئەوانەن کەبۆ هاوسەرەکانتان باشن[٧٦].

**شارستانیەتی یەهود..**

لەوانەیە هەندێك کەس بپرسێ شوێنی جولەکە لەکوێدا بووە ؟ بابێین سەیری کیانی جولەکە بکەین..

جولەکە لەوسەردەمەدا بە ئەوروپادا بڵاوبوبونەوە لەناوچەی شامدا بەگشتی لەوێدا چەقیان بەستبوو مابوونەوە، هەموو دەزانین کە جولەکە پیسترین کەسایەتین، لەکاتی لاوازی و بێهێزی خۆیاندا هەمیشە خەریکی خنوعن، خەریکی نیفاق و گەردن کەچی و ماستاوچین و خەریکی ڕق و کینە و درۆ کردنن بۆ خۆ بردنە پێشەوە، لەکاتی هێزی خۆشیاندا هەمیشە خۆیان بەگەورە دەزانن و زاڵمن و وەحشییەت بەرامبەر بەخەڵکی خۆیان نیشان دەدەن، ئەمە پیشەی ئەوان بووە ئازاری خەڵك ئەدەن منداڵان دەکوژن خەڵك لەناودەبەن و خەڵك سەردەبڕن و زوڵم و زۆری و چەوساندنەوە لەسەر خەڵك دادەنێن.

---

[٧٦] هەمان سەرچاوەی پێشو ل١٤

ڕوداوێك دەگێڕینەوە لەسەر ژیانی ئەم جولەکانە کە لەساڵی ٦١٣زاینی واتە ٣ ساڵ دوای هاتنی پێغەمبەر ڕوودیداوە ، لەناو شامدا کەژیاریان هەبووە لەساڵی ٦١٣ کاتێك فارس سەرکەوت بەسەر ڕۆم دا، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:
(غُلِبَتِ الرُّومُ) ٢ الروم
واتە: ڕۆمەکان تێکشکێنران (بەدەستی فارسەکان).
پاش سەرکەوتنی فارس بەسەر ڕۆم دا لەشامدا جولەکەکان هاتن کودەتایەکیان کرد بەسەر هەموو نەسارەکاندا، هاتن هەرچی نەسارا بوو بەقەشە و پاپاکانیانەوە هەموویانیان گرتو کوشتنیان، لەدوایی ئەوەی دەسەڵاتی تەواویان گرتەدەست کەنیسەکانیان تێکدا هەرچی ڕاهیب هەبوو کوشتیان.
پاش ماوەیەك ڕۆم خۆیان گرتەوە و سەرکەوتنەوە بەسەر فارسدا وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (فِي أَدْنَى الأَرْضِ وَهُم مِّن بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ) ٣ الروم
واتە: لەنزیکترین و نزمترین وڵاتیاندا، بەڵام لەئایندەدا (نۆرەیان دێتەوە) ڕۆمە کان دوای شکستیان سەردەکەونەوە.
لەدوای ئەوەی سەرکەوتن بەسەریاندا جولەکەکان چون بۆلای (هرقل) چوون زەلیلی خۆیان نیشاندا و داوای ئەوەیان کرد دوای حکومەتەکەی بکەون ، گوتیان ئێمە لەحکومەتەکی تۆدا دەبین و یارمەتیت دەدەین، پاشان ئەویش پەیمانێکی لەگەڵ جولەکە بەست و ئاسایشی و هێمنی دانی.
بەڵام لەدواییدا نەسارەکانی شام هاتن بۆلای هرقل... بەهرقلیان گوت تۆ چیتکردوە لەگەڵ ئەمانەدا، هەرچی خەڵکی ئێمە بووە لەناو شام دا هەموویان کوشتوە، کەبەمەی زانی پادشای ڕۆم زۆر تورە بوو، بەڵام پەیمانەکە ڕێگر، پاشان نەسارەکان هاتن بۆلای و قسەیەکیان کرد گوتیان: (تۆ کێشەت نەبێت ئێمە کەفارەتی پەیماننامەکەت بۆ ئەدەین بەس بیانکوژە (اقتلهم وسنصوم عنك جمعة كل سنة أبد الدهر) وەرە تۆ بیان کوژە ئێمەش هەموو هەینیەك بۆتۆ بەڕۆژوو ئەبین، تا ڕۆژی قیامەت بۆ ئەوەی کەفارەتی شکاندنی پەیمانەکەت بۆ

ئەدەین، ئەویش هەستا بەکوشتنی جولەکەو عەزابی ئەدان و لێی ئەدان، زۆریان هەڵاتنو هەندێکیشیان مانەوە لەشام[٧٧] .

ئەگەر سەرنج بدەین بەدرێژایی مێژووی نەسارا و جولەکە ڕقیان لەیەکتربوە و دژایەتی یەکیان کردوە، نەسارەکان بڕوایان وایە کە جولەکەکان عیسا (علیە السلام)یان لەخاچ داوە یان کوشتویانە کەئەمەش ڕاست نیە هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَكِنْ شُبِّهَ لَهُمْ) ١٥٧النساء.

واتە: نە کوژراوە و نە لەخاچ دراوە..

لەساڵی ١٦ی کۆچیدا سیدنا عمر فتحی قودسی کرد مەسیحیەکان مەرجێکیان لەسەر ئیمامی عمر دانا گوتیان بەمەرجێ ئێمە دەوڵەتی قودس تەسلیم دەکەین کە نابێت یەك جولەکە لەووڵاتی قودس دابمێنێ..

ئەویش مەرجەکەی لێ قبوڵکردن، عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێت) ئەو پیاوە بەڕێزە قبوڵی مەرجەکەی کرد هەرچی جولەکەی لەقودس بوو هێنانینە دەرەوە لەشوێنێکی تردا نیشتەجێیکردن لەبەرئەوەی بەبێ شەڕ قودسی گرتەوە..

بەڵام ئەگەر سەیری ڕێکەوتنی جولەکە بکەین ئێستا لەگەڵ ئەمریکا و فەرەنسا و ئینگلیز هەموویان پێکەوە دەبێ بزانین بۆچی ئەم ڕێکەوتنیەیان مۆرکردوە لەنێوان یەکتر ! لەبەری ئەوەی شەڕی هەموویان بەرامبەر بەموسڵمانانە دژی موسڵمانان شەڕدەکەن، جولەکە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا -علیە الصلاة والسلام- لەشاری مەدینەی منەوەرە نیشتەجێبوون وەکو خو و نەریتێك هەروەکو ئێستا کەهەن ئەو خوەی ئێستا هەیانە نەگۆڕاوە وەك لەسیرەدا هاتووە دڵێکی ڕەق، ئەخلاقی لادەر، حەزیان بەفیتنەیە و هەمیشە دەسەڵات و سامانیان دروستکردوە بۆ هێنانەدی ئاواتەکانیان بە فرۆشتنی چەك لەنێوان هۆزەکاندا، هۆزی(ئەوس و خەزرەج)یان دابوو بەیەکدا چەکەکانی خۆیان پێ دەفرۆشتن،

---

[٧٧] هەمان سەرچاوە ل ١٥

هەمیشە کاری ئەوەیان دەکرد بن ڕەوشتیان لەناو خەڵکدا بڵاودەکردەوە بۆئەوەی دەستبگرن بەسەر خەڵکدا ئەمە کاری ئەوان بووە بەدرێژایی مێژوو، ئێستا بەهەمانشێوە هەر بەردەوامن لەو جۆرەکارانە[٧٨].

**شارستانیەتی حەبەشە:**

سەردەمی دەسەڵاتی دەوڵەتی حەبەشە (ئەثیوبیا)ی ئێستا پێش هاتنی پێغەمبەری خوا -علیە الصلاة والسلام- وڵاتێکی نەسرانی مونحەریف بوون واتە: ئەتباعی کورسی بابەویانیان پێدەگوترا، یاخود کورسی ئەسکەندەری کەدینێکە پێی دەگوترا دینی (منفوسیا)، باوەڕیان وایە کە مەسیح خوایە یاخود کوڕی خوایە (نعوذ باللە)، ژیانێکی زۆر سەرەتاییان هەبوو لەگەڵ ئەوەشدا چەك و جبەخانەی بەهێزیان هەبوو لەسەردەمی پێشهاتنی پێغەمبەردا -صلی للە علیەوسلم-.
کەسێك هەبوو بەناوی (نجاشی أصعمی) ڕەحمەتی خوای لیبێت کەس زوڵمی لە کەس نەکرد، لەوکاتەدا نازناوی نجاشی دەدرا بەپادشاکانی حەبەشە.

**شارستانیەتی هەردوو ئەمریکا..**

خەڵکێك لەوانەیە بپرسن ڕەوشی هەردوو ئەمریکا لەچیدایە!
(هنودحمر) هندسورەکانکە لەوێ دەژیان ئێستا نەماون، کاتێك کە ئەوروپیەکان چونە ئەمریکا، هەمویان کوشتن وەك مێژوونوسان دەڵێن: ١٠٠ ملیۆن کەسبوون لەو قارەیەدا ژیاون هەمویان لەناوبردون، ئەمانەی کەباسکران وێنەی پێش هاتنی پێغەمبەری بوون -علیە الصلاة والسلام-[٧٩].

---

[٧٨] هەمان سەرچاوەل ١٦
[٧٩] هەمان سەرچاوە ل ١٧

**سەردەمی جاهیلەتی عەرەب:**

**بواری ئاینی:**

ئەو وڵاتە لەگەڵ ئەوەی بڕوایان بەخوای گەورە هەبوو ئەو دیندارییەی کەهەیان بووە ئەو پەیکەرانەی هەیان بووە پەرستشیان کردون هەروەکو خۆیان دەیان ووت، (مَا نَعْبُدُهُمْ إِلاَّ لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللهِ زُلْفَى) ٣ الزمر.

واتە، ئاگاداربن، دینی پاك و خاوێن تەنها بۆ خوایە. ئەوانەش جگە لەو زاتە کەسانی ترو شتی تر دەکەنە پشتیوانی خۆیان دەڵێن، ئێمە ئەم بت و شتانە ناپەرستین تەنها لەبەر ئەوەی لە خوا نزیکمان بخەنەوە. لەکاتێکدا ئەوان لە خواوە نزیکترن. بێگومان خوا داوەری دەکات لە نێوانیاندا. لەو شتانەدا کە کێشە یان لەسەری هەیەو ڕایان دەربارەی جۆراو جۆرە. بەڕاستی خوا ئەو بیروباوەڕ چەوتەیان لێوەرناگرێت و هیدایەت و ڕێنموویی ئەو کەسانە ناکات کە درۆزن و بێ باوەڕن.

بەمروری زەمەن وای لێهاتبوو ئەچون داوایان لەپەیکەرەکان دەکرد نزیکیان بکەنەوە لەخوای گەورە (نعوذبالله)، لەناو مەککەدا دوو پەیکەری تێدابوە (هوبل) گەورەی بتەکانی مەککە (لات) گەورەی بتەکانی طائف. لەناو پیرۆزترین شوێنی ئەم جیهانە (کەعبە) ٣٦٠ بتی جیاوازی تیابوە. پاشان دوو پەیکەر تر بەناوی (ئیساف) و (ناهلە)ی پێدەگوترا، ئەو دوو بتە پیاوێك و ژنێك بوون لەیەمەنەوە هاتون زینایان کردوە لەبیت الحرام. خوای گەورە ئەو دوانەی ڕەق کردەوە (کەئەمە کەس نازانێت سەرچاوەکەی ڕاستە. یان نا)، کەچی دەیانپەرستن ئەمانە لەنێوان سەفا و مروا دانراون. سیدنا عەمری کوڕی مجموع بۆنموونە لەسەردەمی جاهیلیدا دارێکی دروستکردبوو دەیپەرست ئەو خەڵکە بەوشێوەیە بوون لەدواییشدا گەورەترین موجاهیدیان لێدەردەچێ..

## بواری ڕەوشتی

### حاڵەتی ڕەوشت لەجزیرەی عەرەبیدا چۆن بوە؟

خواردنەوەی عارەق و مەشروب زۆر بڵاوبوە، تا شاعیرەکان شعریان نوسیوە بەسەریاندا، تا ئێستا خەڵکێك شعر لەسەر مەی و مەشروب دەڵێن، شانازی پێوەدەکەن وەکو عەرەبی جاهیلی کۆن. قومار زۆر بەربڵاوبوو لەنێوانیاندا، وەك خوای گەورە دەگێڕێتەوە بۆمان لەسەر ژنەکانیان قوماریان کردومو ڕق و ناحەزی کەوتۆتە نێوان و شەڕیان کردوە خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللّهِ وَعَنِ الصَّلاَةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ) ٩١ المائده

واتە: بەڕاستی شەیتان دەیەوێت لەرێگەی عارەق و قومارەوە دوژمنایەتی و بوغز و کینە بخاتە نێوانتانەوە لەیادکردنی خوا و ناوە پیرۆزەکانی وێڵتان بکات، هەروەها سست و تەمەڵتان بکات لەئەنجامدانی نوێژەکان، ئایا ئیتر بەس نیە؟ ئایا ئیتر کۆڵ نادەن؟ ! (جا هەر کەئەم ئایەتە پیرۆزە هاتەخوارەوە، جاڕدرا بەناو شاری مەدینەدا ئیتر عەرەق حەرام کراوە...ئیمانداران قەڕابەو گۆزەو دیزەو هەرچی عەرەقی تێدابوو ڕشتیانە کۆڵان).

پاشان سو، سەلەم (ڕیبا) لەنێوانیاندا دەبوایە بکرایە (إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَا) ٢٧٥البقر، چونکە ئەوانە دەڵێن: کڕین و فرۆشتن وەك سوو وایە.

پێشهاتنی ئیسلام زینا زۆر ئاسایی بووە ، وەك دایکمان عائیشە دەگێڕێتەوە ٤ جۆر نکاح هەبووە، نکاحێکیان ئێستا خۆمان بەکاری دێنن، ئەوانەی تر وەك ئافرەتێك کە لە سوری مانگانە تەواو دەبوو ژنی پیاوێکیش بوبێ پیاوەکە ژنەکەی دەنارد بۆلای پیاوێك، کەگەورەی قورەیش بوایە یان پیاوێکی ناوداری عەرەب بوایە دەینارد خۆی نەئەچو بەلایا هەتاکو منداڵێکی لێ دەبوو ئەمەش پێی دەگوترا: (نکاح أستبضاع) جۆرێکی تری نکاح (رهط) یاخود (رهط) کە ١٠ پیاو لەگەڵ ئافرەتێك ڕایان دەبوارد، ئەگەر منداڵێکی بوایە ئەیوت ئەو منداڵە هی

تۆیەو هیچ شتێکیش نەبوو منعی بکات لەوە، لە کۆتایدا دەبوە ژنی ئەوەی کە منداڵەکەی ئەدا بەسەریدا.

نکاحێکیتر وەکو زینابوو لەمێژوودا بە(رایات الحمر) دەناسرا بەئاڵا سورەکان دەناسریێ، ئافرەتان لاشەی خۆیان ئەفرۆش، هەرکەس ئەڕۆیشتە لایان و ئەگەر ئافرەتەکە سکی پڕبوایە لەپیاوێك هەموو پیاوەکانیان کۆدەکردەوە یەکێکیان دەهێنا پێی دەگوترا (ئەهلی قافە) ئەوکەسانە بوون کەمناڵیان ئەناسییەوە وەك ئێستا چۆن (DNA) کەشف دەکەن، پاشان لەهەر کام لەپیاوەکان بچوایە مناڵەکە بەوەوە دەنوسا پێیان دەوت، (فالتاط بە) یان (التصق بە) نوساوە پێوەی دەبوە منداڵی ئەو و نەیئەتوانی لێی جیاببێتەوە.

عەرەب خویەکی گەندەڵییان هەبوو ئەویش زیندە بەچاڵکردنی ئافرەت بوو، ئەمەش بەهۆی ترسان لەوەی، کەهەژاربن وەك خوای گەورە دەفەرموێت، (وَلاَ تَقْتُلُواْ أَوْلادَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلاقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُم إنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْءًا كَبِيرًا ) ٣١ الاسراء

واتە، نەکەن مناڵەکانتان لەترسی گرانی و برسێتی بکوژن، چونکە پەروەردگارتان ڕۆزی بەخش و میهرەبانە، ئێمە ڕزق و ڕۆزی دەبەخشین بەوانیش و بەئێوەش، چونکە بەڕاستی کوشتنی ئەوان گوناه و تاوانێکی زۆر گەورەیە.

ئەوەی کوڕیان نەبووە و نەیان ویستوە بەخێویان بکەن، شتێکی گرنگتر ئەیان گوت ملائیکەتەکان کچن لەبەرئەوە ئێمە ئەم کچانە دەکوژین بۆ ئەوەی خوای گەورە رازی بێت لێمان بۆئەوەی بگەرێتەوە بۆلای ئەو، خوای گەورە دەفەرموێت،

(وَإِذَا الْمَوْؤُودَةُ سُئِلَتْ) ٨ التكوير

کاتێك کەکچی زیندە بەچاڵ پرسیاری لێکرا

( بِأَيِّ ذَنبٍ قُتِلَتْ) ٩التكوير

بەچ گوناهێك، بەچ تۆمەتێك کوژرا؟!

(وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالأُنثَى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ) ٥٨ النحل

ئەگەر مژدەی بوونی کچ بدرێت بەیەکێك (لەو نەفامانە) ڕووی گرژوتاڵ دەبێت و ڕەش دادەگیرسێت و سینەی پڕ دەبێت لەخەم و پەژارە.

(يَتَوَارَى مِنَ الْقَوْمِ مِن سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ أَيُمْسِكُهُ عَلَى هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ أَلاَ سَاء مَا يَحْكُمُونَ) ٥٩ النحل

لەداخ و خەفەتی ئەو مژدە ناخۆشە، خۆی دەدزێتەوە لەخەڵکی، بەتەنها بیردەکاتەوەئایا بیهێڵێتەوە بەزەلیلی و سووکی و بێ نرخی، یاخود زیندەبەچاڵی بکا و بیخاتە توێی خاکەوە، ئای کەچەندە بڕیارێکی نارێك و ستەمکارانەیە!!

لە ڕووی هۆزگەرای و شەڕی نەژاد پەرستی و گەل و هۆز پەرستیەوە بەگشتی هەمیشە خەریکی شەڕکردن بوون، لەناو عەرەبدا قسەیەکی بڵاو هەیە دەڵێت:

(وَيَوْمًا عَلَى بَكْرٍ أَخِينَا... إِذَا لَمْ نَجِدْ إِلاَّ أَخَانَا)

ڕۆژێك ئەگەر کەسمان نەدۆزییەوە شەڕی لەگەڵ بکەین لەگەڵ بەکری برامدا شەڕ دەکەین..

شەڕێکی زۆر گەورە لەنێوان بەنی بەکر و بەنی تەغلیب شەڕێکی گەورە ڕوویدا، ئەم دوو هۆزە شەڕیانکرد تا سەردەمی پێغەمبەری خوا لەسەر ئەوەی کەسێکیان لەبەنی بەکر شمشێرێکی لەملی حوشترێك دابوو، خوێن و شیرەکەی تێکەڵ بوو ئەمانەی باسمان کرد لە سەردەمی پێش هاتنی پێغەمبەری خوا بووە بەگشتی- صلی الله علیه وسلم-[٨٠].

پوختەی گوتاری سیاسی پێش پێغەمبەری خوا لەچیرۆکی هاتنی سەلمانی فارسی بۆ گەڕان بەدوای ڕاستی وەحیدا دەردەکەوێت:

لەسەنەدی ئیمام ئەحمەدا هەیە، سەیدنا سەلمان کوڕی پیاوێکی ناودارە یەکێك بووە لەئۆترۆبان واتە: ئاگرموان بووە لەدینی زەردەشتیدا، بەڵام زۆر سەرنجی دەڕوات بۆ دینی مەسیحی یەکان هەڵدەستێ دەچێتە وڵاتی شامەوە لەوێ

---

(٦٠) قصة العرب.. د. الحسون محی الدين ل ١٤٣

لەکەنیسەیەك دادەنیشن لەشام زۆر گەڕاوە بەدوای خەڵکدا بۆ چاکە و دین، تا ئەو کۆمەڵگەیە لەتاریکی دەربهێنن.

بۆماوەیەك لەو کڵێسایە ئەژی، دوایی سەیر دەکات پاپای کلێسا کەسێکی زۆر درۆزنە، کەدەبینن پارە و سەروەت و سامانێکی زۆر کۆدەکاتەوە لەخەڵکی، ئەو تەنها سەرنج ئەدات، تاپاپا دەمرێ، پاش ئەوە خەڵکی بانگ دەکات دەڵێ ئەمە خیانەتی لەئێوە کردوە، ئەو پارەیەی کەکۆی کردۆتەوە زیاد لەسێ سندوق یاخود بەسێ شاخ پارە و ئاڵتون و زێڕو زیوی هەڵداوەتەوە، خەڵکە کەدەڵێن: (سەلمان ڕاستی کردوە و خەڵکەکە سەلمانیان خۆش دەوێ) دوای ئەوە واز لەدینی مەسیحی دێنن و ڕودەکاتە لای پیاوێك پێی دەڵێت: (مامە فێرم بکە بچمم بۆ کوێ پیاوێکی باش هەبێت تابچمە لای دینداری بکەم؟).

ئەویش پێی دەڵێ: (بڕۆ بۆموسڵ ئەوەی لەسەرچاکە مابێتەوە هەر ئەو کەسەیەلەوێ)، ئەویش دەڕوات ماوەیەك لەوێ دەمێنێتەومو خەریکی چاکەکاری دەبێ، تا پیاو چاکەکە دەمرێ..

پێش ئەوەی بمرێ پێی دەڵێ: بچم بۆکوێ کەسێکی لێبێت چاکەخوازبێ لەسەر ئەم زەمینە مابێ؟

دەڵێت: بڕۆ بۆ (نصیبین) شوێنێکە لەموسڵەوە دورە پیاوێك هەیە لەوێ باشەو کەسێکی دادپەروەر و دیندارە، دەچێتە لای ئەو پیاوە لەکۆتایی ژیانیدایە و سەلمان پێی دەڵێ: (مامە پێم بڵێ: بچمە لای کەسێك کەلەسەر ئەم زەویە باش بێ).

ئەویش دەڵێ: (کەسێك شك نابەم لەم شارەی خۆماندا، بەڵام کەسێك هەیە لە(عاموریا) لەتورکیای ئێستا لەنێوان تورکیا و سوریایە لەوێ پیاوێکی لێیە لەسەر حەق ماوەتەوە).

سەیدنا سەلمان بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ: (کەچومە ئەوێ زۆر دەوڵەمەند بوم، سەروەت و سامانێکی باشم کۆکردەوە، بومە خاوەنی چەند سەر مانگا و مەڕومالآت و ئەسپ و پارە و...هتد لەدوایدا ئەو پیاوە وەفاتیکرد، لەپاش ئەوەی کەزۆر دەوڵەمەند بوم.. باسدەکات بەو پیاوەم گوت: من چیبکەم لەدوای تۆ بچم

بۆکوێ، ئەویش دەڵێ: کەسێك شك نابەم لەسەر زەوی چاکەخواز بێ، بەڵام برۆ کەسێك هەیە کەبەشوێنی دەگەڕێن پیاوێکە لەوڵاتی عەرەبەوە دێت، کەپێغەمبەری ئاخر زەمانە).

لێرەدا باشتێك بهێنینەوە یادتان کەسێك هەیە لەدینی زەردەشتی بەناوبانگە بەناوی (پیر شالیار) ئەم پیرشالیارە کەسێکی زۆر شارەزا بووە لەئاینی زەردەشتی، زانایەك بووە بۆیە کاوان یاخود جابانی کوردی دێتە لای پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم- کەهاوەڵێکی پێغەمبەری خوایە و کوردە، ئێمە تەنها ناوی ئەم هاوەڵە بەرێزە کوردەمان بیستوە، کە(شیخ الکوردی)ش هەیە لە (مغنی محتاج) هاتووە، کەدێتە لای پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم- دەپرسن پیرشالیار بەئێمەشی وتوە پێغەمبەرێك دێ لەوڵاتی عەرەبەوە، بۆیە ئێمە هاتوین بۆلای تۆ، پێغەمبەری خوا -علیه الصلاة والسلام- دەیان گەڕێنێتەوە بۆ کوردستان، بۆیە هێزێکی موسڵمانان دێتە ناو کوردستان و ڕاپەرینێکی گەورە ڕودەدات لەشارەزور و شاربازێر دژی دەوڵەتی فارسی ساسانی، کورد بەئارەزوی خۆی موسڵمان بوون کەزانییان ئەمە هێزێکی حەقە زۆر جار یارمەتی هێزەکەشیان داوە.

سەلمانی فارسی کاتێك دەگێڕێتەوە دەڵێ: (لەعاموریە کۆمەڵێك دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتی عەرەب؛ وەکو دەڵێن: خۆشی عەرەب بووە سەلمان فارسی خەڵکی عێراق بووە، بەڵام نازانین تا چ ڕاددەیەك تەواوە، پاشان لەعاموریە دەرئەچێت خەڵکە کاروانچیەکان دەبینێ و پێیان دەڵێت: هەرچی سەروەت و سامانم هەیە پێتان دەبەخشم ،داوایکرد تەنها بیبەن بۆ ئەوێ، ئەو سەروەت و سامانەی هەیبوو بەخشی بەوان و لەگەڵیان ڕۆیشت، سەلمانی فارسی بێ ئەوەی گەشتبێ بەخزمەتی پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم- بیناسێ، بزانن چۆن دوای حەق کەوتوە..

چونکە سلمانی فارسی(ڕەزای خوای لێ بێت) زانیبوی تاریکی چییە؟ بۆیە بەدوای ڕوناکیدا دەگەڕا، سەلمانی فارسی خۆی دەگێڕێتەوە دەڵێت: کەگەیشتمە (رقه) یاخود (واد القری)ی پێدەوترێ، لەوێ زۆر زوڵمیان لێکردبوم منیان فرۆشت

بەبەندە و کۆیلە، فرۆشتیان بەپیاوێك، پاشان ئەهلی رقە فرۆشتیان بەپیاوێکی جولەکە لەمەدینەدا، هەروەها بۆمان دەگێڕێتەوە رۆژێکیان سەیدەکەم لەگەڵ برازایەکی خۆیدا قسەی دەکرد گوتی: ئای چ گیرێکمان خواردوە بەدەست ئەم پیاوەوە، کەهاتوە، ئێمە نەئیشمان بۆ دەکرێ نە ئەم دوو هۆزەش دەدەن بەیەکدا مەبەستی هەردوو هۆزی )ئەوس و خەزرەج( بوو واللە بانگەوازی پێغەمبەری دەکا و ناوی محەممەدە، سەلمانی فارسی دەڵێ: من لەسەر دارخورمایەك بوم لەکاتێکدا گوێم لەو قسەیە بوو ڕاپسکام و خەریك بوو لەسەر دارخورماکە بکەومە خوارەوە، سەلمان دەڵێت، هاتمە خوارەوەو گوتم ئەوە گوتت چی، ئەوە گوتت چی، ئەوە گوتت چی؟

ئەویش دەڵێ: بەسەر سوڕمانێکەوە گوتی ئەوە بۆ وادەکەی برۆ سەردارەکە، لێی تورە دەبێ، ئەویش دەڵێ ویستم دڵنیا ببمەوە لەو قسەیە، ئەویش قسەکەی بۆ دوبارە دەکاتەوە دەڵێ: کەسێك هاتووە ناوی محەممەدە کەبانگەوازی پیغەمبەرایەتی دەکات، پاش ئەوە سەلمانی فارسی گەڕا بەدوایی حەقدا و دەگاتە پلەیەك، کەدەبێتە گەورەترین پیاوی سەرئەرز و پیاوی ناو ئەم ئیسلامە، پێغەمبەری خوا -علیە الصلاة والسلام- لەحەقیدا دەفەرموێت: (سَلْمَانُ مِنَّا آلَ الْبَيْتِ) سلمان لەئێمەیەو ئال و بەیتی ئێمەیە.

لەمەککە خەڵکی زۆر کەم مابوەوە لەو سەردەمەدا کەلەسەر دینێکی ڕاستی مابێتەوە وەك زیدی کوڕی عمری کوڕی نفیل، ولید کوڕی سعدی کوری زید ئەم دوو پیاوە بەڕێزە پیاوێکی حەنەفی بوون لەسەر دینی ئیبراهیم بوون (علیە السلام)، ورقە کوڕی نوفل کەسێکی مەسیحی بوو، قیسی کوری سعادە (... ناوەکان لەمێژوودا هەن کەبە پەنجەی دەست دەژمێردرێن، لەبەر ئەوە بۆیە ئەمەشمان هێنایە پێش چاوی خوێنەر و باسمان لێکرد نرخی نور نازانین هەتاکو زوڵمات و تاریکی نەبینین).

سەیری خوونەریتی ئەو سەردەمانە بکەین چۆن خەڵکی تیا ژیاوە هەربۆیە خوای گەورە پیغەمبەرە ئازیزەکەی دەنێرێ لەوکاتەدا بەگوتارێکی نوێوە، کە گوتاری پێغەمبەرایەتیە[81].

**مێژووی گوتاری سیاسی ئەوروپای نوێ و بەراوردکردنی لەگەڵ گوتاری سیاسی ئیسلامی:**

لەپێشتردا باسی ئەوەمان کرد سیستەمی سیاسی ئیسلامی چییە و تاڕادەیەك روونمان کردەوە .. لەم بەندەدا هەوڵئەدەدەین ئەو باسە روون بکەینەوە عەلمانیەت و و دیموکراسی لە سەردەمی مێژووی نوێ و سەردەمی رۆشنگەرایی رۆژئاوا و لەهەمانکاتدا چۆنییەتی سەرهەڵدانی سەردەمی ڕاپەڕینی ئەوروپا، یان سەردەمی دمورانی عەزەمەتی فەلسەفە لە ئەوروپادا چۆن دەستی پێکردوە مێژووەکەی دەگێڕینەوە لەهەمان کاتدا گوتاری سیاسی عەلمانی چیی بووە ؟

زۆرێکی ئەم باسانە لای خوێنەری کورد داخراوە، بەتایبەت لە ناو ڕەوەندی ئیسلامییەکاندا زۆر لاوازو کلاسیکانە وەریانگرتوە یاخود وەلانراوە و گرنگی پێنەدراوە! لەکاتێکدا چەندین ساڵە موسڵمانان هەموو بڕیارەکانی لەسەردەمی راپەڕینی ئەوروپا و گوتاری سیاسی ئەوسەردەمە دەست نیشان دەکرێت، یان بۆ ئەوەی زیادەرۆیی نەکەین، دەکرێت بە دەست نیشانکردنی لەسەردەمی شۆڕشی گەورەی فەرەنساوە دەستی پێکردوە بەرهەمی ئەو شۆڕشە عەلمانیەت و دیموکراسییە لە ناو رەحمیدا هەڵگرت و تا لەدوایی هێرشەکانی ناپلیۆن لەدایك

---

(٦١) رجال حول الرسول.خالد محمد خالد ل١١٢

بوو باسێکە لە رووی جوگرافیاوە زۆرگرنگە، چونکە پانتاییەکی زۆری جیهانە، لە رووی کاتیشەوە نزیکەی ٤٠٠ بۆ ٥٠٠ ساڵە گوتارە سیاسیەکەشی وەك پەرژنێك چواردەوری جیهانی ئیسلامیداوە ..
ئەوەی لەم باسەدا وورژێنراوە خوێندنەوەی چەند کتێبێك و سەرچاوەیەك نیە، بەڵکو خوێندنەوەی سەدان کتێب و بەڵگەنامەی دیار و و ژیانی نوسەرە - لە ژیار و شارستانیەتی ئەوروپادا کە بەچاوی خۆمان دیومانەو باسی دەکەین و مێژوەکەشی لە سەرچاوەی ئەوروپییەوە وەرگیراوە ، وویستومانە بە شێوەیەکی ئەکادیمەنەو بە سەرچاوە وە باسەکان بەخەینە بەردەم خوێنەر.

گەلی کورد بەتایبەت موسڵمانەکەی تارادەیەك شارەزایە لە ژیانی پێغەمبەران بەگشتی - سەلامی خوایان لێبێت- پاشان ژیانی پێغەمبەری ئازیزمان محەمەد - صلی الله علیەو سلم- و ژیانی هاوەڵان رەزامەندی خوایان لێبیت ...هەروەها مێژوەکانی تری وەك ئەمەوی و عەباسی و عوسمانی...هتد.

کەمتر ئاگایان لە هەڵسانەوە و شۆڕشی گەلانی دیکەیە لە رۆژئاوادا، کە ئایا گوتاری سیاسیان لەسەر چ بنەمایەك دامەزراوە، دەبێت موسڵمانان بزانن بۆچی رۆژئاوا بە گشتی- گەیشتە ئەو پلە نایابو بەرزەی شارستانیەت و ئیسلامیش تارادەیەك لە شارستانیەتی پاشەکشەی کردا..

هەموو ئەم باسانە سەرچاوەکەی لە سیستەمی سیاسی رۆژئاواوە سەرچاوە دەگرێت ، پاشان ئەوە روونده‌کەینەوە ...عەلمانیەت چۆن خۆی خزاندۆتە وولاتی موسڵمانان و بۆچی خەڵکی بە سادەیی و سانایی وەریانگرتو بێئەوەی بزانن کە لەکوێوە سەرچاوەی گرتوە و بۆچی بەرهەم هاتووە، گوتارە سیاسیەکەی چییە ؟.

## شۆڕش و ڕاپەڕینی ئەوروپا:

لە ئەدەبیاتی ئیسلامدا ئەوروپا بە گشتی بەرۆم ناسراوە.. خوای گەورە سورەتێکی قورئانی بەناوی ئەوروپییەکانەوە ناو ناوە بە (الروم)... کە لە ڕەچەڵەکدا ناویان ڕۆمە، خوای گەورەش ئاماژەی بەهەر باسێك یان ناوێك کرد کەواتە جێگای بایەخەو پێویستە موسڵمانان بەگشتی لێی ووردببنەوە..

ئەوروپا لە کۆندا هەموو بت پەرست بوون؛ شارستانیەتی گەورەی ئەوروپا لە تورکیای ئێستادا بووە .. کە ناسراوە بە "قوستەنتینیە" هەروەها بەشێکی تری لە ئەسینا و رۆما وە سەرچاوەی گرتوە ...

لە ساڵی ٤٠٠ ز ئەوروپا ئاینی نصرانی وەرگرت، لەلایەن " قوستەنتین" و دایکی شاژن "هیلان"ە ، سەرچاوەی سەرەکی ئاینی نەصرانیان وەرگرت بەدەستکاری کراوی، سەرچاوەی دەستکاریەکەی قەشە شاوڵ بوو.. ئاینێکی گۆڕاو دوور لە رۆحی ڕاستی ئاینەکە کەپڕبوو لە باسی سەیرو سەمەرە ، پاشان لە ساڵی ٣٢٠ز واتا ١٧٠٠ ساڵ لەمەوبەر کۆمەڵەی نیقیە لە خاکی قوستەنتینەدا دروست بوو ، کە بووە هۆکاری دروستکردنی ئەکلیریۆس.

ئەکلیریۆس چییە: واتا گەورەکردنی پیاوانی ئاینی لەلایەن شاژن هیلانەوە و قوستەنتینی کوڕییەوە و بوون بە خاوەن بڕیار لەناوەندی دەسەڵاتدا لە لەبەشەکانی دیکە زیاتر روونی دەکەینەوە..

لە پاشاندا دوو مەزهەبی لەئاینە دەستکاری کراوە نصرانیەکەی قوستەنتینو هیلانی دایکی درووست بوون بە ناوی کاتۆلیك و ئۆرتۆدۆکس..دواتریش پرۆتستانت کۆمەڵ و گروپی تریش هەر جیابوونەوە، بەڵام ئەو سێ مەزهەبە سەرەکی بوون..

رۆما و فەرەنسا تەبەنی مەزهەبی کاتۆلیکیان کرد بەتایبەت فەرەنسا کە نفوزی گەورەی کاتۆلیك لە فەرەنسا بوو، راستە پاپا لە ڕۆما دادەنیشت، بەڵام سەرچاوەی بڕیار فەرەنسا بوو.. ئێستاش هەر واییە.. دواتر بەریتانیا تەبەنی

مەزهەبی پرۆتستانتی کردو، کەنیسەی شەرقییە بۆ خۆی جیابوویەوە لە قوستەنتینیە بەناوی مەزهەبی ئۆرتۆدۆکس..

مێژووی کاتۆلیك و ئۆرتۆدۆکس مێژوویەکی زۆر تاریکی هەیە لە ئەوروپادا بەتایبەت مێژووی کاتۆلیك، ئۆرتۆدۆکس لەساڵی ١٤٥٣ ز تارادەیەکی زۆر کۆتایی بەو مەزهەبە هات بەدەستی محمد فاتیح.. کە قوستەنتینیەی کردە پایتەختی موسڵمانان و ناوی نا بە ئەستانەی ئیسلامی و ئەستەنبوڵ.. لەڕاستیدا پێشتر کاتۆلیك و پیاوانی ئاینی کە ناسراون بە ئەکلیرۆسەکان ئازاری زۆری زاناو دانشمەندەکانیان ئەدا، زۆرێك لە زاناکانی خۆیان سوتاند ، لەوانە (نیکۆلاس کۆپەرنیك) تەنها لەسەر ئەوەی ووتی زەوی خڕمو دەسوڕێتەوە..! پاشان ئازاری زۆری (گالیلۆ گالیلی)یاندا لەسەر دیدو تێڕوانینە راستەکانی بۆ ژیانو گەردون و مرۆڤ.. یاخود زانای بەناوبانگ (ئیسحاق نیوتن) و زۆری تر لە زانایان کە دەکوژرانو بە ئەشکەنجەی جۆراجوری کڵێسای کاتۆلیکی لە ناوی دەبردن..

لە ساڵی ١٤٥٣ز کە ئەوروپا هەرگیز حەزی بەو مێژووە نیە دووری خستۆتەوە بۆ ساڵی ١٥٠٠ز ، لە هەموو ئەوروپادا گۆڕانکاریەکی زۆر سەیر رووئەدات ئەویش لە دوای فەتح کردنی قوستەنتینیە لەلایەن محمد فاتیحەوە، ئیتر لەو کاتەوە تا هاتنی ناپلۆیۆن بۆ میسر، جیهانی ئیسلامی و ئەوروپی لەیەك دادەبڕێنو هیچ زانیاریان لەسەر یەکتر نامێنێت [٨٢].
لەدوای فەتح کردنی قوستەنتینییە لە لایەن محمد فاتیح گۆڕانکاری گەورە روویدا لە ئەوروپادا..
هەیبەتی کڵێسا شکا هیچ ئەرزشی نەماوبوو لەبەرچاوی خەڵکیدا بەتایبەت لەبەردەم ئۆرتۆدۆکسەکاندا کە زیاتر دیندارتربوون لە مەزهەبەکانی تر، پاشان

---

[٨٢] ( الموسو عة الميسر التاريخ الاوربا.. د. محمد موسى شريف .. ل ١٨)

کاتۆلیکیش بەهۆکاری درۆکردنی بەوەی کە ساڵی ١٠٠٠ ز دنیا کۆتایی دێت ٤٥٠ ساڵ بەسەر ئەو قسەیە ئەکلریۆسی بەناوبانگ "گریگۆری" تێپەڕی و هیچ رووی نەداو خەڵکی بەتەواوەتی هیچ بەهایەکی بۆ ئاینی نەصرانی دانەدەنا[٨٣].

چوار جەنگی گەورەی موسڵمانان هەموو ئەوروپای ئیفلیج کرد. ئیتر بیریان لەوەنەکردەوە جارێکی تر هێرش بکەنەوە سەر موسڵمانان و سوپا کۆبکەنەوە.

- جەنگی یەکەمیان بەناوی حیتتین: بەدەستی سەرکردەی قارەمانی کورد سەلاحەدینی ئەیوبی- ڕەحمەتی خوای لێبێت- .

- جەنگی دوەم بەناوی ئەراك: لەسەردەستی سەرکردەی بەناوبانگی ئەمازیغی ئەبو حامیدی منصوری موحیدی - ڕەحمەتی خوای لێبێت- .

- جەنگی سێیەمیان جەنگی دمیاط یاخود ئیسماعیلیە: بەدەستی سەرکردەی بەناوبانگی کورد نەجمەدین ئەیووب - ڕەحمەتی خوای لێبێت-، کە هەر لەوجەنگەدا رۆحی سپارد بە نەخۆشی، خێزانی شەجەرەتولدوڕە سەپەرشتی جەنگەکەی کردو پاشای گەورەی فەرەنسای بەدیل گرت بەناوی لویس حەوتەم و بەیەك ملیۆن دیناری ئاڵتونی ئازادی کرد. لەدوایدا خەڵکی فەرەنسا خۆیان کوشتیان.

- جەنگی چوارەم فەتح کردنی قوستەنتینەیە لەلایەن محمد فاتیح و پاشان ئەسینا و ئەلبانیاو تاکو نزیك چیاکانی نەمسا توانیان دەسەڵاتی خیلافەتی ئیسلامی درێژ بکەنەوە.

---

[٨٣](قصة الحروب الصليبية. د. راغب السرجاني ل ٣٩ ـ ٥٠)

ئەوەی کەروویدا لە ناودەسەڵاتی محمد فاتیحدا بریتی بوو لەوەی کە هەرچی زانای ئەو سەردەمەی قوستەنتینیە بوو هەموو هیجرەتیان کرد بۆ وولاتانی فەرەنسا و نەمسا و بەریتانیا.. هەرچەندە محمد فاتیح درێغی نەکرد لەوەی کە ڕێزیان بگرێت و هەموو ئاسانکاریەکی بۆ کردن ژیانی بۆ دابین کردن، بەڵام ئەوان جەختیان لەسەر هیجرەتیان کردەوە، محمد فاتیحیش ئازادی کردن..

لەوەی کە دەمێننەوە یاخود هیجرەت دەکەن، ئەودەمە ئەوروپا لە تاریکییەکی زۆردا دەژیا .. هەندێك لەزانایانی ئەو سەردەمە دەهاتنە ناوچەکانی ئەندەلوس و ئیسپانیای ئێستا و پاشان سیسیلیا و بەغداد و شام بۆ بەدەستهێنانی زانست..[84]

بۆ یەکەم جار کە ئەکادیمیا دروستکرا لەسەر دەستی عەبدەڕەحمانی ناسر بوو لە طوڵیطلە زانکۆی دروستکرد، بۆ ئەوەی زانایان سەرچاوەی زانستەکانیان تەدوین بکەن قوتابی پێبگەیەنن، هەرچەندە کۆمەڵێك پێیانوایە لەسەردەستی مەئمونی کوڕی هارونە ڕەشید ئەوکارە کراوە لە شاری بەغداد، بەڵام -نوسەر- پێی وایە لەسەردەمی عەبدوڕەحمانی ناسرەوە دەستی پێکردوە کوڕەکەی هیشام پەرەیپێداوە، چونکە بەپێی بەڵگەنامەییە کە پاشای بەریتانیا دەینوسێت بۆ هیشام و پێدەڵێت تەنها سێ زانای بەریتانی بێن لە زانکۆکانی طولیطلە لە ئەندەلوس بخوێننو ئەکادیمای زانستەکان بەرنەوە بۆ بەریتانیا لێرەدا کە باسی پادشای بەریتانیا دەکەین (واتا پادشای سویدو نەرویج و دانیمارکیش بووە)، لە هەمووی سەیرتر کە نامەکە لە مۆزەخانەی مدریدە لە ژێرەوە پادشای بەریتانیا بە هیشام دەڵێت " من خادمكم المطيع جورج الثاني" وەك لەوێنەکەدا دیارە و بە زمانی ئینگلیزی بەدەست نوسی جۆرج و بە عەرەبیش تەرجومەکەی کراوە.. (قصة الاندلوس ..د.راغب السرجانی بەرگی یەکەم ل ٢٢٣)

---

[84](الدولة العثمانية.. د.علی محمد الصلابي ١٨٠)



وێنەی: نامەکەی مەلیکی بەریتانی بۆ خەلیفەی موسڵمانان عەبدوڕەحمانی ناسر

زاناکانی تری ئەوروپا وەك "دانتی" کە بزوتنەوەی گۆڕانکاری دەست پێدەکەن زۆر سەرسام دەبێت بە زانای موسڵمان ماوەردی، مارتن لۆثەر سەرسام دەبێت بە ئیبن روشد و زۆرێکی تر لە زانایان کە بە هەموو شێوەیەك کاریگەری فەیلەسوف و زانیانی ئیسلامیان لەسەرە بۆ گۆڕانکاری لەناو خاکی ئەوروپادا، چونکە هەموو ئەو کتێبانەی کە سوقرات و ئەرستۆ و پاشان فەلسەفەی کۆنی کلاسیك نوسرابوونەوە... هەموو بەدەستی زانایانی ئیسلامی نوسراونەتەوە و وەرگێڕاون
( تەرجومە کراون)، پاشان دراونەتەوە بە زانایانی ئەوروپی، تا- توانیان بزاڤێکی گۆڕانکاری دروست بکەن[85]

[85] سەرچاوە دائرەتول مەعریفی بەریتانی و ویکیپیدیا ئەنتەرنێتی

هۆکاری ئەم بزاقە دەگەرێتەوە بۆ ئەو زوڵم و ستەمەی پادشاو ئەکلیریۆسەکانی ئەوروپا، تەنانەت لە تاو ئەشکەنجەو ئازارو زیندانی ئەکلیریۆسو پادشاکان ئیتر زانای مولحید دروست دەبێت و بانگەشەی بۆ بێدینی دەکەن و هەندێك لە زانایانی ئەوسەردەمە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد ئیتر "خوا مرد" .. تا سەردەمی لویسی ١٤ لە فەرەنسادا ئەم بزوتنەویە کاریگەری خۆی دروستکرد، چونکە ئەوروپیەکان بەناوی جەنگی خاچپەرستیەوە لەسەردەمی لویس و ئۆغستین و فلیپ .. خەڵکی هەژارو بێدەرتان کەوتوبوون هەموو خاك وئاویان دەبرا بۆ بەگزادەو پیاوانی ئاینی زەریبە لەسەر خەڵکی هەژارەکە دانرابوو، خەڵکی گوێی بۆ زاناو نوسەرەکان دەگرت .. بەڵام لویسی ١٤ پادشایەکی خاوەن هەیبەتو بڕیاری کاریگەربوو دیسانەوە سەردەمی ئەکلیریۆسی زیندوو کردوە و کەسێکی کردە ئەکلیریۆس بەناوی "کاردینال دریشلۆ" ئەم دوو کەسە کە پێکهاتەی سیستەمی سیاسی و سیستەمی ئاینی لە ئەوروپاو فەرەنسادا ، کە دەڵێین ئەوروپا ... مەبەستمان زیاتر فەرەنسایە، چونکە ئەودەمە فەرەنسا زۆر بەهێزبوو لە چاو ئیمپراتۆرەکانی تری ئەوروپا وەك نەمساو بەریتانیا، بەریتانیا سەرقاڵ بوو بە جەنگی ئەمریکا .. نەمساش لەبەر مانەوەی خۆی ژن و ژنخوازی کەوتبووە نێوان فەرەنساو نەمسا، کەدەڵێین نەمسا و واتا هەموو ئەڵمانیاو سویسراو نەمسا خۆی و بەشێکی زۆری ئەوروپای شەرقی[٨٦]!..

---

[٨٦] الموسو عة الميسر التاريخ الاوربا.. د. محمد موسى شريف .. ل ٧٨

ئەكليريۆس كاردينالٚ دريشلۆ پياوێكى تاوانبار بوو، زياتر لە ٦٠٠ زاناى لە ئەوروپادا كوشتوە دادگا پشكنينى بۆ دروستكردن كە لە مێژووودا ناسراوە بە محكەمەى تەفتيش... لويسى ١٤ بەتەواوەتى پشتگيرى دەكرد. دەزگاكانى ئەو سەردەمەى سيستەمى سياسى فەرەنسا بريتيبوون:

يەكەم: مەليك
دووەم: دادگا كە ياساى لە مەليكەوە وەردەگرت
سێەم: مجلسى ئەعيان- خاوەن بڕيارو پياو معقولانى دەوڵەت: بريتى بوون لە پياوانى ئاينى و بەگزادەكان
چوارەم: مجليس چينەكان الطبقات.. كە بريتى بوون لە خەڵكى دەوڵەمەند (بۆرژواز) و جوتيارەكان..
خەڵكى بە گشتى هەژار بوون ، پياوانى ئاينى پێنج بەشى خاكى فەرەنساو ئيتالايان لە بن دەستدا بوو بێئەوەى زەرەيبە بدەن، بەگزادەكان خاوەن دەسەڵاتو خاوەنى هەموو خاكى فەرەنسا بوون، كە دەڵێين فەرەنسا - واتا گوزەرانى هەموو ئەوروپا بە گشتى وابوو[٨٧]...

لويسى ١٤ كۆتايى بە ژيانى دێت: لويسى ١٥ دێتە جێگايى ئەويش ماوەيەكى كورت حوكمدارى دەكات و لەبەر لاوازى كەسايەتى ئەكليرۆسەكان دەيكوژن، ياخود دەڵێن نەخۆش بوو مرد... ئينجا لويسى ١٦ دەبێتە خاوەن دەسەڵاتى فەرەنسا و خێزانەكەى "مارى ئەنطوێنە" كچى شاژنى ئيمپراتۆرى نەمسايە بەناوى "ماريا ترێز". لويسى ١٦ پياوێكى لاواز بووە، ژنەكەى بەسەريدا زاڵە هيچ تواناى سەركردايەتى نيە قيادەيەكى فاشلە وەك باپيرى نيە .. ئيتر لەسەردەمى

---

[٨٧] الموسو عة الميسر التاريخ الاوربا.. د. محمد موسى شريف .. ل ٨٠

لوسی١٦ شۆڕشی فەرەنسا دەست پێدەکات بە دروشمی مەلیکەکان بخنکێنن بە ریخۆڵەی پیاوانی دینی واتا ئەکلیریۆسەکان.

**گۆڕانکاری لە گوتاری سیاسی ئەوروپادا:**

لەدەرئەنجامی سیستەمی سیاسی و ئاینی لە وولاتی فەرەنسادا کە پێکهاتبوون لە مەلیك بەبێ دەستور- خۆی خاوەن دەستورو بڕیاری ڕەها بوو، دادگایی فرۆشراو، واتا هەرکەس دموڵەمەند بواییە دەیتوانی دادگا بکڕێت کورەکەی یان براکەی بەدوای خۆیدا دابنێت.. مەجلیسی پیاو مەعقولانیان هەبوو یاخود ئەعیان کە وەك پەرلەمان وابوو پێکهاتوون لە بەگزادەو پیاوانی ئاینی، مەجلیسی چینەکانیان هەبوو کە پێکهاتبوون لە بەگزادەو پیاوانی دینی و بۆرژوازەکان و خەڵکی جوتیار واتا نوێنەرەکانیان..

لێرەدا بۆچی نوسەر – تەنها فەرەنسا باس دەکات ؟ لە کاتێکدا باسی مێژووی نوێ و مێژووی عەلمانی دەکەین؟

بەهۆکاری ئەوەی سەرەتایی شۆڕشی عەلمانی و سەرهەڵدانی لە سەردەمی نوێدا سەرچاوەکەی فەرەنساییە.. دەمانەوێت ئەوە بۆ خوێنەر ئاشکرا بکەین کە چالاکترین و بەهێزترین گەل فەرەنسیەکانن کە بڕوایان بەشۆڕشو گۆڕانکاری هەیە بە بەردەوامی..! سروشتی فەرەنسیەکان بەوجۆرە هەڵکەوتوە ..

کەنیسەی فەرەنسا بەهێزترین کەنیسەبوو لە ئەوروپادا بەشی زۆری لێبوەوە لە وولاتەکانی تردا کە مەزهەبی کاتۆلیکە - و بەردەوام ئێستاش وایە، پیاوانی ئاینی ئەو سەردەمە تەنگیان بە خەڵکی هەڵچنی بوو، زەریبەی خانوبەرەیان دانابوو لەسەر خەڵکی بەگشتیو کە دەبەشی زەریبەکە دەچوە خەزێنەی کڵێسا، ساڵانە ١٠٠ ملیۆن فرانکی دەبرد بۆ خۆیی..

دادگا کڕینو فرۆشتنی پێوەدەکراو رەشومو شیرینی ئەدرا بە قازی و دادوەرەکان و گەندەڵیەکی زۆر بەربڵاو بوو..

ئابوری فەرەنسا لاواز بوو بوو، بەهۆکاری ئەوەی فەرەنسا دژی بەریتانیا هاوکاری شۆرشی ئەمریکایی دەکرد، تەنانەت خەزێنەی دموڵەت هیچ پارەی تێدا نەمابوو..

خەڵکی بە گشتی هەژارو بێدەرەتان بوو، تەنانەت فەرەنسا ئەو سەردەمە دابەش بووبوو بۆ چەند هەرێم و پارێزگایەك، کە لە نێوانی هەر هەرێم و پارێزگایەکدا سنوری گومرکی و سەندنی باج لە خاوەن کارو پیشەوەرو کاڵاکان دەسەنرا بە ئاسانی خەڵکی شتومەکی دەست نەدەکەوت، وای لێهاتبوو ئاردو گەنم نەمابوو لەووڵاتەکەدا، ئیتر خەڵکی بە تەواوەی بێزاربوبو، لە کاتێکدا فەرەنسا خاوەنی سەروەت و سامان و کشتوکاڵ و هەموو جۆرە خێرو بێرێکە، بەڵام بەگزادەو پیاوانی ئاینی دەستیان بەسەر هەموویدا گرتبوو خەڵکیش لەبرساندا دەمردن!..

بۆ یەکەم جار خەڵکی لە تاو برسێتی ڕژانە سەر شەقامەکان و چونە نزیك قەصرو باڵەخانەی لویسی ١٦ بەناوی (فەرسای) هەر ئەو خەڵکە هەژارە بوو کە دوایی بوونە هێزو داینەمۆی شۆڕشی فەرەنسا!..

تەنانەت دەگێڕنەوە ماریا ئەنتوێن خێزانی لویس١٦ لەخەو خەبەری دەبێتەوە، بەدەنگە دەنگی خەڵکی دەڵێت ئەو خەڵکە چی دەوێت؟ لەوەڵامدا دەڵێن نانیان دەوێت نان دەست ناکەوێت، زۆر بەسادەی دەڵێت با پسکیت بخۆن واتا دەڵێت با - گاتۆ – بخۆن، چونکە خۆی تاڵو سوێری ژیانی نەچەشتوە وای دەزانی کە خەڵکی ئەگەر نانی دەست نەکەوێت ئیتر پسکیت دەستەبەردەبێت، ئەوە گوزارانی شاژن و رەعیەتەکەی بوو..

لویسی ١٦ زانی ڕەوشەکە زۆر ترسناکەو پێویستە ڕێگا چارەیەك بدۆزێتەوە، بانگەشەی چاکسازی کردو هەڵسا بە زووترین کات کۆبونەوەی کرد لەگەڵ مەجلیسی پیاومەعقولان (ئەعیان) کە پێکهاتبوو لە بەگزادەو ئەکلیریۆسەکان..

بانگی کەسێکی کرد کە ئابوری ناسێکی گەورەو دەوڵەمەندێکی ئەودەمەی فەرەنسا بوو بەناوی (کالۆن)[88]

کالۆن- پیاوێکی زانا و دنیا دییە بوو، یەکێك بوو لەو کەسانەی کە بۆ بازرگانی هاتۆچۆی جیهانی ئیسلامی دەکرد .. نوسەر- پێیواییە کالۆن ئەو ئەزمون و توانایەی کە وەریگرتبوو هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ژیانی لەگەڵ موسڵمانانی جەزائیرو تونس و مەغریبدا..

کالۆن سێ خاڵی گرنگی خستە بەردەم مەجلیسەکەو ووتی: لە ئێستادا تاکە چارەسەر بۆ فەرەنسا:

یەکەم: زەریبە یەکسان بکرێت بۆ هەموو لایەك

دووەم: باجو گومرکی هەرێمو ناوچەکان هەڵبگیرێت

سێیەم: هەموو وەك یەك پارە بدەن

کەس بە گوێی کالۆنی نەکرد ..! لەبەر ئەوەی مەجلیسی پیاوەعقولان بریتی بوون لە خاوەن بەرژەوەندیەکان.. لەبەر ئەوەی لویسی ١٦ پادشایەکی لاوازو کەسایەتیەکی ناجێگیر و ڕاڕا بوو هیچی بۆ نەکراو، بە دەست بەتاڵی لە کۆبونەوەکەدا هەڵسان..

شۆڕشەکە بۆ ئەوەی سەرکۆنەو خامۆش نەکرێت ، کۆمەڵێك خەڵك لە بیرمەندانی فەرەنسا دەچنە ناو خەڵکی و کاریگەری باش لەسەر خەڵکی دروست دەکەن .. لەوانە کە بەباوکی ڕۆحی شۆڕشی فەرەنسا و عەلمانیەت ناسراوە بە پلەی یەکەم کەسێکە بەناوی (ڤۆڵتێر) دوای ئەو (ڕۆسۆ) پاشان (رینە)[89]..

---

[88] الموسو عة الميسر التاريخ الاوربا.. د. محمد موسى شريف .. ل ١١٠ - ١٣٠

[89] الموسو عة الميسر التاريخ الاوربا.. د. محمد موسى شريف .. ل ١١٠ – ١٣٠

ڤۆڵتێر زۆر خۆشەویست بوو لەناو خەڵکیدا، چونکە نوسینەکانی لە هاوشێوەی کاری رۆژنامەوانی دەچوو، کاری ئەوە بوو باسی کارە بەد رەوشتیەکانی کڵێساو پاپاکانی دەکرد باسی زوڵمو زۆری بەگزادەو ئەکلیریۆسەکانی دەکردو بەناو - ناوی دەهێنان، خەڵکی زۆر گرنگیان بە نوسینەکانی ئەدا... ئەو بیرمەندو زاناو فەیلەسوفانەی تریش بە دڵنیاییەوە کاریگەریان بووە، بەڵام بەپلەی یەکەم ڤۆڵتێر باوکی رۆحی شۆڕشەکەیە.

لەهەمووی گرنگتر کاریگەری شۆرش کردن لەسەر فەرەنسا شۆرشەکەی ئەمریکا بوو دژی بەریتانیا و بیرو بۆچونەکانی بیرمەندی گەورەی ئەمریکا (بنیامین فرانکلین) کە دیدو بۆچونەکانی ئاراستەو پێچەوانە کردەوە بۆ فەرەنسا..! لە کاتێکدا فەرەنسا هاوکاری ئەمریکیەکان بوو، بەڵام فارنکلین بە تەواوەتی ئاراستەی نوخبەی ناو شۆڕشی فەرەنسای دەکرد...!

هەرچەندە راو بۆچونەکانی بیرمەندانی تریش هەر کاریگەری هەبوو، بۆ نمونە (مۆنتیسکۆ) .. وە هەروەها.

شۆڕش بەردەوام بوو .. خەڵکی بەتەواوەتی رژانە سەر شەقامەکەن، تەنانەت بە پاریس موە نەوەستا، بەڵکو هەموو فەرەنسای گرتەوە.. بیرمەندان جۆشو خرۆشی خۆپیشندانیان ئەدا تا شۆڕشەکە بڵێسە بسەنێت[٩٠]...

لویسی١٦ کە زانی مەجلیسی ئەعیان هیچی بۆ نەکرا، ناچار پەنای برد بۆ مەجلیسی چینەکان (طبقات) کە ماوەی ١٠٠ ساڵ زیاتر بوو کۆنەبووبونەوە.

ئەم مەجلیسە زۆرینەی بەگزادەو پیاوانی ئاینی بوون، لەم کۆبونەوەیەی مەجلیسی چینەکان هیچیان بۆ نەکراو بەدەست بەتاڵیش لەم دانیشتنە هاتنە دەرموە پیاوانی ئاینیو بەگزادەکان لە مافی خۆیان دانەبەزین .

---

[٩٠]مێژووی نویی ئەوروپا.. نوسینی : ه.ا.ل.فیشەر ل٧٩-١١٢

خەڵکی رۆژ بەرۆژ زۆرتر دەبوو لەسەر شەقامەکان، خەڵکی فەرەنسا کۆمەڵەیەکیان دروستکرد لەجیاتی مەجلیسی چینەکان بەناوی (کۆمەڵەی نیشتیمانی)، داوکاریەی ئەو کۆمەڵەیە لەلایەن ڤۆڵتێرو رۆسۆوە بۆ خەڵکی ئامادەکراو نوسراییەوە بریتی بوو:

یەکەم: یەکسانی، ناوی مەجلیسی چینەکانو طبقات نەمێنیت هەموو وەك یەك یەکسان بن.
دووەم: دادگا ئازاد بکرێتو ئیتر کڕین فرۆشتنی پێوە نەکرێت.
سێیەم: زەریبە لەسەر خەڵکی کەم بکرێتەوە هەموو وەکیەك بە یەك رێژە پارە بدەن
چوارەم: دەستور بنوسرێتەوە و سیستەمی کۆماری پیادەبکرێت و مەلیك نەمێنێت.

لە ١٤ی مانگی ٧ ساڵی ١٧٨٩ز٠ ئەم بڕیارانە بەسەر پادشای فەرەنسادا سەپێنراو، هەر ئەو رۆژە چوونە سەر زیندانی "باستیل" و زیندانەکەیان شاکاند..
زیندانی باستیل رەمزی ئەشکەنجەی سیاسیو و زاناکان بوو کە بەدەستی زوڵمو زۆری پیاوانی دینیو بەگزادەکان دەخزێنرانە زیندانەکان، ئەو زیندانە بەتەواوەتی سوتێنراو ، ئێستا هەموو ساڵێك ١٤ یۆلیۆ رۆژی نیشتیمانی فەرەنسایە.
لە ساڵی ١٧٩١ دا بە زۆر لویسی ١٦ سوێندی دەستوری خوارد ووڵات بەتەواوەتی بووە کۆماری – کە لە مێژووی نوێدا ناسراوە بە بڕیاری ئۆکتۆبەر.
ئەم دەستورە ناونراوە بە دەستوری مەدەنی، واتا کۆمەڵەی نیشتیمانی لەمەودوا پیاوانی ئاینی و پاپا دیاری دەکەن نەك مەلیك!..
ئەم بڕیارە پاپای لە ئیتاڵیا بەتەواوەتی تورە کردو بڕیاری کافر بوونی لویسی١٦ داو.. بێبەشیکرد لە بەهەشت واتا (حرمان) بوو لە بەهەشت، لویسی ١٦ بە سروشتی خۆی پیاوێکی دیندار بوو زۆری پێناخۆش بوو بۆیە پەشیمانی رووی تێکرد، لەو رەوشەیشدا بەتەنها مابوومەوە، هەموو بەگزادەو ئەکلیریۆسەکان

جێیانهێشتبوو، بۆیە ناچار لەگەڵ خێزانی ماریا ئەنتوێن، بڕیاریاندا ڕاکەن بۆ نەمسا و لە عەرەبانەیەکی داخراودا لە سەر سنوری نەمسا دەستگیرکران..[٩١].

بۆیەکەم جار کەسێك دەبێتە سەرکردەی شۆڕشی فەرەنسا بەناوی (دانۆب) یاخود یەکەم سەرکردەی عەلمانی، کە بە خوێنڕێژترین کەس دادەنرێت لە دوای کاردینال دریشلۆی ئەکلیریۆس.. دانۆب لە یەك ڕۆژدا ١٦٠٠ کەسی لە پاسەوانی سویسری مەلەکی سەربڕی وە ٧٠٠ کەسیشی لە بەگزادەو نزیکەکانی لویس کوشت لەماوەی شەو ڕۆژێکدا.. لەدوای هەڵهاتنی لویس - دانۆب بووە سەرۆکی کۆمەڵی نیشتیمانی..

بیرمەندان و خەڵکی ئاسایی کە دانۆبی خوێنڕێژیان بینی ناچار هەڵسان بە کۆبونەوەیەك لە شارەوانی پاریس بە هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی نیشتیمانی لابردنی دانۆب و دروستکردنی کۆنگرەی نیشتیمانی!..

گۆنگرەی نیشتیمانی وا دروستکرا کە گوایە خزمەت بەخەڵکی بکاتو مافەکانیان بپارێزێت، بۆ یەکەم جار باسی جاڕنامەی گەردونی مافی مرۆڤ کراو- پایەکانی مافی مرۆڤ لە ئەوروپادا سەپێنرا..

کەسێك کرایە سەرۆکی کۆنگرەی نیشتیمانی بەناوی (ڕۆبسپیر) کە هاتە سەر دەسەڵات یەکەم کاری لە سێدارەدان و مل پەڕاندی پادشای فەرەنسای دا لەگەڵ خێزانی واتا لویسی١٦ و ماریا ئەنتوێن.. (هەمان سەرچاوە ١١٠-١٣٠)

---

[٩١] الموسو عة الميسر التاريخ الاوربا.. د. محمد موسى شريف .. ل ١١٠ – ١٣٠

خەڵکێك لە ناو گۆنگرەدا نارازی بوون بە مل پەڕاندی لویس و خێزانەکەی، بەڵام ئەوەی نارازی بوو بڕیاریدا لەگەڵ لویسدا ملی بەپەڕێندرێت، تا وای لێهات هەموو گۆنگرە دژی وەستاییەوە، بە فێڵێك رۆبسپیر- خەڵکی ڕژاندە سەر شەقامەکان و بیرمەندەکانی لە خۆی کۆکردوە بەناوی یەکسانیو- برایەتی دیسانەوە پێگەی خۆی بەهێز کردەوە لە ناو کۆنگرەی نیشتیماندا، بە کارەساتێکی زۆر ئەشکەنجاوی ملی لویسی پەڕاند لە یەنایەری ساڵی ١٧٩٣ز.

لەدوای ٧ مانگ هەمان ساڵدا ملی ماریا ئەنتوینیشی پەڕاند.

رۆبسپیر سێ ساڵ یاخود کەمتر حوکمداری کرد خوێناوی ترین دەسەڵاتی هەبوو لە ساڵی ١٧٩٤-١٧٩٥ز، زۆر لە ئەکلیریۆس و بەگزادەکان خوێنڕێژ تر بوو لەو ساڵەدا ١٠هەزار کەسی کوشت و زیاد لە هەزاران کەسی تری زیندانی کرد..

ئینساکلۆپیدیایی فەرەنسی دەربارەی رۆبسپیر دەڵێت: ئەوەی لە قسەی دەربچوایە دەیکوشت موناقشەی قوبوڵ نەبوو، تەنها بڕیاری خۆی بو ، دەسەڵاتی لە ئەکلیرۆسو تەنانەت لویسی١٦ بەهێزتر بوو، هیچ کات کاری بەدەستور نەدەکرد..

کەسێکی تر بەناوی (باراس) لە مێژوودا دروست دەبێت کە لە بۆرژوازەکانەو بە نهێنی لەگەڵ ئەندامانی گۆنگرەی نیشتیمانیدا رێکدەکەون بۆ لە ناوبردنی رۆبسپیر..

لە ساڵی ١٧٩٥ ز لەسەر دەسەڵات رۆبسپیر دەهێننە خوار لە ملی ئەدرێت و کەلەی سەری دەکەن بەداردا و بە شاردا دەیگەڕێنن.. لێرەوە شۆڕشی بۆرژوازەکان دەست پێدەکات، ئینجا بۆرژوازەکان حوکومەتی ئیدارە دروست دەکەن لە فەرەنسادا..

حکومەتی ئیدارە دروست دەبێت لەسەر لاوازی ئابوری بەرهەم هاتووە، بەڵام دوو لیژنەی پێك دێنن، بۆ خزمەتی خەڵك.. بەناوی لیژنەی دەستکەوتی گشتی و لیژنەی پاراستنی گشتی.. لیژنەی یەکەم ئابووری و پاراستنی ئابوری وولاتە واتا

بۆگەل .. لیژنەی دووەم پاراستنی سەروەت و سامانو ئاسایشی خەڵکییە.. واتا دەستەبەری نان و ئەمانە..[٩٢].

دروشمی ئەم دەسەڵات و حوکومەتە یەکسانی و برایەتییە..

زۆری نەخایاند دوو ئیمپراتۆری گەورە دژی شۆڕشی فەرەنسا وەستاییەوە، کە بریتی بوون لە رووسیا و نەمسا. رووسیا بەئەڵمانیای ئێستا ووتراوە.. روسیاو نەمسا نەتەوەیی بوون، دروشمی شۆڕشی فەرەنسا یەکسانی وبرایەتی بوو.
نەمساو روسیاش هەردووکیان دژی ئەم دروشمە بوون..! بەهۆکاری ئەوەی ئەگەر دژ نەبوونایە خەڵکی لەناو ئیمپراتۆرەکەدا داوای مافی خۆیان دەکرد جەنگێکی گەورە روویدا بەناوی (ڤاڵمی)، بەلاَم فەرەنسا تێیدا سەرکەوت و ئەو دوو ئیمپراتۆرەی شکاند!..
لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی فەرەنسا لە ناوخۆ و دەرمووەییدا توانی حوکومەتی ئیدارەو کۆنگرەی نیشتیمانی دروست بکات. کە دواتر گۆنگرەی نیشتیمانی بووە مجلیسی پیران (مجلس الشیوخ).. حوکومەتی ئیدارە بە سەرۆکەیەتی (باراس) توانی ئەو توندوتیژیەی کە سەرەتا لەناو عەلمانیەکان دابوو لەناوی ببەن و سەرلەنوێ حوکومەتی ئیدارەی بۆرژوازیەکان دروست بکەن.
دەسەڵاتی باراس - هیچی کەمتر نەبوو لە دەسەڵاتی ئیرهابیەکانی دوای خۆی .. خەڵکی بە تەواوەتی لە شۆڕش و نوێخوازی عەلمانیەت بێزار بوون ،ناچار داوای گەڕاندنەوەی حوکمی پادشایەتیان دەکرد!..

---

[٩٢] (Verdenshistoriet.. مێژویەکی فراوانی هەموو ئەوروپایە بەزمانەکانی جیهان بڵاوە بەزمانی نەرویجی سودی لێوەرگیراوە..ل ٤٤٨)

باراس کە زانی خەڵکەکە بێزارە هەموو لە چواردەوری باڵاخانەی حوکمدا کۆبونەتەوە خۆپیشاندان دەکەن، پەنای برد بۆ کەسێك کە خۆشەویستی ناو خەڵکی بوو بەناوی (ناپلیۆن پۆناپارت)..

**دەرکەوتنی ناپلیۆن و گوتاری سیاسی سەروەری:**

پێش ئەوەی باسی ناپلیۆن بکەین .. گرنگە خوێنەر- ئەوە بزانێت رۆحیکی شۆڕشگێری لەناو خەڵکی فەرەنسادا سەرچاوەی گرتبوو، بە هۆکاری قوتابخانەی مەزهەبی نوێگەریی، راستە ئەم ناوە نوێیە لە سەرەتایی سەدەی نۆزدەوە دامەزراوە، بەڵام پێشتر کاری بۆ کرابوو لە لایەن زاناو بیرمەندانی رۆژئاواوە.
پێناسەی ئەم قوتابخانە فیکریە ئەدەبییە: لەسەر بنەمایی فیکری مارکسی و فرۆیدی و ووجودی و داروینیە، زیاتر لەسەر بنەمای فەلسەفی ئەدەبی سریالی و رەمزییەکانە.. واتا کار دەکات بۆ نەهێشتنی هەموو جۆرە بیروباوەڕێکی ئاینی و لەناوبردنی دەستوری دینی و هەموو شەریعەتێك، جا – ئاسمانی بێت یاخود زەمینی، سنور تێدەپەڕێنیت بە هەموو کلتور بەهایەکی رەوشتی و ئاکاری کۆمەڵایەتی، گرنگی تەنها بۆ خۆشی و ئازادیە رەهاکان دادەنێت بۆ مرۆڤ، رۆحێکی شۆڕشگێری ئەداتە خاوەن مەزهەبو هەڵگری فیکرەکە.
ئەم مەزهەبە فیکریە لە فەرەنسادا دروست بوو لەسەر دەستی چەند ئەدیبێکی فەرەنسی عەلمانی بێدین لە پاریس لە بەناوبانگترینیان ..[٩٣].

- شارل بودلێر ١٨٢١-١٨٦٧ز ئەم بیرمەندە عەلمانییە لەسەرەتایی بانگەشەی نوێگەرییەوە بانگەشەی ئازادی سێکسی و نەمانی هیچ جۆرە بەهایەکی

---

[٩٣](مێژووی نویی ئەروپا.. نوسینی : ه.ا.ل.فیشەر ل٤٦- ٩٧)

رەوشتیکرد، وخاوەنی دیوانی گوڵە شەڕخوازەکانە ... وەرگێڕاوە بۆ زمانی فارسی و عەرەبی زۆری تر لە زمانەکانی جیهان.

- گوستاف فلوبیر ١٨٢١ – ١٨٨٠ز یەکێك لە ووتەکانی ئەم بیرمەند و ئەدیبە عەلمانییە ئەوەیە. دەڵێت خراپترین و قەبیحترین کار هاوسەرگیرییە .
- مالا رامیە ١٨٤٢ – ١٨٩٨ز شاعیرێکی رەمزی فەرەنسییە..
- بۆ زانیاری خوێنەر؛ پاشان لە رووسیاوە زیاتر گرنگی پێدرا لەلایەن ئەدیبی ناسراو (مایکۆفسکی) بانگەشەی لە بازدان بەسەر رابوردا و دەرچون بەرەو داهاتوی کرد .
پاشان لە ئەوروپا بەگشتی بڵاوبوویەوە تا گەیشتە وولاتانی ئیسلامی لەسەر دەستی یوسف خال ی نەصرانی و ئادۆنیس کە ناوی خۆی عەلی ئەحمەد سەعیدە لە بەرئەوەی ناوەکەی ئیسلامی بوو گۆڕی بە ئادۆنیس، ئادۆنیس واتا خوای فینقیەکانەو لە حیزبی شوعی سوری کاری دەکردو لە نوصیرێکانە، دوای بەزۆر حیزبەکە تەعدایان لە ژنەکەی کرد لەبەر چاوی خۆیدا، لەو سەردەمەوە دژایەتیان دەکات و بوو بەیەك لە هەوادارانی میلیشیای مارۆنی لە لوبنان خاوەنی چەند کتێبێکی کوفریو بێباوەڕییە بە خوا، تەنانەت بە ئاشکرا قسە بە ئیسلامو بە خوا بە پێغەمبەرەکەی دەڵێت..

زۆری تر لەوانە وەك – نزار قەبانی لە سوریا- محمود دەرویش لە فەڵەستین- عەبدولعزیز ماقالح لە یەمەن، عەبدولا عروی لە مەغریب، عەبدولوەهاب بەیاتی لە عێراق، شێرکۆ بێکەس، لە هەرێمی کوردستان...زۆری تر..
ئەم بیرە تەنها کار بۆ ئەو دەکات دین نەهێڵێت و ئاکاری رەوشتی لەناو خاڵکیدا کاڵ بکاتەوە گرنگی بە پایەکانی سیکۆلاریزم بدرێت[٩٤].

---

[٩٤] الفرق والمذاهیب ..د. ممدوح علی الحربی ل ٢١٠-٢٥٠)

دەگەڕێینەوە سەر باسەکەو لە سەرشانۆی سیاسی فەرەنساو شۆڕشەکەی کەسێك پەیدا دەبێت بەناوی ناپلیۆن.

باوکی ناپلیۆن یەکێکە لە بۆرژوازەکانی فەرەنسا لە دوورگەی "کۆرسیکا" ژیانیان بەسەر بردوە. کوڕەکەی دەنێرێتە کۆلێژی سەربازی مەلەکی و دەبێتە ئەفسەری دەرجەدار.. ناپلیۆن و باراس هەردووکیان هاوڕێی منداڵین، کاتێك باراس دەزانێت ناپلیۆن توانای سەربازی هەیە، دەینێرێت بۆ دوورگەی (تۆلۆن) بە فیرقەیەکی سەربازی بچوك کە نەهێڵێت ئینگلیز پێشرەوەی بکات. لە کاتێکدا تۆلۆن خاکی فەرەنساییە و ئینگلیز داگیریکردوە، لە سەرکەوتنێکی بێوێنەدا .. ناپلیۆن دوورگەی تۆلۆن ئازاد دەکات لە دەستی ئینگلیزو ناو ئەستێرەی لە ئاسمانی فەرەنسادا دەدروشێتەوە، چونکە بەگشتی فەرەنسیەکان زۆر دژی ئینگلیز بوو نداژیەتیەکی زۆر کلاسیکی دەکەن، کە تائێستاش بەردوامە..

باراس- سەرۆکی حوکومەتی ئیدارە لە کاتی خۆپیشانەکاندا پەنا دەبات بۆ ناپلیۆنو بۆ ئەوەی فریای حوکومەتەکەی بکەوێت، ئەویش بەزووترین کات دەگاتە پاریس و بە ووتارێکی ئاگرین دژی پادشاکەیان، دەتوانێت بڵاوە بە خۆپیشاندانەکە بکات و سەر لە نوێ رۆحی شۆرشگێریو نوێخوازی بخاتەوە ناو دڵی خەڵکی فەرەنسا...

(المرأة في حياة نابليون كريستۆڤەر هاربيت. وەرگێرانی عومەر سعيد الايوبی .. ل ٢٥)

لەدوای کۆتایی هاتن بەو تەنگەژەییە، ناپلیۆن داوای کرد لە باراس کە کاری جەنگی پێبسپرێت و پەیوەندی بە ناوخۆوە نەمنێت. ئەو دەمە حوکومەتی ئیدارە سێ سوپا بەرێ دەخات بۆ پاراستنی سنورەکانی فەرەنسا یەکەمیان بەسەرکردایەتی ناپلۆن دەبیت. ناپلیۆن هەلەکە دەقۆزێتەوە و سنورەکانی ئیتاليا

دەبەزێنیتو هەموو ئیتالیا دەخاتە ژێر ركێفی خۆی كە تەنها ئەفسەرێكی فەرەنساییە!..
لەوكاتەدا كە ناپلیۆن چووە ناو خاكی ئیتاڵیا - ئەو وولاتە شوێنكەوتوی ئیمپراتۆریوتی نەمسا بوو .. پاپای ئیتالیا ..( ڤاتیكانی ئێستا) بەناوی ( بیۆس) شار بەدەر كرد. ئەوەندەی تر لە فەرەنسادا ناوی بەرز بوویەوە خەڵكی خۆشی دەویست. لەم سەرویەندەدا دیسان كەسێك بەناوی (رۆمێر) دەبێتە سەرۆكی حوكومەتی ئیدارەو بەسەر باراس دا ئینقلاب دەكات..

رۆمێر- حوكومەتەكە دەگۆڕێت بۆ سیستەمێكی نوێ.. واتا سەرەتایی ساڵی ١٧٩٩- ١٨٠١ز حوموكەتی قونصوڵ دروست دەكات. كاتێك كە ناپلیۆن دەگەڕێتەوە بە باجێكی زۆر لەسەر ئیتاڵیاو زۆرێك لە شوێنەواری ئیتاڵی دزیبوە و هێناویەتی لەگەڵ خۆی تا ئێستاش لە مۆزەخانەی (لۆڤەرە) .. خەڵكی پێشوازی شاهانە لە ناپلیۆن دەكەن و ئینجا ئەو هەڵدەبژێرن بۆ سەرۆكی حوكومەتی قونصڵ لە پاریس و دوو قونصڵی تر لەگەڵیدا دادەمەزرێنن..ناپلیۆن دەبێتە سەرۆكی حوكومەت لە فەرەنسادا.
ناپلیۆن - لەدوای ئەوەی كرایە سەرۆكی حوكومەتی قونصوڵ و دوو كەسی تر هاوكاری بوون.. لەو سەردەمەدا نەمسا دژی ناپلیۆن جەنگی دەست پێكرد بەهۆكاری ئەوەی ئیتالیا بەشێك بوو سەر بە ئیمپراتۆری نەمسا. ناپلیۆن توانی سەربەكەوێت بەسەریدا !. لە جەنگە یەك لەدوای یەكەكان كە لە دژی كرا. توانی سەركەوتن لەدوای سەركەوتن بەدەستی بهێنێت. جاری وا هەبوو حەوت دەوڵەتو ئیمپراتۆرەكان پەیمانیان دەبەست بەهاوكاری لە دژی ناپلیۆن. بەڵام دەیتوانی لە سەركەوتنی بێ وێنەداو ئەزمونی سەربازیدا هەموویان تێكو پێك بشكێنێت. پیاوێكی زۆر لوتبەرزو لە خۆبایی لێدەرچوو یەكێك لە ووتەكانی بەرانبەر بە پیاوەعقولانی ئیتاڵیا دەڵێت:" هەمووتان ناگەنە پەنجە بچووكەكەی من و ئەقڵتان بەقەدەر ئەو پەنجەیەم نیە". تەنانەت وولاتانی میسرو شام و جەزائیریشی داگیركرد.. لە ئەوروپاش تا كەناری رووبار و چیاكانی (راین)

دەسەلاتی هەبوو، باجو سەرانەیەکی زۆری دەسەند لە هەموو مەلیك و پادشاو دەسەلاتدارەکانی ئەوروپا، بۆ نمونە ١٠٠ ملیۆن فلۆرینی لە هۆڵەندا دەسەند ..! ٥٠ ملیۆن فرانکی لە ئیتالیا دەسەند.. وەهەروەها.

هەمووشی بۆ سەروەری خۆی و بەکار دەهێنا پیاوێك بوو بەدوای سەروەری ومجدا دەگەڕا. هۆکاری سەرکەوتنەکەشی دەگەڕاییەوە بۆ ئەو جەنگە ئیعلامییەی دەیکرد لەناو خەڵکی وولاتەکاندا، تاکتیکی ناپلیۆن وابوو دروستکردنی نەتەوە پەرستی بوو، بۆ نمونە بە ئیتاڵیەکانی ووت ئێوە خاوەنی شارستانیەتی رۆمن و بۆ سەربە نەمسان..! ، هەروەها لە میسر ئەوەی بلاوکردوە کە ئەمان خاوەنی شارستانیەتی فیرعەونەکان بۆ شوێن عوسمانیەکان کەوتون، جەزائیر بەناوی ئەمازیغی دژی عەرەب، لە هۆڵەندا دژی دەسەلاتی بەلجیکا، ئەڵمان دژی دەسەلاتی روسیا ..وەهەروەها.

لەدوای ئەوەی کە دەسەلاتی فراوان بوو کچی ئیمپراتۆری نەمسای هێناو .. دوای ئەویش بانگەشەی ئیمپراتۆری فەرەنسای کردو حوکومەتی قونصوڵی هەڵوەشاندەوە دوایکرد لە پاپای ئیتاڵیا کە پیرۆزی بداتە دەسەلاتەکەی لە کاتێکدا کە ناپلیۆن هیچ بڕوای بە ئاین نەبوو، پاپای ئیتاڵیا خۆی داینابوو تەوزیفی کردبو[٩٥].

بۆ ئەم کارەی کرد؟

لەبەر ئەوەی خەڵکی ئەوروپا بە گشتی تا ئەو سەردەمەش رۆحێکی ئاینیو دینداریان تێدابوو، بەلام ناپلیۆن لە ڕێگای ماسۆنیەت کە زۆربەی ژەنەڕاڵەکانی کەسەر بە ماسۆنیەت بوون بەتایبەت (محفەلی لیۆنی) هیچ بڕوایان بە ئاین نەبوو تەنانەت گاڵتەیان بە کڵێساو مەسیحیەتو هەموو ئاینەکانی تر دەکرد ڕێگەیان دابوو بە گۆڤارو رۆژنامەکانی ئەو سەردەمەو هەموو بیرمەندەکان کە ئازادن لە هەر جۆرە بیروباوەڕێکی ئیلحادی..

---

[٩٥] الموسوعة الميسر التاريخ الاوربا.. د. محمد موسى شريف .. ل ٢٢٠

ئەم کارەی ناپلیۆن-کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر خەڵکی، چونکە ئاینی نەصرانی ئاینێکی تقوسییەو کۆمەڵێك مژدەو چیرۆکی ناو ئینجیلێکی دەستکاری کراوە بێ ئەوەی رۆحێکی لۆژیکی تێدا بێت، نە ئاینەکە نە پاپاو قس و قشەکان نەیاندەتوانی وەڵامی پرسیاری خەڵکی بدەنەوە، ئیتر ئەوە بووە هۆکاری ئەوەی کە وورده وورده ئاینی نصرانی لە ئەوروپادا هیچ ئەرزشی نەمێنێت، بەڵام ئەم پرۆسەیە دوای تەئصیل کردنی عەلمانی دێت بە گوێرەی قۆناغەکانی شۆڕش لە ئەوروپا و بەتایبەتیش لەفەرەنسادا، بە پشتیوانی خوا لە باسەکانی داهاتودا زیاتر روونی دەکەینەوە..

دوای ئەوەی بانگەشەی ئیمپراتۆری کرد ئەو دووکەسەی زیندانی کرد کە هاوکاری حوکمەتەکەی بوون بەناوقونصوڵ، دەسەڵاتی لە دەسەڵاتی لویس١٦ بەهێز تر بوو، خۆی تەنها فەرمانداری دەکردو گوێ بۆ مەجلیسی پیرانیش ڕانەدەگرت، توانی پرتوگالو ئیسپانیاش داگیر بکات بەفێڵ، لە ئیسپانیا براکەی خۆی کردبە پادشا و خەڵکی ئەوروپا بەتەواوەتی بێزار بووبون لە دەسەڵات و تەنانەت لەناوی ناپلیۆنیش، وویستی بەرەو روسیا بروات لە زستانیکی ساردا هەموو سوپاکەی لە ناو چوو وەك سوپاکەی هیتلەری لێهات، ئیتر لەدوای ئەو شکستەوە لە بەرانبەر روسیادا شکۆ و گەورەی لەبەرچاوی ئەوروپادا بەگشتی شکا، بۆیە توانیان هەموویان هاوپەیمانی ببەستن بەسەرۆکایەتی نەمسا لە جەنگێکی یەکلا کەرەوەدا بگەنە باڵەخانەی ناپلیۆن و لە پاریسدا بیخەن و ناپلیۆن بگرن و بینێرن بۆ دوورگەیەك بەناوی (ئیلبا)

ناپلیۆن -داوای کرد کوڕەکەی بکەنە جێگری و ئەو ئیمپراتۆریەتی فەرەنسا بگرێتە دەست..! بەو پێیەی دایکی کچی ئیمپراتۆری نەمساییە!..
ئەوروپا بە گشتی ئەوەندەیان رق لە ناپلیۆن دەبوەوە نەیاندەویست جارێکی تر بێتەوە سەر دەسەڵات و دەیانویست بیکوژن لەناوبچێت، کوڕەکەشی کە

بەناپلیۆنی دووەم ناسراوە ئەویش لەگەڵ دایکی ناردیانەوە بۆ بەلجیکا بۆ ئەوەی نەکوژرێت بە دەستی ئەوروپی یەکان بە گشتی..

لەم رەوشەدا دیسانەوە برایەکی لویسی ١٦، بەناوی لویسی ١٨ هاتەوە سەردەسەڵاتو هەمان کاری دووبارە کردەوە کە پێشتر لویسەکان ئەنجامیاندابوو... حوکم و فەرمانداری دەسەڵاتی ئەکلیریۆس و بەگزادەکانی گەڕاندەوەو باجو خەراج و سەرانەو ئازاردانی خەڵکی و خراپی باری ئابووری بەسەر خەڵکیدا هاتەوە. خەڵکی زۆر بێ پارەو ژیانیان زۆر سەخت بوو، دیسانەوە شۆڕش دەستی پێکردەوە. ناپلیۆن توانی لە دوورگەی ئیلبا بێتەوە دەرەوە، هەڵبێت و ئەو بڵێسەی شۆڕش تاوبداتەوە. بووەوە بە دەسەڵاتداری فەرەنسا خەڵك و ئەوانەی خۆشیاندەویست پێشوازیان لێکرد. ئەم جارە بۆ ماوەی ١٠٠ رۆژ حوکومو فەرمانداری کرد، لە مێژوودا ناسراوە بە حوکمی ١٠٠ رۆژەی ناپلیۆن لە ساڵی ١٨١٤ز[٩٦].

ئەوروپاو بە تایبەتیش بەریتانیا بەهیچ شێوەك دەسەڵاتی ناپلیۆنیان پێقوبوڵ نەبوو، جارێکی تر هاوپەیمانیەکی تریان لەسەر کرد بە سەرکردایەتی ئینگلیز دژی فەرەنسا دوای ١٠٠ رۆژەی دەسەڵاتی چوونەوە پاریس ناپلیۆنیان دەستبەسەرکرد ئینگلیزەکان ناردیان بۆ نیودورگەی (سانت هیلانە) لەوێ مایەوە لە دورگەیە تا ساڵی ١٨٢١ز هەرلەوێدا گیانی دەرچوو.. زۆربەی کاتەکانی بە نوسینەوەی یاداشتەکانی بردە سەر، بۆ جاری دووەم لویسی ١٨ هاتەوە سەر سەردەسەڵات و ببوە پادشای فەرەنسا تا ساڵی ١٨١٥ز. دوای ئەو کەسێکی تر لە بنەماڵەی پادشای (بوربون) واتا رەچەڵەکی بنەماڵەی لویسەکان بەناوی مەلیك (شارل ١٠) تا ساڵی ١٨٢٦ز. فەرمانداری کرد و پادشا بوو دوای ئەو کەسیکی تر

---

[٩٦] الموسوعة الميسر التاريخ الاوربا.. د. محمد موسى شريف .. ل ٢٢٣

بووه پادشای فەرەنسا لە هەمان بنەماڵە بەناوی (لوی فلیپ) لە ساڵی ١٨٢٦-١٨٤٨ز.

دیسانەوە شۆڕش دەستی پێکردەوە لەو ساڵەدا کوڕێکی تری ناپلیۆن دێتەوە سەر دەسەلات. لە مێژوودا ناسراوە بە ناپلیۆنی سێیەم١٨٤٨-١٨٧١ز..! ئیتر لەدوای ئەوە کۆتایی دێت بە فەرمانداری پادشایەتی و دەسەلاتی کۆماری دادەمەزرێت و لە فەرەنسادا دەچەسپێت، ئەمەی- تا- ئێستا باسمان کردوە فیکری سیاسی عەلمانی بوو لە فەرەنسادا دەستپێکی هاتنە سەردەسەلاتی عەلمانیەت بوو، بۆیە بە کورتی لە چەند بەشێکدا باسمان کرد.. لە دوای ئەم باسە دێینە سەر باسی فیکری عەلمانیەت ئەمە تەنها ئاماژەیەکی کەم بو بە مێژووەکەی، نوسەر گوتاری سایسی ناپلیۆن بە خودی ناوی ناپلیۆنەوە دەلکێنیت، چونکە هەمیشە بەدوای سەرومریدا گەڕاوە بۆ خۆی و هیچی نەکردوە بۆ وولاتی فەرەنسا وەك کاری دامەزراوەی و ئیمپراتۆری..

**گوتاری فیکری و سیاسی عەلمانی:**

مێژووی نوێی عەلمانی لە سەردەمی شۆڕشی فەرەنساوە زیاتر گوتاری خۆی والا کردوە، لە رووی سیستەمی سیاسی تا پێگەیشتنی ئەم بیرە کە ناسراوە بە (سیکۆلاریزم)(SECULARISM ) واتا دنیا وویستی دوور کەوتنەوە لە ژیانی ئاخیرەت و غەیبیات، جیاکردنەوەی هەموو کارێکی ئیمانی و دینی کە پەیوەست بێت بە ئاسمانەوە، بە واتایەکی تر کۆتایی هێنان بە پەیوەندی نێوان ئاسمان و زەوی... *(دائرەتەول مەعاریفی بەریتانی )

واتا لە سەردەمی دەستپێکی دەورانی عەزەمەتی فەلسەفەوە...تا- بیرمەندانی گەورەی ئەوروپا وەك( میکافلی و کانت و مارکس و فرۆید و داروین جۆن لۆك و ڤۆڵتێر و دیکارد )..تاد، بەوە رازی بوون کە مرۆڤ خاوەنی ئەقڵ و ژیرییە پێویستی بەوە نییە کە لەسەر زەویدا خوا حوکم بکات، بەڵکو خوا – کە ژیرو

هۆش و ئەقلی بەخشیبێت بە مرۆڤ ئەوا مرۆڤ دەتوانیت خۆی بڕیاری خۆی بدات و بەرژەوەندی خۆی دیاری بکات.
ئەگەر جیهانێك یان ژیانێکی تر هەبێت بگەڕیینەوە بۆ لای خوا ئەوا خوا با لەو جێگایەدا فەرمانڕەوای بکات، مرۆڤیش لە سەر زەوی خۆی فەرمانداری خۆی دەکات.
ئەم پێناسەیە هەموو ئەکادیماو ئینساکلۆپیدیاکان تاڕادەیەك کۆکن لەسەری، بەڵام ئەوەی کە عەلمانی بە عیلمانی لە قەڵەم ئەدات و دەیگەڕێنێتەوە بۆ بنەمای زانستی واتا لەسەر بنەچەی عیلم دامەزرابێت!، هیچ بنەمایەکی فیکری و زاراوەی و تەنانەت زمانەوانیشی نییەو قسەیەکی بەتاڵ و قیمەتی زانستی نییە..

لەبەر ئەوەی ووشەی دنیاویستی بەکوردی پاشان (العلمانیة) بە عەرەبی و بە ئینگلیزی (SECULARISM) هەموو مورادیفو تەواوکەری یەکترن بۆ دنیایی و دنیاوویستی، بەڵام ئەگەر عەلمانی بە کەسری پیتی ع بواییە واتا (العلمانیة) ئەوکات بە زمانی ئینگلیزی و تەنانەت لاتینیش دەوترا بە ووشەکە (SCIENTIFIC) بەڵام لە هیچ فەرهەنگ و ئەدەبیاتێکی سیاسی و فیکری و کۆمەڵایەتی بەم واتایە نەهاتووە، هەر گروپێك یان هەر کەسێك بە مانای زانست لێکیبداتەوە ئەوە بە دڵنیاییەوە کەوتۆتە هەڵەیەکی گەورەوە.

بەوەندە واز لە پێناسەی عەلمانی دێنین و دێینە سەر باسو جەوهەرەکەی کە خودی گوتاری عەلمانیەتە، تاڕادەیەکی زۆر باش ئەم چەمك و تێزانە روونکراوتەوە ئەبجەدیات و سەرەتای سیکۆلار لای خەڵکی روونە.
ناوەرۆکی باسەکە.. سەرەتا وەك پێناسەی خودی عەلمانیەکان ڕوون کراوتەوە، یاخود جلو بەرگی عەلمانیمان پۆشی و وەك خۆیان باسمان کردوە لە رووی رەخنەییە وە ئەگەر تەماشای بکەین ...
هەموو عەلمانیەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە دین پەیوەندی نەمێنێت بە ژیانی کۆمەڵایەتییەوە واتا زانستی کۆمەڵایەتی یاخود سیستەمی کۆمەڵایەتی، کە

پێکهاتەی دەوڵەت و دەسەڵاتە.. واتا (العلم الجتماع)، تەنها دین پەیوەست بێت بە تاکەکانەوە.

ئەوکەسەی کە ئەم زانستەی داهێناوە واتا زانستی کۆمەڵناسی زانایەکی ئیسلامییە پێش ئەو زانستێکی جیاکراوە نەبووە بەناوی زانستی کۆمەڵایەتی ئەویش زانای گەورەی ئوممەتی ئیسلامی (ئیبن خەلدونە) گومانیشی تێدانیە ئەوروپا دوای ئەوەی کە کەوتە تەنگەژەی دامەزراندنی سیستەمی سیاسی و جیاکردنەوەی دەسەڵاتی کڵێسا و ئەکلیرۆسەکان، بۆ ئەوەی ببێتە دەوڵەتی مەدەنی پەنایان برد بۆ ئەم زانستە و لە ئیسلامەوە وەریانگرتوە، بیرو زانستی کۆمەڵایەتی لە ئیبنو خەلدونەوە برا (دزرا) بۆ ئەوروپا، بۆچی لێرەدا ووشەی براو (دزرا) بەکار هێنراوە؟

بەهۆکاری ئەوەی ئەوکەسەی کە لە ئەوروپادا ناسراوە بە دامەزرێنەر و بیرمەندی زانستی کۆمەڵایەتی و سیستەمی ئیجتیماعی ناوی (ئەوگست کونت)ە و خەڵکی فەرەنسایە لە پاشاندا لەدوای ئەو بیرمەندی گەورەی نەمسایی بەناوی (جەمبول فیتش) ئەوەی ئاشکرا کرد کە سەرەتایی زانستەکە لە ئیسلامەوە وەرگیراوە کونت هیچ ئاماژەیەکی نەکردوە بە سەرچاوەکەی کە ئیبن خەلدوونە سەرەتایی زانستی ئەزمونی یاخود تەجریبی کە بنەمایی عەلمانییەتە لە ئیسلامەوە وەرگیراوە.. بیرمەندانی ئەوروپا سودیان لە دیدو تێڕوانینی زاناو فەیلەسوفە ئیسلامیەکان وەرگرتۆتەوە بۆ گۆڕانکاری لە ئەوروپادا[97]...

لەوانەیە ئێستا ئەو پرسیارە بە مێشکی خوێنەردا بێت بڵێت، باشە ئەگەر لە ئیسلامەوە بەشێکیان وەرگرتوە کەواتە ئیسلام ڕازییە بەو عەلمانیەتە و سەرچاوەکەی ئیسلامە؟!

---

[97] ( هو أوجست كونت August Count (١٧٩٨ - ١٨٥٧م) : فيلسوف فرنسي، مؤسس الفلسفة الوضعية، ومؤسس علم الاجتماع الغربي، عمله الرئيسي: (دروس في الفلسفة الوضعية).نقلا عن مصطفى الشكعة: الأسس الإسلامية في فكر ابن خلدون ونظرياته ص١٩٨.)

لەڕاستیدا – نەخێر– بەڵکو وەڵامەکە بەم شێوە دەستە بەر دەبێت، لە ئیسلامدا گەل سەرچاوە و سەنتەرە بۆ حوکمو فەرمانڕەوایی، پاشان شەریعەت سەرچاوەکەی هەر گەلە وهەڵقوڵاوی ناو کۆمەڵگە موسڵمانەکەیە کە پێی دەوترێت فیقهی ئیسلامی، بەڵام لوتکەی فەرمانڕەواییەکە ئاراستەی وەحییە!..

بۆ باشتر ڕوونکردنەوەی بە بەراوارد بۆ جوانتر تێگەیشتن لەم بیرە، لە ئەوروپادا لە دەسەڵاتی کڵێسادا گەل هیچ ئەرزشی نییە، شەریعەت کە لای ئەوان پێیدەوترێت (کەهەنوت) هەڵقوڵاوی ناو کۆمەڵگە نییە، بەڵکو دەسەڵاتی ئەکلیریۆس و پاشاکانە، لەڕاستیشدا خوا لە دەسەڵاتی کڵێسادا هەر بوونی نییە، بەڵکو پاپاو ئەکلیرۆسەکان جلی خوایەتی دەکەنە بەریان و خۆیان بەبێ سەرچاوە و دەستور بەناوی خواوە قسەدەکەن و بڕیار دەردەکەن واتا ئینجیل سەرچاوەی بڕیاردان نەبووە وەك دەستورێك، چونکە ئینجیل هیچ جۆرە حوکمێکی تێدا نییە، بێجگە کۆمەڵێك مزگێنی و ئامۆژگاری ئەویش قوتابیەکانی پێغەمبەر عیسا –سەلامی خوای لێبێت- نوسیویانەتەوە کە پێك هاتوە لە ٤ بەشی دەستکاری کراو.. ناوەکانیان (لوقا و مەرقس و یوحەنا و متا)یە..

لە ئیسلامدا هیچ کەس ناتوانێت بەناوی خواوە قسە بکات بێ سەرچاوەیەکی وەحی کە قورئان و سوننەتە..

بە دڵنیاییەوە قورئان و سونەتیش ئەوەی کە پەیوەندی هەیە بە ژیانی مرۆڤەکانەوە بەرژەوەندی خەڵکی تێدا پارێزراوە بەجێهێشتوە بۆ وەرزشی ژیرو ئەقڵی مرۆڤەکان وەك پێغەمبەر -صلی الله علیه وسلم- دەفەرموێت: "خۆتان شارەزاترن بەکاروباری ژیانی دوونیایی خۆتان" خوا و پێغەمبەرەکەی هیچ ئاراستەیەکیان نەکردوە، واتا لە ئیسلامدا بەگشتی هەموو شتێك حەڵاڵە..!

مەگەر ئەوەی خوای گەورە حەرامی کردبێت، ئەویش بە پەنجەی دەست دەژمێردرێت، خوای گەورە لە قورئاندا ئەوەی ڕوونکردۆتەوە، ئەوەی پاکە حەڵاڵە، ئەوەشی پیسە حەرامە.

ئەم چەمك و تێزانە پێچەوانەوە بوون لە ئاینی دەستکریکراوی پاپاو ئەکلیریۆسەکان، ئەوەی بۆ خۆیان شیاوو بووایە حەڵاڵیان دەکرد ئەوەشی زیان و

زەرەی بە دەسەڵاتی کڵێسا بەگەیاندایە حەرامیان دەکرد. لەم دیدگاییەوە عەلمانیەت هات ووتی؛ مرۆڤ سەنتەرە، ئەوەی پەرژموەندی مرۆڤی تێدابیە دەتوانێت بیکات فەلسەفەی پراغماتیکی واتا بەرژموەندیخوازی هاتە کایەکەوە، مرۆڤ سەرچاوەی هەموو دەسەڵات و پیرۆزییەکە، هیچ کەس بۆی نییە روویەڕوی ببێتەوە لەسەر زەویدا و خوا ژیری بەخشیوە بە مرۆڤ، خۆی دەتوانێت ئیدارەو کاری ژیانی خۆی بەڕێوەبەرێت.. ئەم بیرو بۆچوونانە وورده وورده لە ناو خەڵکیدا رەنگیدایەوە و لایەنگری بۆ پەیدا بوو، دوای ئەوەی زانستی کۆمەڵناسی و سیستەمی کۆمەڵایەتی دامەزرا، ئینجا بیرمەندان بیریان لەوە کردەوە ئەگەر مرۆڤ سەنتەرە دەبێت مرۆڤ فەرمانداری بکات، بۆیە لێرەوە دیموکراسی گەڵاڵە بوو لەسەردەمی دەرچوونی شۆڕشی پیشەسازییەوە گرێبەندی کۆمەڵایەتی لەلایەن ژان ژاك رۆسوە بۆ خەڵکی نوسراییەوە کە نێوانی خەڵك و دەسەڵاتداراندا پێویستە گرێبەندیك هەبێت.. ئەم گرێبەندە لە نێوان هەموو خەڵکاندا بە دەنگدان دەکرێت بۆ هەڵبژاردنی نوێنەرەکانیان لەسەر بنەمای سیستەمی دیموکراسی، پاشان ئەو سیستەمەش دەستەبەری مافە مەدەنیەکانیان بۆ دەکات، کە پێکهاتوە لە ئازادی و هاونیشتیمانیەتی و مافەکانی مرۆڤ، کە ئەم زاراوانە هەمووی زاراوەی رۆژئاواین و لە رەحمی رۆژئاوادا لە دایك بوون.

ئەمە لە ڕاستیدا باشترین و چاکترین سیستەمی بەرێوەبردن بوو بۆ رۆژئاوا کە لەنێوانی عەلمانیەت و دیموکراسی و مەدەنیەتدا دەخولێتەوە، لە مەینەتی کڵێساو پاپاو ئەکلیریۆس و بەگزادەو پادشاکان رزگاریان بوو..

جیهان تا رادەیەکی زۆر لەم سەردەمەشدا بەم سێ چەمکە فەرمانداری دەکات، کە بە هەرسێکیان دەوترێت مەبدەئی عەلمانی .. وەهیچیان بەبێ یەکتری ناتوانن ئەو سیستەمە پێکبێنن..

ڕای نوسەر- کەواتە عەلمانیەت لە جێگاو مەنزڵگای خۆیدا کە لەدایك بوو، باشترین ئەزموونی مرۆڤەکان بوو لە سەردەمی خۆید بۆ ڕزگار بوونیان لەو تەنگەژەو خراپەکاریەی کە هەبووە، هەرچەندە ئێستا سەرلەنوێ ئەوروپا لە رووی

رەوشتییەوە ناچار بووە پەنا بباتەوە بۆ ئاین، چونکە کاریگەری عەلمانی هەموو کۆمەڵگەیی ئەوروپی لەبەر یەك هەڵوەشاند خەریکە وەك دەیناسورو مانوتەکانیان لێدێت بەرمو لە ناوچوونو ئینقیراز دەڕۆن و لەو جێگایانەدا خاوەن رەگەزنامەی تر جێگایان دەگرێتەوە، ئەمەش کاریگەری عەلمانییەتە بەسەریانەوە.

دریژەی ئەو باسەی کەکردمان وەڵامی ئەو پرسیارانەیە، کەبۆچی لەوکاتەدا پیغەمبەر هاتووە، تا چەند سەر زەوی پێویستی بە گوتارێکی پێغەمبەرانە بوو.
يَا أَهْلَ الْكِتَابِ قَدْ جَاءكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيراً مِّمَّا كُنتُمْ تُخْفُونَ مِنَ الْكِتَابِ وَيَعْفُو عَن كَثِيرٍ قَدْ جَاءكُم مِّنَ اللّهِ نُورٌ وَكِتَابٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ المائده
واتە: ئەی خاوەنانی کتێب دڵنیا بن، کەپێغەمبەری ئێمە بۆسەر ئێوەش ڕەوانە کراوە، تا زۆربەی ئەو شتانەی کەلای ئێوە ڕون و ئاشکرا نین، دەیشارنەوە لە کتێبی تەورات و ئینجیل دا بۆتان ڕون و ئاشکرا بکات، هەروەها لەزۆر شت چاوپۆشی دەکات ئەگەر پەشیمان ببنەوەو ڕو بکەنە پەروەردگاری تاك و تەنها، چونکە بەڕاستی لەلایەن خواوە ڕوناکیەکی ئاشکراتان بۆ ڕەوانەکراوە (کە محەمەد پێغەمبەرە) هاورێ لەگەڵ کتێبێکی ئاشکرادا (کەقورئانە).
(يَهْدِي بِهِ اللّهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلاَمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنِ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِهِ وَيَهْدِيهِمْ إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ) ١٦المائدة
واتە: بێگومان خوا بەو قورئانە پیرۆزە هیدایەت و ڕێنمونی ئەو کەسانە دەکات، کە بەشوێن بەدەستهێنانی رەزامەندی ئەودا وێڵن، بەرمو ڕێبازەکانی ئاشتی و ئاسوودەیی دەیانبات، بەفەرمانی خۆی لەتاریکستانەکان دەریان دێنێت و ڕزگاریان دەکات و دەیانخاتە ناو ڕوناکیەوە، ڕێنموییان دەکات بۆ سەر ڕێگەو ڕێبازی ڕاست و دروستی دینداری و خواناسی و چاکە.
ئەمە بەگشتی ئەو نورە بوو کە لەو سەردەمە داخوای گەورە ناردی هۆکارەکەی ئەوەبوو، کەبزانین بۆ پێغەمبەری خوا - صلی الله علیە وسلم- هاتووە.

ئەو باسانەی کەئاماژەمان پێداوە بۆ ئەوە بوو، کەهەموو بپرسین ئەو سەردەمانەی کەباسمانکرد لەدەوڵەتی فارس و دەوڵەتی رۆم و چین و هیند و میسر و...هەتا دەگاتە هەموو دنیا، ئایا زەمەنی ئێستا پێویستی بەئیسلام نیە؟ پێویستی بەهاتنی پێغەمبەری خوا نیە سەرلەنوێ بگەڕێتەوە ناومان بەگوتاری پێغەمبەرایەتی؟

لای هەموتان ئاشکرایە، کەکۆتا پێغەمبەر پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم- زیندو نابێتەوە، بەڵام ئەوەی کەماوە لەناوماندا شەریعەتی ڕەبانی پێغەمبەری خوایە - صلی الله علیه وسلم-، هەموو ئەوروپا و وڵاتانی ئیسلامی و جیهان بەگشتی پێویستمان بەوەیە جارێکیتر ئیسلام بگەڕێتەوە ناومان بەگوتاری پێغەمبەرایەتی؟ ئەو پێغەمبەرە ئازیزە زیندو بێتەوە لەناوماندا بەسوننەتەکانی؟ سەیری کۆمەڵگەکان بکەن چۆن توشی دڕندەیی و تاوان" ئینحراف" و ڕەفتاری خوڕموشتی ناشرین بوون، سەیری وڵاتان بکەن بەرمو کوێ دەڕوات بزانن توشی چ کارێکی ئەخلاقی و "شذوذی جنسی" بوون!

دەزانین پێویستمان بەوە هەیە، کەئەم سەرزەویە خەڵکێك بیگرێتە دەست، کەشوێنکەوتوی محەمەدە - صلی الله علیه وسلم- باشە چۆن بتوانین ئەو سەردەمەی کەباسمان کرد بۆ ئەوەی گرێی بدەین بەئێستاوە... ئەو کۆمەڵگەیە هەمان ئەو کۆمەڵگەیە کەئێستا ئێمەی تێدا دەژین..؟!

لە وەڵامی ئەو پرسیارەی کەوروژاندمان ئایا هاتنی پێغەمبەر و گوتارەکەی چیبوو بۆ کۆمەڵگەی ئەو سەردەمە و ئێستاشمان بەتایبەتی و جیهان بەگشتی..؟
لە چەند خاڵێکی سەرەکیدا خۆی دەبنێتەوە..

١ـ پەیامی ئیسلام وەك خۆی بێ تێکەڵکردنی لەگەڵ هیچ مەنهەجێکی دیکەی سەرزەوی وەك دیموکراسی و لیبراڵی سەرمایەداری...هتد
لە ڕێساو یاسای ئەم پەیامە، کە پێغەمبەری خوا -صلی الله علیه و سلم-

ئەفەرموێت: (ترکت فیکم أمرین، لن تضلوا ما تمسکتم بهما: کتاب الله وسنة نبیه)[98]

واتە: دوو شتم بۆ بەجێهێشتوون، ئەگەر ئێوە دەستتان پێوەگرت و وازتان لێنە هێنان، هەرگیز گومڕانابن، ئەوانیش کتێبی خوای گەورە و سوننەتی پێغەمبەرە کەیەتی- صلی الله علیه و سلم.-

دەبینین باسی ئەوەی نەکردوە شوێنی تێڕوانی فەلسەفە و بیری کەسانیتر بکە وین، لێرەدا مەبەستمان ئەوەیە تێبگەین لەم پەیامە کە بۆچی لەو شوێنەوە هاتووە؟ هەرچەندە موسڵمانان ئێستا وایانلێهاتوە لەگەڵ فێربوونی زانستی ئیسلامیدا لاسایی رۆژئاوا دەکەنەوە، هەروەها بەو شێوازەی داپۆشینی ئافرەت لە ئیسلامدا داوا کراوە، ئافرەت بەو ئەندازە و پێوەرە ئیسلامییە بیری لێ ناکاتەوە، ئەڵێن: الحمدلله هەرباشە، بەس نییە داپۆشراوە، بەڵام ئایا لەبنەڕەتدا ئەو پۆشاکەی کەپۆشیویانە ئیسلامییە، یان نا؟ بەگشتی موسڵمانان ئەوەندەی یادی کریسمس و سەری ساڵ دەکەنەوە، ئەوەندە پابەندنین بەجەژنی ڕەمەزان و جە ژنی قوربانەوە! هۆکارەکەیشی لەئەنجامی تێکەڵبوون و مەفتونبوونە بەتەقالیدی ڕۆژئاواوەوە، بەڵام بۆیە لەو سەردەمەدا ئەو ئاینە پاك و بێگەردە لەو جێگەیەوە هاتووە، ئەوان مەفتونی هیچ هزرێکیتر نەبوون. موسڵمانان وایان لێهاتووە مەفتونبوون بەقسەی ئینجیل و زۆر کاریگەرییان بۆ دروستبوە، وەك ئەو قسەیەی کەدەڵێت: ما لقیصر لقیصر، وما لله لله. ئەوەی هی قەیسەرە بیدەرموە بەقەیسەر، ئەوەی هی خوایە بیدەرموە بەخوا. ئیسلام هەرگیز باوەڕ و قەناعەتی بەمە نییە، کە لەسەردەمی نیقییەکاندا ئەم قسانە بڵاوبوموە، یاخود موسڵمانان

[98] قال الالباني:١٨٦ - [ ٤٧ ] ( حسن )

وعن مالك بن أنس مرسلا قال : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : " تركت فيكم أمرين لن تضلوا ما تمسكتم بهما : كتاب الله وسنة رسوله " . رواه في الموطأ "

ئەوەندەی حەزیان بە نوسینەوەی مێژووی ئیسلامی لە تێڕوانینی جولەکە و نەساراوە بوە. ئەوەندە حەزیان نییە بەو مێژووەی، کە ڕاستگۆ و پاکەو دەتوانن لە دەم و دەستی خۆیانەوە وەریبگرن. یاخود ئەوەندەی گرنگی ئەدەن بەوەی بەشە فاعەت لە خەڵکانیترەوە وەریبگرن. ئەوەندە گرنگ نییە بەلایانەوە. کە لێکۆڵینەوە ی بوخاری و موسلیم بکەن بۆ ئەوەی بزانن چی تێداهاتوە. یاخود دەڵێن: (ئایا هەموو شتێك بەعەقڵ نییە. باشە بۆچی ئێمە هەموو ساڵێك بچین بۆ ئەم حەجە ؟ ڕاستە حەج شتێکی جوانە. بەڵام هەموو شتێك بەعەقڵ بوایەهەرساڵەو لە وڵاتێك حەج بکرێ. بۆئەوەی پەیوەندیی بازرگانی بچێتە شوێنی دیکەوە)ئەم پێوەرانەی بەعەقڵی ئێمەدەکرێن ئەم ئیسلامە پاك و بێگەردە بەهەڵسەنگاندنی ئێمە ناکرێ. بەگشتی پێوەرەکان تێکەڵبوون لەگەڵ فیکرەی خەڵکیتردا. لەو سە ردەمەدا کەئەم پەیامە هات دابڕابون لە هەموو بیرو بۆچوونێکی فەلسەفی و قانونی مادی و نەزەریەی ڕۆژئاوایی و... هتد.

ئەم ئیسلامە بەپاکی بوونیادی هاوەڵە بەڕێزەکانی کرد و وانەیەکی جوانی دا بە و خەڵکەو لەسەر بناغەیەکی ئیسلامیی جوان پەروەردە بوون. ئەم ئەمانەتە ئیسلامییە ئەو نەوە ناوازەیەی دروستکرد. کە هاوشێوەیان نەبوو و نییە. قورئان و سوننەت بووە بەکەسایەتی ئەوان و لەم سەری زەوی تا ئەو سەری زەوی توانیان بڵاوی بکەنەوە. هۆکارەکەشی ئەوەبوو هیچ بیرو بۆچونێکیتری تێکەڵ نە بوبوو. بەپاك و بێگەردی وەریانگرت.

ئەگەر ئەم ئایینە پیرۆزەی ئیسلام لە یۆنان بهاتایە یاخود لەکوردستانی ئێمە کە دەوڵەتی ساسانی دەستیگرتبوو بەسەریدا. باشە چیان دەگوت بەئێمە لەو کاتەدا؟ تەنها قسەیەکیان هەیە بەئێمەی دەڵێنەوە. بۆچی ئەم قورئانە بەکوردی نەبووە. بۆچی عروبە چی بێت؟

لەڕاستیدا ئەمە وانییە. ئەگەر مرۆڤ وردبێت و بیرکردنەوەیەکی لۆژیکی هەبێت. دەزانێت بۆچی لەو شوێنەوە هاتۆتە خوارەوەو حیکمەت و هۆکارەکەی دەزانن. سەیری ئەم ئیسلامە بکەن لەجێگەیەکدا کەشارستانییەت و هیچ مێژوویەکیان نەبووە. دینێك دێتەخوارەوە بۆ پێغەمبەرە ئازیزەکەمان- صلی الله علیه و سلم-

لەلایەن خوای گەورەوە، دینێکی کامڵ و موفەصەل لە ژینگەیەکی بەدەویی دەشتەکی سادە و ساکارەوە، کەهیچ نازانن! وەرن بزانین کام بیرمەند و زانایان هەبوە لەو شوێنەوە هاتبێت، ئەمە موعجیزەیەکی گەورەمان پێشان ئەدات، کەئە م ئیسلامە تەشریعێکی زۆر سەیری هێنایە کایەوە، هەروەها قسەی لەسەر بچوك و گەورەی ژیانی گەردوون و مرۆڤ کردووە، لە هەموو ڕویەکەوە قانونێکی تەواو و دروستی بۆ داناوین لە (سیاسەت، ئابووری، بازرگانی، کۆمەڵایەتی، بەڕێوەبردنی دەوڵەت و ماڵ و منداڵ، چۆنێتیی جەنگ کردن و ژنهێنان و پێکەوە ژیان...هتد). بەبێ ئەوەی هیچ کەموکورییەك جێبهێڵێت و بێ ڕەچاوکردنی سنور، بەڵکو بەکامڵی و بەجوانترین شێوە ئەم ئیسلامە هاتۆتە خوارەوە، ئەمەش ئەوە مان بۆ دەردەخات کەهۆی چییە لەمەککەوە هاتۆتە خوارەوە لەناو جزیرەی عەرەبیدا؟ ئەمە ئیعجازێکی تەواوی ئەم ئیسلامەیە و بەڵگەیە کە لەسەرئەوەی کەژینگەکە گونجاوبوە بۆ ئەم شەریعەتە ڕەبانییە.

١- گوتاری پێغەمبەری خوا -صلی الله علیه وسلم - ئەوەبو.. ئەم ئاینەی ئێمە.. هیچ کەم و کورتی تێدا نیە.. بەئاشکرا و بێ ڕوپامایي و بێ ترس لەبەرامبەر هەموو کەسێکدا ئەتوانین بوەستین، هیچ شتێکی شاراوەی تیا نیە، هیچ شتێکمان "باطنی" نیە، بەڵکو هەموو یاسا و ڕێسایەکی بەڕونی و ئاشکرا پێغەمبەرە نازدارەکەمان بەجوانی بۆی ڕونکردوینەتەوە و لەبەردەستی هەموماندایە "فإن هذا الحديث رواه ابن ماجه عن العرباض بن ساريةتركتكم على محجة بيضاء نقية، لا يزيغ عنها إلا هالك " قال الشيخ الألباني: صحيح.

٢ ـ گوتاری پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم- لەڕوبەڕوبوونەوەدا، سەرکەوتن تەنها لەلای خودایە، نابێت وا هەستبکەین بەپشتیوانیی خەڵکانیتر سەردەکەوین، دەبێت موسڵمانان لەناو خۆیاندا یەکگرتوبن، پاشان دەتوانن سەرکەوتن بەدەستبهێنن.

بۆئەوەی تێبگەین ئەم دینە لەجێگەیەکەوە هاتوە ئەو جێگەیە هیچ هێزێکی سەربازی تێدا نەهاتوە، بەڵام کاتێك ئیسلام دێت دەبینین لەگەڵ ئەوەی زۆر

بێتوانا و لاوازبوون لەڕووی سەربازیانەوە. بەڵام سەرۆکێکی سەربازی تێدا هەڵدەکەوێت بۆئەوەی دوایی نەوترێت؛ خۆیان پێشتر پێشەنگیان هەبوە و توانایان هەرهەبوە. وڵات لەدوای وڵات فەتحدەکەن. پاشان ڕێکەوتن دەکەن و وڵات ئاوەدان دەکەنەوە. بانگەوازی خەڵکی دەکەن بۆ ئەوەی وازبهێنن لە بەندایەتیی خەڵکی بۆ بەندایەتیی خوای بێ هاوتا "جئنا لنخرج العباد من عبادة العباد إلى عبادة رب العباد." بەو مانایەی مێژوویەکی گەورە دەهێنن لەفتوحاتی ئیسلامیدا. کەئەمە مرۆڤ سەرسام دەکات. موعجیزەیەکە بەهەموو پێوەرێك. کە ئەم ئیسلامە توانای دەگات بەوەی دەوڵەتی فارس دەڕوخێنێت بە(١٣٠٠٠) کەسەوە لەکاتێکدا دەوڵەتی فارس خاوەنی (٢ ملیۆن) سەربازبوە. ئەمە بەهەموو پێوەرێك موعجیزەیە. بۆیە ئەم ئیسلامە خودی خۆی موعجیزەیە. دەوڵەتی فارس بریتی بووە لە (ئێران، کوردستانی تورکیا، ئەفغانستان، ئۆزبەکستان، تاجیکستان، کازاخستان، قیرغیزستان، تورکمانستان....هتد) لەدوای وەفاتی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه و سلم- بە(١٣٠٠٠) کەسەوە فەتح دەکرێت. دەوڵەتی ڕۆم خەڵکێك فەتحی دەکەن کە بە موعجیزە دادەنرێ. زۆربەی زۆری ئاسیا و ئەفریقاو وڵاتی ئەندەلوس دەگرێتەوە دەستخۆی. بەمەش خوای گەورە تێماندەگەیەنێت کە ئەو پەیامە بۆیە لەو جێگەیەوە هاتۆتە خوارەوە. کە مەککەی پیرۆزە.

ئەگەر سەرنج لەعەرەب بدەین، لێرەدا قسەیەکی کیسرا دەهێنینەوە. کەپێش هاتنی ئیسلام کیسرای فارس چۆن سەیری عەرەبی کرووە. عەرەب وڵاتێکی دواکەتویان هەبوە. لەو کەسانەی کەزۆر شانازییان دەکرد بەوەی چونەتە دیوانی دەوڵەتی فارسەوە و (١٥) مەتر لەکیسراوە دوربوون. موغیرەی کوڕی شوعبە (خوا لێی ڕازی بێت) پێش موسڵمانبوونی، لەجاهیلییەتدا فەخری دەکرد کە چووەتە دیوانی کیسراوە. ئەمە زۆر گرنگ بووە بۆ عەرەب، کە شانازی بەوەوە دەکرد خەڵکانێك هەبوون بەس چونەتە ناو خاکی کیسراوە. بەڵام با سەیری عەرەب بکەین. کەچۆن ئەم ئیسلامەی بە ئێمە گەیاندوە. ئایا هۆکارەکەی چییە لەو دەوڵەت و جێگەیەوە دێت؟

سەرنجبدەن کاتێك موسڵمانان دەچن بۆ فەتحی وڵاتی فارس، پادشای فارس زۆری بەلاوە سەیر دەبێت و دەڵێت: بۆچی ئەم عەرەبانە هاتون بۆ فەتحی وڵاتی ئێمە؟! پادشای فارس دەڵێت: (مادام ئەمانە هاتون با جەنگ و کوشتار نەکەین، چییان ئەوێ بیاندەینێ بۆ ئەوەی بگەرێنەوە بۆ شوێنی خۆیان، جل و بەرگیان بدەنێ و هەر سەربازێکیان درهەمێکی بدەنێ، سەرۆکەکانیشیان ئیغرا بکەن و هەریەکەیان دوو پۆشاکی بدەنێ لەگەڵ (١٠٠) درهەم بۆئەوەی بگەرێنەوە. بەڵام ئەوان دەچن بۆ ئەوەی پەیامی ئیسلام بڵاوبکەنەوە، ئەوانیش بەم شێوە یە سەیری عەرەبیان کردوە.

ئاشکرایە موصعەبی کوڕی عومەیر لەجەنگی ئوحود دا شەهیدکرا، پۆشاکی بە ری بەشی نەدەکرد بەگەڵا دایانپۆشی، حوزەیفەی یەمانی (خوا لێی ڕازی بێت) کاتێك کە ڕۆیشت هەواڵ بدات بەپێغەمبەری خوا -صلی الله علیه و سلم- کە جەنگی

ئەحزاب بوو، جلی لەبەردانەبوو، چو جلی خێزانەکەی خۆی کردە بەری، هەرئەم دوڵەتەیە کە گەورە دەبێت و فەتحی دوڵەتانی فارس و رۆم دەکات، بۆیە خوای گەورە موعجیزە نیشانی ئەو خەڵکانە دەدات، کە ئیسلام لەم جێگەیەوە هاتوە بەگوتارێکی پێغەمبەرایەتی، سەرکەوتن تەنها لای خوایە.

لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه و سلم - لەجەنگی ئەحزابدا بوو، کافرەکان لەو جەنگەدا هێزیکی زۆریان کۆکردەوە دژی هێزی ئیسلام کە (١٠٠٠٠) کەس بوون، پاشان هەر بەو خەڵکەوە دوایی کە موسڵمان دەبن چون فەتحی وڵاتێکیان کرد (١٠ هەزار) بەرامبەر (٢ ملیۆن) کەس بەبێ ئەوەی چەك و تەقەمەنی باشیان ئامادە کردبێت، لەناو خاکی فارسدا توانییان سەرکەون بە سەر فارسدا.

ئەگەر سەیری سەرکردە بەرێزەکانی ئیسلام بکەین وەك: ئەبو عوبەیدەی جەراح، خالیدی کوڕی وەلید، عەمری کوڕی عاص، قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی... هتد ئەو پاڵەوانانەی ئیسلام، پێش موسڵمان بوونیان چیبوون؟ بەڵام

لەگەڵ هاتنی ئیسلام ئەمانە چ گۆڕانکارییەکیان بەسەرداهات؟ وڵاتی فارس و ڕۆم کەوتە ژێر
دەستیان، لەپێشینەدا باسدەکرێت خالید کوڕی وەلید (خوا لێی ڕازی بێت) لە جەنگی ئوحود دا بە(٣٠٠٠) کەسەوە نەیتوانی بەرامبەر (٧٠) کەس بووەستێتە وە، کە ئەگەر موخالەفەی پێغەمبەری خوایان -صلی الله علیه و سلم- نەکردایەو شاخی (روما)یان بەجێ نەهێشتایە، هەرگیز نەیاندەتوانی سەربکەون، بێگومان موسڵمانان یەکەمجار سەرکەوتوبوون، پێوەرێکمان هەیە بۆ پێوانی ئەم ئیسلامە ، ئەویش خوای گەورە فێرمان دەکات لەڕێگای گوتاری پێغەمەبەرموە بەوەحی دەفەرمویت: (فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ قَتَلَهُمْ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ رَمَى وَلِيُبْلِيَ الْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَاءً حَسَنًا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ)١٧ الأنفال
واتە: کەوابوو ئەی ئیمانداران: وەنەبێت ئێوە کافرانتان کوشتبێت، بەڵکو خوا کوشتنی و لەناوی بردوون، تۆش ئەی محمد(صلی الله علیه وسلم) کاتێك مشتێك خۆڵت ڕوو بەکافران فڕێدا ئەو کارە تەنها تۆ نەتکرد، بەڵکو خوا فڕێیداو (خۆڵی کردە چاوی کافرانەوە)، تا ئیمانداران تاقی بکاتەوە بە تاقی کردنەوەیەکی چاك، چونکە بەڕاستی خوا بیسەری (دوعاو نزایانە)، زاناشە (بەنیەتی دڵیان).

خوای گەورەپشت و پەنای ئەو خەڵکەیە، خوای گەورە توانیویەتی ئەو خەڵکە سەربخات بەو شێوەیە، باشە ئەگەر ئەم پەیامە لەوڵاتێکدا بهاتایەتە خوارموە خۆتان بڵێن، دەوڵەتێك بوایە وەك ڕۆم و فارس، ئەوکاتە دەیانگوت: (بۆیە ئەم ئیسلامە هاتۆتە خوارموە مێژوویەکی هەبوە لەگەڵ سەربازیدا، بۆیە توانیویەتی بەهێزی سەربازی و توانای خۆی ئەم ئیسلامە بڵاوبکاتەوە).
بەڵام بابڵێین سەیری فتوحاتی ئیسلامی بکەین، بزانین چۆن بووە؟
جەنگ کردنیان لەگەڵ ڕۆم و فارسدا هەمووی بەئیعجاز نەبووە، ئەگەر کەمێك شیکاریی لەگەڵ بیری خۆماندا بکەین، لەگەڵ ئەم مێژووەدا کە ئەمە شتێکە لە دەرموەی توانای مرۆڤ نەبووە، ئەبێت باش تێبگەین ئەم ئیسلامە بۆچی لەو جێگەیەوە هاتۆتە خوارموە گوتارەکەی لەوێوە دەستپێدەکات؟.

یەکێك لەسوننەتەکانی ئەم ئیسلامە ئەوەیە، کە هەمیشە خەڵکێکی کەم توانیویانە بەسەر خەڵکێکی زۆردا سەربکەون ،بۆ ئەوەی خوای گەورە بیسەلمێنێت بۆ ئەو

خەڵکەکە ئەم ئیسلامە بەزۆر و بۆر نییە، بەڵکو خەڵکانێك ئەگەر بەڕاستی ئەم ئیسلامە وەربگرن با کەمیش بن، بەڵام خوای گەورەهەر سەریان دەخات وەك دەفەرموێت: (.....كَمْ مِنْ فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ) ٢٤٩البقرة

واتە: کەمێکیان نەبێت. کاتێك کە پەڕینەوە خۆی و ئەوانەی باوەڕدار بوون لە تە کیا (گەلێکیان) وتیان: ئەمڕۆ (زەحمەتە بەم ژمارە کەمەوە) دەرەقەتی جالوت و سەربازانی بێین، (بەڵام) ئەوانەی کە دڵنیابوون بە خزمەتی پەروەردگاریان دەگەن وتیان: (مەترسن) چەندەها جار دەستەی کەم، زاڵ بووە بەسەر دەستەی زۆردا بە فەرمانی خوا، وە خوا یارو یاوەری خۆگرو ئارامگرانە.

ئەمە سوننەتێکمان بۆ دەردەخات، کە ئیسلام لە مەککەدا نە بەفەلسەفەو نە بە هێزی سەربازی هاتووە.

٣ ـ موسڵمانان دەتوانن سوود لەیاسا دانراوەکانی مرۆڤ وەربگرن، بەمەرجێك زیان نەگەیەنێت بەعەقیدە و دینیان، بتوانێت مامەڵە لەگەڵ هەموو سیستەم و بیروباوەڕکاندا بکات، مامەڵەکردن لەگەڵ تەبەنیکردن و ئاوێتەبوون جیاوازە، گوتاری پێغەمبەری خوا -صلی الله علیەوسلم - تەنها لەگەڵ مامەڵە کردنە، نەك ئاوێتە بوون.

لەباسەکانی مێژووی گوتاری سیاسی، تاڕادەیەك باسی سیستەم و شارستانیەت و توانای سەربازی ئەو وڵاتانەمان کرد، بەڵام لەنیوەدورگەی عەرەبیدا هیچ حوکمڕانییەکی باش و سیستمێکی تەواوی تێدانەبوو، عەرەب مەجلیسی حوکمیان هەبوە، لەزەویی مەککەدا هۆزەکان حوکمیان دەکرد هەروەك ئەمڕۆ چۆن

عەشایەرەکان حوکم دەکەن، وەك دیموکراسی وابوون، هەرکەسە دەهات حوکمی هۆزەکەی خۆی دەکرد و نوێنەرایەتیی هۆزەکەی خۆی دەکرد. ئەگەر بهاتایە ئەم ئیسلامە لە

دەوڵەتی فارس، یۆنان، ڕۆمان، چیندا... بهاتایە، خاوەنی حوکمێکی ڕێك و پێك و نەبڕاوەی ئەو سەردەمە بوایە، ئایا چەندەها قسەیان بۆ دروست نەدەکرد؟!

دەیانگوت: لەو سەردەمەدا حوکمی ئیسلام بۆیە هاتۆتە خوارەوە، پێشتر توانای شارستانییەتیان هەبوە، بەڵام بەپێچەوانەوە لەشوێنێکەوە ئەم ئیسلامە دێت کە هیچ دەسەڵاتێکیان نییە. ئا لێرەدا وانەیەك لە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه و سلم- فێردەبین، کەچۆن سوودی بینیوە لەکۆمەڵێك یاسای

ئەوان، سوودی لەو یاسا جاهیلیانە وەرگرتوە، بەمەرجێك کاریگەریی لەسەر ئیسلامە کە نەکردبێت، یەکێك لەو یاسایانە یاسای پەنادان بووە، کە لەژێر سایەی کەسێکدا خۆی حەشارداوە بۆ ئەوەی ئازار نەدرێت، پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه و سلم - دەچێتەژێر سایەی (مطعم بن عدی)، یاخود ئەبوبەکری صدیق ئەچێتە ژێر سایەی (دخنه) کەپیاوێکی موشریك بوو، یان عوسمانی کوڕی مەزعون ئەچێتە ژێر سایەی وەلیدی کوڕی موغیرە... هتد. یاخود یاسای (احلاف) بۆ نمونە: پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه و سلم - سوودی لەو فکرەیە وەرگرتوە، هەستا پەیمانی بەست لەگەڵ گەل و هۆزەکانیتر، بۆئەوەی هاوسەنگیەك دروستبکات و سوود ببینێت لەو هێزەی کە هەبووە لەجزیرەی عەرەبیدا، ئەمەش ئەوە دەردەخات لەوڵاتێکی وەك فارس کیسراکان حوکمیان کردوە و نەیتوانیوە پارسەنگی ئەم هێزە دروست بکات ئەمەش یەکێك بوو لەگوتارەکانی پێغەمبەری خوا[٩٩].

٤- کۆکردنەوەیان لەسەربنەمای بەندایەتی، لەماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەرقەم دا هەموویانی کۆدەکردەوە و ئاراستەی دەکردن بەوەحی و برایەتی نێوانیان پتەوتر

[٩٩] ابو بكر الصاحب الرسول .. د.راغب السرجانی ص ٧٨

دەکرد، فیری زانست و زانیاری دەکردن و شیکاری بۆ دەکردن لەسەر ڕوداوەکانی ڕۆژ و ململانێی ناوچەکە و جەنگی گەورەی نێوانی فارس و ڕۆم، فێرکردنی هاوەڵانی بەزمانی قورئان و تێگەیشتن لەوشەکانی ئەگەر چی خۆشیان عەرەب و زمانزان بوون..

ئەمەش هۆکارێك بوو لەوکاتەدا ئەم قورئانە بەو شێوەیە و لەو جێگەدا بەزمانی عەرەبی هاتۆتە خوارەوە، ئەو خەڵکە لەوسەردەمەدا خۆیان شاعیر بوون لەزمانی عەرەبیدا زۆر باشبوون، (جبیر بن مطعم) دەڵێت: (ئێوارەیەکیان گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو - صلی الله علیه و سلم- قورئانی دەخوێند، جوبەیر خۆی موشریك بوو، دەڵێت: منیش بەئاسپایی گوێم بۆدەگرت). هەموو دەزانین پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه و سلم- لەگەڵ هاوەڵە بەڕێزەکانی قورئانیان دەخوێند، گەورە پیاوانی قورەیش بەنهێنی گوێیان بۆدەگرتن، ئەو ئایەتەی دەخوێند هەروەك جوبەیر دەیگێڕێتەوەو دەڵێت: (گوێم لێبوو دەیفەرمووو: (أَمَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَأَنْزَلَ لَكُمْ مِنَ السَّمَاو مَاء فَأَنْبَتْنَا بِهِ حَدَائِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَا كَانَ لَكُمْ أَنْ تُنْبِتُوا شَجَرَهَا أَولَهٌ مَعَ اللَّهِ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ )٦٠ النمل

واتە: (ئایا شەریك و هاوەڵ چاکترە بپەرسترێ) یا ئەو زاتەی کە ئاسمانەکان و زە وی دروستکردووەو لەئاسمانەوەباران دەبارێنێ و باخ و باخات و بێستانی جوان و ڕازاوەی پێ بەرهەم دێنێ، ئێوەهەرگیز نەتاندەتوانی درەختەکان بڕوێنن، ئایا ڕەوایە کەخوایەکی تر لەگەڵ خوای پەروەردگارا هەبێت؟! کەچی لەگەڵ ئەو هەموو (بەڵگانەدا) زۆربەی ئەو خەڵکەلەڕێبازی ڕاست لادەدەن و شوێنی چەوتی و نادروستی دەکەون.

دەڵێت: خەریکبوو دڵم ئەفڕی ئەوەندە هەستم بهێارامی دەکرد، بەو ئایەتە هەستم دەکرد ئەمە شتێکە پەیوەندیی نییە بەسەر کەسێکەوە، کەقسە بکات، بەڵکو ئەمە شتێکە لەجێگەیەکەوە هاتوە، لەلایەن خواوەیە بۆ سەرزەوی.

هەمووومان دەزانین دوژمنانی ئیسلام هەروەك (موستەفا کەمال) یەکەم کار کە کردی زمانی عەرەبی قەدەغەکرد، ئەمەش بۆئەوەی خەڵکی لە دینەکە

دورکەونەوە کەسێکی بەریتانی هات بۆ میسر پێش هەموو شتێك لە تەنیشت زانکۆی ئەزهەرەوە قوتابخانەیەکی دروستکرد بۆ زمانی بیانی بۆ بڵاوکردنەوەی فکری عەلمانی، خەڵکەکە وایانلێهات وازیان لەزمانی عەرەبی هێنا و قوتابخانەی زمان کرایەوە، بەڕاستی شورەییە بۆ موسڵمانان کە خۆمان بەموسڵمان دەزانین و ئەم ئیسلامەمان خۆشدەوێت، کاتێك قسە لەگەڵ پاکستانییەك دەکەین سەیردە کەین بەزمانی ئینگلیزی قسەدەکات! ئەی باشەبۆچی بەعەرەبی قسەناکات!

هەندێکجار عەرەب لەگەڵ عەرەب خۆیدا، هەروەك و کابرای میسری دەچێت بۆ مەغریب ئەبێت فەرهەنگێك لەگەڵ خۆیدا ببات، چونکە لێی تێناگات، یاخود مەغریبی و سعودی لەیەکتری تێناگەن، کەهەمویشیان پێیان دەگوترێت: عەرەب، ئەگەر سەیر بکەین دەبینین: ئیمام بوخاری خەڵکی تورکمانستانە و لەناوچەی بوخاراو سەمەرقەند و دەوڵەتی خەواریزم شاوە هاتوە، دووەم کتێب لەئیسلامدا سەحیحی بوخارییە و ئیمام بوخاری نوسیویەتی لەکاتێکدا خۆیشی عەرەب نەبووە، ئەوە خۆشەویستیی ئیسلامەکەیە وای لێدەکات، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ئەم ئیسلامە ڕۆژانێك بووە گشتی نەبووە.

زمانی عەرەبی گرنگە بەلامانەوەو خۆشمان ئەوێت چونکە زمانی قورئانە و زمانی پێغەمبەرەکەمانە -صلى الله عليه و سلم- لا فضل للعربي على الأعجمي إلا بالتقوي..( ئەمەبانگەشە نییە بۆ عەرەبچێتی، نا بەڵکو پێغەمبەر -صلى الله عليه و سلم - خۆی عەرەب نییە بەڵکو بەعەرەب کراوە، بەڵام زمانی دینەکەمان عەرەبییەبۆیە پێویستە لەدینەکەمان تێبگەین ئەم گوتارە بوونیادنانی بیروباوەڕی ئیسلامیە بۆیە گرنگە لەزمانی ئاینەکە تێبگەین.)

٥ ـ هەوڵی تێگەیاندنی ئاینی ئیسلام لەکەس و کار و نزیکەکانمانەوە، تا بتوانیت سوودیان پێبگەیەنیت، بۆ ئەمەش خوای گەورە دەفەرموێت: (وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ) ٢١٤ الشعراء.

واتە: ئیسلام لەناو خەڵکانی نزیکی خۆتدا بڵاوبکەوە باشترە.

ئیسلام هات بۆئەوەی (تدعوا أقرب فالأقرب الأقرب) واتە: هەمیشە تۆ ئەو کەسەی نزیکتە کە بانگەوازی بۆ دەکەین..
پێویستە یەکەمجار بانگەوازی ئەوەبکەین کەبڕوای بەخوا هەیە، دووەم ئەوەی لێیەوە نزیکە و بڕوای بەدین هەیە، بەگشتی و گەورەیی خوا ڕادەگرێ، ئەمە ئاسانترە بۆ تۆ بانگەوازی بۆ بکەیت، لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکی بانگەوازی شیوعی و بێدینەکان
بکەن، بەڵام ئەوەی کە بیروبڕوای نزیکترە ئاسانترە، پێغەمبەری خوا - صلی الله علیە و سلم- وەك حیکمەتێك ئەم ئیسلامەی لەو جێگەیە ڕاگەیاند لەبەرئەوەی بڕوایان بەوەحدانییەتی خوای گەورە هەبوو.

٦ ـ ئیسلام پیاوی ڕاستگۆی پێویستە خەڵکانێکی ڕاستگۆ ئەیبەن بەڕێوە، کە ئیسلامەکەیان لە خۆیان خۆشتر بوێت.
فەزڵی عەرەب نییە بەسەر کورد، یاخود کورد بەسەر فارس، بەڵکو پەیوەندیی بەوەرگرتنی زمانەکەی ئەو خەڵکەوە هەیە، کە هەموو کەسێك دەتوانێت لەو زمانە سوود وەربگرێت.
سیفەت و ڕەوشتی عەرەب، هەروەك ئاماژەمدا، سیفەتیان هەبوە جێی سەرسوڕمانە، لەناو خەڵکانیتردا بەوشێوەیە نەبووە، بۆ نمونە: ڕاستگۆیی لە ناو عەرەبدا سیفەتێکی بەرز بووە، لەناو ئەم ئیسلامەشدا کەسێك هەتا راستگۆ نە بێت، ناتوانێت خەمی ئەم پەیامە لە کۆڵبگرێت، ڕاست و دروست نەبێت، ناتوانێت بانگخوازبێت بۆ ئەم ئیسلامە، یەکێك لەگەورەترین سیفەتەکانی موسڵمان ڕاستگۆییە، پێغەمبەری خوا - صلی الله علیە و سلم- بە (صادق الامین) ناسراوە، هاوەڵەکەی ئەبوبەکری صدیق، بەصدیق: ڕاستگۆ ناسراوە، ئەبا عوبیدەی جەراح، بەئەمینی ئومەت ناسراوە، لەبەر ئەوە عەرەب بەگشتی سیفەتی ڕاستگۆییان تێدابوە، درۆیان نەدەکرد و ڕقیان زۆر لەدرۆبوو، ئەم پەیامە ئەگەر لەناو قەومێکی دۆزندا بهاتایە، وەك جولەکەو نەساراکان، درۆیان بەدەمی خوای گەورە وە دەکرد،

هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُونَ أَلْسِنَتَهُمْ بِالْكِتَابِ لِتَحْسَبُوهُ مِنَ الْكِتَابِ وَمَا هُوَ مِنَ الْكِتَابِ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ) ٧٨ آل عمران

واتە: دەستەیەك لەوانەی (كەلەچەند ئایەتی پێشودا باس كران، واتەجووەكان) زمانیان با دەدەن بەجۆرێك شت دەڵێن، گوایە(تەورات) دەخوێننەوە، بۆ ئەوەی (ئێوەچەواشە بكەن و) وا بنوێنن كەئەو كتێبە دەور دەكەنەوە، لەحاڵێكدا ئەوەی كەدەیخوێننەوەلەو كتێبەنیە(وەزۆر جار) دەڵێن: ئەوەی كەدەیخوێنین هەر ئەوەیە كەخوا ڕەوانەی كردووە، بەڵكو هەرگیز ئەوە لەلایەن خواوەنیە، وەبەدەم خواوە درۆ دەڵێن و چاكیش دەزانن كە(درۆو بوختان دەكەن).

ئەمەش لەكوێ لەناو قەومێكدا دابەزیوە شمشێریان خستۆتە سەر گەردنیان هەر ڕاستگۆبوون، درۆكردن سیفەتێكی پیسبوە لەناویاندا و بڕوایان بە درۆ نەبووە، كەواتە گوتاری پێغەمبەری خوا بانگەوازی نزیكەكان بووە بەراستگۆیی.

٧- بەخشندەیی.. ئەوەی باش و جوانە بیبەخشین بۆئەوەی ڕا بێین لەسەر بەخشین، ئەمەش لە جیهاددا خاڵێكی سەرەكییە، لەگوتاری پێغەمبەری خوادا - صلی الله علیەوسلم- ڕەنگی داوەتەوە.

پیغەمبەری خوا - صلی الله علیه و سلم- دەفەرموێت: (إنما كرم كرم المؤمنين)

واتە: ئەوەی بەخشندە و بەڕێز بێت هەر موسڵمانە بەخشندەو بەڕێزە. ئەم ئوممەتی ئیسلامییە كاتێك دێتە پێشەوە پێویستیی بە بەخشین هەیە، بۆیە لەو كاتەدا ئیسلام هات خەڵكی سەروەت و سامانی خۆی دەبەخشی، ئێمە باس لە جیهاد دەكەین، ئەم جیهادە وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: (الَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِنْدَ اللَّهِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَائِزُونَ) ٢٠ التوبة

واتە: ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو كۆچیان كردووەو جیهادو هەوڵ و كۆششیان ئەنجامداوە لەپێناوی ڕێبازو ڕەزامەندیی خوادا بەماڵیان و بەگیانیان، پلەپایەو

پاداشتیان لای خوا بێ سنوور و گەورەترە، ئا ئەوانەش کەباسکران هەر ئەوانە سەرفرازو بەختەوەرن ...

بەشێك لە جیهادکردن بەخشینی سەروەت و سامانە، لەچەند شوێنێکدا خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُولَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ) ١٥ الحجرات

واتە: بێگومان ئیماندارانی ڕاست ئەوانەن کە باوەڕیان بەخواو پێغەمبەری خوا هێناوەو پاشان ناکەونەهیچ گومان و دوودڵیەکەوە، بۆ خۆیان و سەرو ماڵیشیانەوە تێدەکۆشن لەپێناوی ئاینیی خوادا..لەڕاستیدا ڕاست و ڕاستگۆ هەر ئەوانەن.

ئەگەر خەڵکێکی ڕەزیل و پیسکەو چروك ئەم ئیسلامە هەڵبگرێت ناتوانێت، ئەبێت خەڵکێك بێت بەخشندەبێت، بۆیە عەرەبیش لەو سەردەمەدا نمونەبوون بۆ بەخشندەیی، پیاوێکی وەك ئەبوبەکری صدیق (خوا لێی ڕازیبێت) هەموو سەروەت و سامانی خۆی بەخشی لە پێناوی ئەم ئیسلامەدا و چەندین بەندەی کڕیەوە و ئازادی کردون بۆئەوەی ببن بەموسڵمان، جەیشی موسڵمانانی ئامادە کرد بەپارە و سەروەت و سامانی خۆی، هیجرەتی پێغەمبەری خوا- صلی الله علیه و سلم- بەپارەو سامانی خۆی بو. عوسمانی کوڕی عەففان (خوا لێیڕازیبێت) سەروەت و سامانی خۆی تەرخانکرد بۆ یەکێك لەسوپاکان، هەروەها (بیری رما)ی کڕی، مزگەوتی پێغەمبەر

-صلی الله علیه و سلم - لەسەر پارە و سامانی ئەو دروستکرا لەمەدینە، چەندین جار سەروەت و سامانی خۆی بەخشیوە. عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف قافڵەیەکی هێنا لە مەدینە هەر بەخۆرایی ئەیبەخشییەوە کەباری(٧٠٠) حوشتربو.

تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵا (٧٠٠) درهەمی لەشەو و ڕۆژێکدا بەخشییەوە بەسەر هەژارەکانی ناو مەدینەدا.

٨ ـ ئازایەتی، سیمای گوتاری پێغەمبەر خوا -صلی الله علیه و سلم- بووە، ئەوەی ترسنۆك بوایە پەروەردەی دەکرد بەگوڕوتنیکی ئازایەتی و چاونەترس بەبیروباوەڕی ئیسلامەتی.

عەرەبی سەردەمی جاهیلی قسەیەکیان هەیە دەڵێن: (**کان العرب قبل نزول الرساله یفتخرون بالموت**) واتە: شانازیان بەمردنەوە کردوە بۆئەوەی بکوژرێن، (**یستهیون بالحیاە تماما**) سەرشۆڕیبوە بۆیان کە نەکوژرێن، یەکێك لە عەرەبەکان کە برایەکی کوژراوە (**بلغه قتل اخیه**) ئەویش دەڵێت: جا ئاساییە (**ان قتله فقتل ابوه واخوه وعمه**) ئەوەی کوژراوە باوك و براو مامیشی کوژراوە (**والله لانموت حذفا**) وەڵا ئێمە نامرین ئیلا بەکوشتن نەبێت، لە کۆتاییشدا لە مێژوودا هاتوە: (**والموت تحت ظلال السیوف شرف الموت**) مردن لەژێر سێبەری شمشێردا بەڕێزترین مردنە.

هەربۆیە هەمیشە ئازابوون بۆ مردن و کوشتن نەك لەسەر جێگە مردن.

ئیسلام خەڵکی ئازای دەوێت، هەرچەندە توانای بەڕێوەبردنی سەربازیان نەبووە، بەڵام خەڵکێکی ئازا و بەجەرگ بوون، خالیدی کوڕی وەلید لەو کەڵە پیاوانەیە لە ناو ئەواندا هەڵکەوتوە لەجەنگدا، دەڵێت: (هەرکاتێك منتان بینی شمشێرەکەم بەرزکردوە بەرامبەر بەدوژمن ئێوەیش شمشێر بەرزبکەنەوە).

هەمیشە یەکەم کەس بووە شمشێری بەرزکردۆتەوە، بەرائی کوڕی مالیك یەکێکە لە هاوەڵە بەڕێزەکان، لەجەنگی یەمامە ئەیخەنە ناو مەنجەنیقێك و فڕێی دەدەنە ئەو دیوی قەڵاکەوە بۆئەوەی دەرگاکە بکاتەوە، ئەودیوی قەڵاکەش (٤٠٠٠) مورتەدی لێبوە لەگەڵ موسەیلەمەی کەزابدا، ئەمانە نمونەی ئازایەتی و حاڵەتی ئیستیشهادین، هەمیشە عیززەتیان هەبوە و سەریان دانە نەواندوە بۆ هیچ کەس، عیززەت سیفەتێك بووە لەناو عەرەبدا کەحەزیان بەسەربەرزی و ئازادی بووە، لەدواییدا کەئیسلام هێندەیتر عیززەتیان بەرزدەبێتەوە، ئەمە بە گشتی سیفاتی ئەوان بووە.

**(مَن كَانَ يُرِيدُ الْعِزَّةَ فَلِلَّهِ الْعِزَّةُ جَمِيعًا إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ وَالَّذِينَ يَمْكُرُونَ السَّيِّئَاتِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَكْرُ أُوْلَئِكَ هُوَ يَبُورُ) ١٠فاطر**

واتە: ئەوەی کەسەربەرزی و پایەبڵندی دەوێت (با بزانێت) کەهەمووو سەربەرزیی و پایەبڵندیەك شایستەی خوایەو هەر ئەویش دەیبەخشێت، گوفتاری چاك و جوان و بەجێ بۆلای ئەو بەرز دەبێتەوە، کار وکردەوەی چاکیش هەر ئەو بەرزی دەکاتەوە، جا ئەوانەی کەپیلانی خراپ دەگێڕن سزای زۆر توندوتیژ بۆیان ئامادەیە، بێگومان پیلانی ئەوانەهەر خوا خۆی پووچی دەکاتەوە.

٩ ـ سوربوون لەسەر عیزەتی نەفس، بەزیللەتی نەمرین، چونکە هیچ کەس بە ترسان، تەمەنی درێژنابێتەوە، کەسیش بە ئازایەتی تەمەنی کورت نابێت، بەلآم ئازایەتی هەڵبژێرین باشترینە بۆ ئەوەی ژیانمان بەشانازییەوە بگوزەرێنین گوتاری هیوا خواستن بەشەهیدی.

گوتاری پێغەمبەری خوا -صلی الله علیەوسلم- سەبرو ئارامگرتن بوو، ئارامیان دەگرت لەسەر گەرما، وشکی، سەرما، هەژارییەکی زۆر، هەندێك جار بەهەفتە نانیان نەخواردوە و گوێیان نەداوەتە جل وبەرگ و بەژیانێکی سادە ژیاون و زۆرئارام گربوون، کاتێك ئەم ئیسلامەش هاتە خوارەوە پێویستی بەئارامگرتن هەبوو تابتوانن هەڵیبگرن، تا ئارامبگرن لەسەر (برسێتی، جیهاد و قورسیی جەنگ، ماندوبوونی سەفەری رێگەی دور و درێژ، ئابڵوقەی ئابووری و کۆششکردن و...هتد

١٠ ـ گوتاری پشت بەخۆ بەستن و لەسەرپێی خۆ وەستان لەکاتی تەنگانە و جیهاد و برسێتی و قسە و گوفتاریشماندا.

دەیویست فێریان بکات لەسەر پێی خۆیان بوەستن پەلامار نەدەن بۆلای دموڵەتانی تری دنیا و پرۆژەی خۆیان بخنە ژێردەستی زلهێزان، بۆ ئەوەی بەسەر نەیارانیاندا سەربکەون[١٠٠].

[١٠٠] وشهد شاهد من اهلها..د. راغب السرجانی ل ٢٥-٣٣

## سیمای دەسەڵات لەگوتاری پێغەمبەرایەتیدا:

ئیسلام لەسەرەتای هاتنیەوە، ڕازی نەبوو بەهیچ سیستەم و بەرنامەیکی دیکە لەڕووی فکری سیاسیەوە تیکەڵ بێت بەبانگەوازەکەی پێغەمبەری خوا - صلی الله علیەو سلم-، چونکە بۆ خۆی سیستەمی ئیسلام گشتگیربوو واتە: هەمەلایەنە بوو بەزمانی زانستی ئێستا لەڕووی سسیتەمی کۆمەڵایەتی و سۆسیۆلۆجییەوە، قسەی لەسەر هەموو کایەکانی ژیان دەکرد، هەر لەتاك و کۆمەڵگەو دەسەڵات و ئابووری، هەموو چالاکیەکانی ناو کۆمەڵگە، لەهەموو ڕەهەندەکانیەوە..

گوتاری پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم- جیاواز بوو ڕازی نەبوو بەهیچ لەتێکەڵ بوون لەگەڵ سیستەم و فەرماندارەکاندا..

پێغەمبەرمان- صلی الله علیه وسلم- بانگەوازی دەستپێکرد دژی سیستمەکەی قوریش، قوڕەیش هاتنە لای و داوایان لێکرد، کە چی دەوێت هەموو قوریش بۆی کۆدەکەنەوە و ئەیدەنێ و دەیکەنە گەورەی خۆیان و پارمو سەروەت و سامانی لەهەمویان زیاتر بێت، کام ئافرەتەی خاوەنی جوانی و نەسەبی بەرزە دەیبەخشن بە پێغەمبەر- صلی الله علیه وسلم-.

## وەڵامی پێغەمبەر بۆ سیستمەکە چی بوو؟

- فەرمووی ئەگەر ڕۆژ و مانگ لای ڕاست و چەپم بێت واز لەبانگەوازەکەی خۆم ناهێنم.. واتە: ئەو سیسیتەمەی ئەو داوای دەکات!..

ئەگەر بەپێوەری گوتاری ئیسلامی بێت لەئێستا دەڵێن: هەلێکی (چانسێکی) باش هەڵکەوتوە با بڕۆینە ناو ئەم کایەی سیاسیەوە تا لەو ڕێگاوە کارەکەی خۆمان ئەنجام بدەین..

بەڵام پێغەمەبەر- صلی الله علیه وسلم- ئەنجامی نەدا، لەبەر ئەوەی سیستەمە سیاسیەکەی ئەو جیاواز بوو لەهەموو داواکاریەکانی قوڕەیش، ئەو بۆ خۆی

خاوەنی سیستەمێکیتر بوو، ئەمە خاڵی جەوهەرییە وە وەڵامی پرسیارەکە دەستەبەر دەکات، کەئیسلام لەهیچ ناچێت نە لەدیموکراسی، نە لیبراڵی، نە لەهیچ

بەرنامە و سیستەمێکی تری دونیای جاهیلی، بەڵکو نە شەرقیە و نەغەربیە.. ئیسلامیە و ئیسلامیە، ئەم دروشمە زۆر جوانە هاوڕێکانی سەید قوتب و سەید قوتب لەزیندانەدا دەیانگوتەوە، پاشان لەدوای فەتحی مەکە دارولنەدوە ئەرزشی نەما و فرۆشرا بەکەسێك کردی بەتەویلەی ئاژەڵ[١٠١].

**گوتاری ئیسلام و سیستەمەکەی بریتیە لە:**

یەکەم: ئاینێکی پڕ و هەمەلایەنەیە ووتەی تایبەتی هەیە لەسەر هەموو ڕەهەندەکانی ژیان و جیهانبینی، ئەویش تایبەتە بەرامبەر بەگەردون و مرۆڤ و ژیان..

دووەم: مەرجەعیەتی یاسا دەگەڕێتەوە بۆ ئیسلام و لەسەر بنەمای نەگۆڕەکان کاردەکات، کەسەرچاوەکەی خواو پێغەمبەری خوایە - صلی الله علیه وسلم- پاشان دەگەڕێتەوە بۆ شەرعزانەکانی و شارەزای بوارەکان و خاوەن تایبەتمەندیەکان و بۆ دەرهێنان و هەڵهێنجانی یاسا لەهەموو بوارەکانی ژیان لەچوارچێوەی نەگۆڕەکان (الثوابت) لەشەریعەتدا (مقاصدها العامة) مەبەستە گشتیەکانی.

سێیەم: گرێبەندی کۆمەڵایەتی لەنێوانی حاکم و مەحکومدا ڕێکدەخرێت بەگرێبەندێکی ئیمانی لەگەڵ خوای موتەعال بەم گرێبەندە کۆمەڵایەتیە لەئیسلامدا دەوترێت بەیعەت.

---

[١٠١] سيرة الرحيق المختوم.. صفي الرحمن المبارك كفوري ٤٥

چوارەم: مەنهەج و ئالیەتی کارکردنی لەرێگای دامەزراوەکانیەوە پیادە دەکرێت، ئەویش شورایە[١٠٢].

چەمکی سیستەمی ئیسلامی چەند تێگەیشتن و میحورەێکی تایبەتی هەیە لەگوتاری سیاسی ئیسلامیەوە:

یەکەم: مرۆڤ

مرۆڤ لەناو ئەم سیستەمەدا سەنتەرە بەباشترین کوالیتی واتە: بەرنامەکە بۆ مرۆڤ هاتووە، قسەکردنە لەگەڵ ناخی مرۆڤەکان، لەهەموو ڕویەکەوە ئیسلام گرنگی داوە بەمرۆڤ کەرامەتی پاراستوە، خوای گەورە ڕێزی لێناوە، هەموشتێکی خستۆتە بەردەست لەم بوونەدا.

دووەم: خێزان و کۆمەڵگە

شادەماری ناو پێکهاتەی موسڵمانان و لەسەر بنەماکانی نیکاح و تەلاق ڕێکی خستوە و خۆشەویستی و سۆزی لەنێوانیاندا بەرپاکردوە ئەرك و مافی ئەندامەکانی ناو خێزانی لەمنداڵەوە تا پیرێك دەستنیاشان کردووە.

سێیەم: ئوممەت

ئوممەت پایەیەکی کاریگەری کایەی دەسەڵاتی سیاسی ئیسلامیە و لەگەڵ هاتنی زاراوە ئیسلامیەکاندا ئەویش لەدایکبوە، مانای کۆمەڵە خەڵکێکە کەبە

---

[102] النظام السياسي في الاسلام د. محمد عندالقادر ابوو الفارس ل ٨٥

ئاراستەیەکی دیاریکراودا دەڕۆن و خاوەن یەك ڕوگەن، ئەم چەمکە لەبنەڕەتدا واتە: مرۆڤ و کۆمەڵگەو دەسەڵات و پەیام.

چوارەم: خیلافەت

یەکێکە لەسیمای سەرەکی دەسەڵاتی ئیسلامی، خوای گەورە مرۆڤی وەك جێنشینی پیادەکەری یاسای خۆی دەستنیشانکردوە لەسەر زەوی لەگەڵیشیدا بۆ بەندایەتی و ئاوەدانکردنەوە، ئەو ماناو چەمکانەی کەخیلافەت جیادەکاتەوە لەسیستەمەکانیتری جیهانی بریتیە لەئیمامەت و ئیمارەت، واتەدەسەڵات و خواناسی بەیەکەوە گرێ ئەداتەوە، نەك دەسەڵات و خودکردن بەناوی خواوە قسەکردن بێت، نەخێر بەڵکو خواناسی لەگەڵ دادپەروەی ئیسلامیدا بەیەکەوە گرێ ئەدات..

پێنجەم: شورا

شورای ئیسلامی ئەو زاراوە سیاسیە ئیسلامیەکە سورەتێکی بەناونراوە، ئەگەر باس لەفەرمانڕوایی ئیسلامی بکرێت توخمێکی گرنگی ناو ئەو سیستەمە ئیسلامییە شورایە، کەوەك نوێژ و ڕۆژ و حەج و جیهاد و هەموو واجباتی تری ئیسلامی پێویستکراوە لەسەر موسڵمانان، لەنێوانی دوو هاورێیەوە دەست پێدەکات، تا خێزان و گەورەتر بۆ کۆڵان و گەڕەك و پاشان گەورەتر بۆ شار و دواتر بۆ شارموانی و دەسەڵات و حیزب و کۆمەڵ و گروپ و ڕەوتەکان، تا دەگاتە بەرزترین پلەی دەسەڵات و سەرۆکی وڵات و یاخود خەلیفەی موسڵمانان، کەدەبێت پابەند بێت بەئەنجامی شوراوە لەقورئانیشدا لەزۆر جێگادا باس لەشورا و گرنگی شورا کراوە، تەنانەت پێغەمبەری خوا پابەندبوە بەئەنجامی شوراوە، ئەگەرچی بەدڵیشی نەبوبێت!

شەشەم: زمان

زمان گرنگی تایبەتی هەیە لەکایەی سیاسەت و دەسەڵاتی ئیسلامیدا، بۆ ئەوەی ئوممەت لەو پەیامە تێبگەن زمانی وەحدەتی بیروباوەڕ و ڕۆشنبیریانە کەزمانی بەندایەتی و تێگەیشتنی ئاینەکەیانە لەپێشینانەوە بۆ نەوەی نوێیان، مانای وانیە ئیسلام زمانەکانیتر بەکەم سەیردەکات. بەڵکو هیچ زمان و کلتورێکی ڕەسەن ناوگەل و هۆزەکانیتر ناتوێنیتەوە، بەڵکو پەرەی پێدەدات و دەوەڵەمەندتری دەکات. بەڵام زمانێکی گشتییە بۆ ناو دەسەڵات و سیستەمەکەی.

حەوتەم: خاك و مەئوا

خاك و مەئوا هۆکاری سەرەکی دامەزراندنی دەسەڵات و هێزە لەئیسلامدا و ئەو کانزا و بەرهەمموو بەروبومانەی ناو ئەو خاکە هۆکاری ئابووری و سازاندی ژیانی ئوممەتە لەسەری و پێویستە بەدادپەروەرانە لەنێوانی خەڵکیدا دابەشبکرێت. ئاوەدان بکرێتەوە بەشار و کشتوکاڵ و هەر سوودێك بێت بۆ مرۆڤەکان، مەئوا سازاندی زەمینەی ئیسلامییە و دابینکردنی ئاسایشە بۆ خەڵکی لەو خاکەدا کەبۆتە مەئوایان..

هەشتەم: شار

شار یەکێکە لەسیماکانی ژیار و وازهێنانی خەڵکی لەدەشتەکی و کۆکردنەوەی وزە و تواناکان لەجێگایەکدا بەهاوکاری و پێکەوە ژیان و بۆ بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگەی مرۆیی و ئیسلام هەمیشە لەگوتاری تایبەتی خۆیدا هەوڵی ئاوەدانکردنەوە و دروستکردنی شاری نوێی داوە، لەمێژوویدا بەهەزارەها شاری نوێی دروستکردوە کە ئێستا بۆتە بەشێك لەشارستانیەتی ئیسلامی.

نۆیەم: دادپەروەری

دادپەروەی سیمای تەواوەتی دەسەڵات و هێز و خیلافەتە لەناو سسیتەمی سیاسی ئیسلامیدا گوتاری ئاینی ئیسلام لەبنەڕەتدا لەسەر دادپەروەری

دامەزراوە و ئەو هۆکارەیە بۆ مانەوەی دەسەڵات و سیستەم، تەنانەت خودی گوتاری سیاسی ئیسلامی، دادپەروەری لەئیسلامدا تەنها لەداوەریدا نیە و لەدادگاکاندا بسەپێنرێت، بەڵکو لەتاکەوە بۆ خۆی و لاشەی مرۆڤ خۆیەوە دەستپێدەکات تا دەگاتە هەموو جومگەکانی دەسەڵات و فەرمانڕەوایی و حکومەتی ئیسلامی.

دەیەم: خۆشگوزەرانی و شارستانیەت

ئێمە کە قسە لەسەر شارستانێتی کۆمەڵگەیەك دەکەین مەبەستمان شێوازی ژیانی کۆمەڵگەیەکە لەشێوازی کۆمەڵگەکانیتر جیای دەکاتەوە، ئەوەشتێکی بەڵگە نەویستی دیارە، کە هەموو کۆمەڵگەیەك شێواز و ڕێی خۆی هەیە بۆ چۆنیەتی پێکەوە ژیان و ئاراستەکردن. هەموو کۆمەڵگەیەك مرۆڤەکان کەسایە تی تایبەتی خۆیان هەیە کەناسنامەو کلتوری سەر بەخۆیان هەیە کە بۆیان بۆتە سیماو سیفاتی جیابوونەوەیان لەکۆمەڵگەی تر. هەر کۆمەڵگەیەك شارستانێتی خۆی هەیە ئیسلام خاوەن گوتاری تایبەتی خۆیەتی، خۆشگوزەرانی کە پێکهاتەی دوو جومگە سەرەکیەکانی ناو حکومەتی ئیسلامیە ئەویش نان و ئەمانە، سیمای شارستانیەتیش بریتیە لەڕەوشت، بیروباوەڕ، پێشکەوتن.

یازدەیەم: بانگەواز و پەروەردە

سیمای دەسەڵاتی ئیسلام بانگەواز و پەروەردەکردنە لەسەر مەنهەجێکی ڕاست و دروست و ئاشکرا و بێ پێچ و پەناو ڕوون، دەسەڵات و خیلافەتی ئیسلامی دەبێت سنورەکان و یاسا گشتیەکان بپارێزێت و دەسەڵاتدارانی موسڵمانان پێویستە لەسەریان سیمای خواناسی و پاراستنی فەرزەکان و فەرمان بەچاکە و ڕێگری لەخراپە ڕەنگبداتەوە لەکارکردنیاندا و لەفەرمانەکانی ڕۆژانەیاندا، واتە: ناکرێت خەڵکی فاسق و بێدین لەجێگا و ئیدارە گشتیەکاندا دابنرێت، دەبێت کاری سەرەکی و سەروەت و سامانی موسڵمانان لەدەستی موسڵمانان خۆیاندا بێت..

دووازدەیەم: زانست و فێرکاری

لەسیمای دەسەڵاتی ئیسلامیدا گرنگی تەواو دەدرێت بەزانستەکان و فێرکاری خەڵکی ناو ئەو سیستەمە و بەهەند ڕاگرتنی زانستە شەرعی و مرۆییەکان، لەبەرئەوەی مانەوە و هێزی هەموو وڵاتێك لەم جیهانەدا بەهۆکاری زانستەکەیەتی و پاشان هەر بەهۆکاری زانستەکەیە کەقسە ڕۆیشتوە لەناو گەلانیتری جیهاندا، گوتاری سیاسی ئیسلامی بەتەواوەتی جەخت لەسەر زانست و فێرکاری ئەدات لەهەموو بوارەکاندا، هانی خەڵکێکی ژێر دەستی خۆشی ئەدا بۆ فێر بوون، ئەرکی دەسەڵاتی ئیسلامیە کەگرنگی بدات و بەهەموو ئەکادیما گرنگەکانی سەردەم و بودجەی زەبەلاحی بۆ دابین بکات[١٠٣].

## گوتاری ڕوناکی(وەحی- سروش)

### هاتنی سروش بۆ سەرزەوەی ڕێزی مرۆڤایەتیە:

هاتنی وەحی بۆ پێغەمبەر- صلی الله علیه وسلم – لەئەشکەوتی(حراء) ئەو دەمەی کەدەستپێدەکات، کاتێکی یەکلا کەرەوەیە لەژیانی مرۆڤایەتیدا.ئێمە وای دەبینین سات و کاتێکی ئەوەندە گرنگ و گەورەیە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا، بەڵکو تا ڕۆژی قیامەت پەند و عیبەرتی لێوەردەگرین.

ساتەوەختی هاتنی وەحی، واتە: مرۆڤ لەتاریکیەکی بێ وێنەدا دەژیا: مرۆڤایەتی بەرەو سەرگەردانی دەڕۆیشت، هیچ ڕەوشت و بەهایەکی کۆمەڵایەتی، تەنانەت لەڕووی یاسا و دەستوری گەلانەوە کەمو کوڕی تەواوی هەبوو مرۆڤایەتی بەرەوە

---

[١٠٣] التاریخ الاسلامي محمود شاکر جلد ٩ ل ٤٥- ١٦٠)

نەهامەتیو سەرلێشێواوی هەنگاوی دەنا. خوای گەورەدەفەرموێت: ( قَدْ جَاءَكُمْ مِنَ اللهِ نُورٌ وَكِتَابٌ مُبِينٌ )١٥ (يَهْدِي بِهِ اللهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلَامِ وَيُخْرِجُهُممِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِهِ وَيَهْدِيهِمْ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ) ١٦المائدة
واتە: بەڕاستی لەلایەن خواوە ڕوناکیەکی ئاشکراتان بۆ ڕەوانەکراوە (کەمحەمەد پێغەمبەرە) هاوڕێ لەگەڵ کتێبێکی ئاشکرادا (کەقورئانە) بێگومان( خوا بەو قورئانە پیرۆزە هیدایەت و ڕێنمونی ئەو کەسانە دەکات کەبەشوێن بە دەستهێنانی رەزامەندی

ئەودا وێڵن، بەرمو ڕێبازەکانی ئاشتی و ئاسوودەیی دەیانبات، بەفەرمانی خۆی لە تاریکستانەکان دەریان دێنێت و ڕزگاریان دەکات و دەیانخاتە ناو ڕوناکیەوە، وە ڕێنمونیان دەکات بۆ سەر ڕێگەو ڕێبازی ڕاست و دروستی )دینداری و خواناسی و چاکە.

زۆر دەبیستین لەسەر ئەم ڕوداوە گەورەیە، کەهاتنی سروشە بۆ سەروەرمان محەمەد - صلى الله عليه وسلم-. بەڵام کەممان حەقی خۆیمان داوەتێ، تا ئێستا قەدری گەورەیی ئەم ڕوداوەمان نەگرتوە، کەسەرەکیترین گوتاری ئیسلامیە.

ئەگەر مرۆڤ لێوردبوونەوە بکات، واتە: خوای پەروەدگارمان نێراوی و دەنێرێت لەمرۆڤ کەپەیامی خۆیمان بۆ روون بکاتەوە، ئەمەش بۆ خۆی منەتێکی زۆر گەورەیە بەسەرمانەوە ڕێزو حوورمەتێکی زۆرە لەمرۆڤ گیراوە.

پەروەردگارمان دەفەرموێت: (لَقَدْ مَنَّ اللهُ عَلَى المُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولاً مِنْ أَنْفُسِهِمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ أَيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الكِتَابَ وَالحِكْمَةَ وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلُ لَفِي ضَلاَلٍ مُبِينٍ)١٦٤ آل عمران

واتە: بێگومان خوا منەتی ناوەتە سەر ئیمانداران بەوەی کەلەناو خۆیاندا بەوەی، کە لەناو خۆیاندا پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانەکردون کە ئایەتەکانی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوە دڵ و دەرونیان پاك و پوخت دەکاتەوە وەفێری قورئان و داناییان دەکات، هەرچەندە پێشتر لەگومڕاییەکی ئاشکرادا ڕۆچوبوون.

پرسیار لێرەدا ئەوەیە: لەکاتێکدا مرۆڤ چەندە خۆشحاڵ دەبێت، کەلەلای پادشایەکی دنیاییە وە یاخود سەرۆك وڵاتێك نامەیەکی بۆ بێت ئامۆژگاری بکات،

واهەست دەکەیت کەئەو پادشا و سەرۆك دەوڵەتە تۆی خۆش دەوێت و ڕێزێکی زۆری لێناوی.
داخۆ چەندە خۆشحاڵ بێت لەلایەن ئەم پادشایەوە کەموڵکێکی کەمی لەبەر دەستدایە و خۆی ناتوانێت بیپارێزێت لەوەی کەتوشی ئازار و نارەحەتی نەبێت، یاخود لەمردن و ژیان هیچی بەدەست نیە؟!
کەواتە خوای گەورە بەتوانا و دەسەڵات و هێز و قودرەتمەندی خۆی پێغەمبەرێکی بۆ ناردوین و پەیامێکیشی پێدا ڕەوانەکردوە، مرۆڤ بۆ خۆی زۆر بوونەوەرێکی بچوك و لاوازە و لەسەر ئەم زەمینە دەژی، کەئەستێرەیەکە لەناو قاترلیۆن ئەستێرەدا لەئاسمانی یەکەمدا هەیە، یاخود لەکۆمەڵەی کاکێشاندا کەبەچاو نابینرێت ئەوەندە بچوك دەبێتەوە لەناو ئەم هەموو گەلە ئەستێرەدا، کەچی خوای گەورە پەیامی خۆی ناردوە بۆ مرۆڤ!!
ئاخۆ قەبارەی ئەم زەمینە چەندە لەچاو هەموو گەردوندا؟ یاخود قەبارەی مرۆڤ چیە لەچاو زەویدا؟ یان قەبارەی مرۆڤ لەچاو گەردوندا چیە؟ یاخود قەبارەی مرۆڤ بەرامبەر بەفریشەتەکان چیە؟
زۆرێك لەخەڵکی قەدری گەورەیی ئەم ڕوداوە ناگرن کەهاتنی سروشە، چونکە قەدری خوای گەورە نازانن.
خوای پەروەدگارمان پێویستی بەئێمە نیە، پێویستی بەهیچ شتێکی تریش نیە لەم گەردونەدا، نەچاکە و نە خراپەی ئێمە هیچ کاریگەریەك لەسەر خوای گەورە دروست ناکات، ئەو لەڕەحم و لوتف و کەرەمی خۆیەتی کەنێردراوێکی بەپەیامێکدا لەمرۆڤ بۆ ئێمە ڕەوانە کردوە کەمژدەمان دەداتێ بەبەهەشت و دەمانترسێنێت بەدۆزەخ، بۆ ئەوەی کردوەی باش بکەین، ئەو پەیامەیشی کەناردویەتی بەبەرێزترین فریشتەدا ناردویەتی کەجوبرەئیلە - سەلامی خوای لێبێت - بۆ بەرێزترین مرۆڤی ناردوە کەمحەممەدە - صلی الله علیه وسلم - بەرێزترین وتەی ناردوە کەقورئانە.
ئەوە گوتاری ڕووناکییە کەئیسلامە

کە واتە لەو ساتە وەختەوە ئەو پەیامە، کە وتەی خوای پەروەدگارمانە دەستوری ژیان دەبێت لەسەر زەویدا تا ئەوکاتەی زەوی لەناودەچێت.
کەواتە ئەم ڕوداوە کەمرۆڤی بەڕێزکردوە و دەفەرمویێت: (وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي البَرِّ وَالبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تفضيلاً) ٧٠ الإسراء

واتە: بەڕاستی ئێمە ڕێزمان لەنەوەی ئادەم گرتوە و بەسەر و شکانی و دەریادا بەجۆرەها هۆکاری گواستنەوە هەڵمان گرتون، لەڕزق و ڕۆزی چاك و جۆراوجۆر بەهرەوەرمان کردون لەخۆراك و پۆشاك و ماڵ و ناوماڵ و ...هتد( بەڕاستی ئێمە ڕێزی زۆری
ئەوانمان داوە بەسەر زۆربەی ئەو بەدیهێنراوانەدا کەدروستمانکردون )لە هەموو ڕویەکەوە).

## سروش جوانترین و گەورەترین ڕێزە کە لەمرۆڤایەتی گیراوە:

لەگەڵ ئەو ڕێزەی کەپەروەردگار گرتویەتی لەمرۆڤایەتی پێغەمبەرێکی ناردوە بەدەستور و مەنهەجێکەوە، تا مرۆڤ بتوانێت ژیانی خۆی لەسەر ڕێکبخات، لەهەموو فەرهەنگ و ڕەهەندەکانی ژیانەوە، بەڵام مرۆڤ ئەم ڕێزە هەست پێناکات و پێشێلی دەکات، ڕو دەکاتە هەندێك خۆشی ژیان و شەهوەتی خۆی تێردەکات، تا ئەو کاتەی لەناو خۆشی و ئەو شەهوەتانەدا وون دەبێت، چونکە قەدری مرۆڤایەتی و ڕێزی خۆی نازانێت؛ تەنانەت زۆرجار ئازاری خەڵکی دەدات، ئەشکەنجە بەکاردنێت، هەست بەوە ناکات مرۆڤێك، کەڕێزی لێگیراوە ئازارو ئەشکەنجەو زوڵم لەمرۆڤێکی ڕێزلێگیراو لای خوا ئەدات.
زۆرجاریتر هەیە ڕێز و قیمەتی مرۆڤ دەچێتە خوار ئاژەڵیشەوە، هیچ ئەرزشێکی نامێنێت.

بیرکردنەوە لەسروش یەکخستنی هزری مرۆڤەکانە بۆ یەکتری و تەنانەت خودی مرۆڤ خۆیشی، تێگیشتنە لەچەمك و واتای برایەتی مرۆڤایەتی لەسەر زەویدا، کەچۆن بەیەکەوە ژیان بەرنەسەر.

سروش، بریتیە لەنامەی خوا بۆ سەر زەوی بۆ ئەوەی ڕایگەیەنێت بەمرۆڤ و ئاگاداری بکاتەوە، کەچی بکات و چی نەکات..
سروش: بریتیە لەدرخشانی و ڕوناك و ڕێنموی و ڕێبەری..

سروش: تەنها تەکلیفات و داواکردن نیە، بەڵکو نیعمەتی خوایی و ڕەحەتی پەروەردگارمانە بۆ مرۆڤ.
خوای کردگارمان ئێمەی دروستکردوە هەر ئەویش دەزانێت چی بەکاردێت بۆ ئێمەی مرۆڤ: پەروەردگارمان پەی بە ڕابردو و ئێستاو داهاتوومان دەبات ،ئەو ئاگادارە بەسەرمانەوە زانیاری بەسەر هەموو شتێکدا هەیە لەم بوونەدا، ئەم وەحییەی بۆ ناردوین تاکو ببێتە ڕێبەرێك و ڕێنمونیمان بکات بۆ کاری چاکە و فەرمان بەچاکە ڕێگری لەخراپە و کاری خراپە.
شوێنکەوتنی وەحی خۆشبەختی دونیا و قیامەتە، سەرپێچی کردنیشی نەگبەتی و نەهامەتی هەردو دونیایە..
ئەگەر لێکۆڵینەوەیەکی ورد بکەین لەسەر وەحی دەبینین: لەبیابانێکی وشك و بێ ئاو پڕ لەسەراب، کەبە درێژایی ڕۆیشتن لەتراویلکە زیاتر هیچ نابینی، تۆش لەو بیابانەدا تینو و ماندوو و شەکەت ڕێگات لێ ونبوە: بۆ توشنە لەپێك ئاو ئامادەی سەروەت و سامانت ببەخشیت، کەسێك دێت لەناکاودا دەتگەیەنێتە پاڵ کانیاو سەوزاییەکی خۆش و فێنك، تێر ئاو دەخۆیت لەونبونی ڕێگا ڕزگارت بوو، ئەوکەسەی ئەو کارەی کردو تۆ یڕزگار کرد وەك نموونەی وەحیە، کەدەستی مرۆڤایەتی دەگرێت لەتەنهایی و خەمۆکی و نارەحەتی ژیان بەرەو خۆشی و شادی و کامەرانی ژیان هەردو دونیا دەیانگوزەرێنێت، کە کۆتایەکەی بەهەشتە.

پەروەدگرمان دەفەرموێت: (فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ مِنِّي هُدًى فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلاَ يَضِلُّ وَلاَ يَشْقَى)١٢٣طه

واتە: هەر کاتێك هیدایەت و ڕێنمویی من بۆ ئێوە هات، ئەوەی شوێنی بەرنامەکەم بکەوێت، نە گومڕا دەبێت نە ناخۆشی و نارەحەتی و ناسۆر دێتە ڕێی.

مرۆڤ دەتوانێت چارەنوسی خۆی هەڵبژێرێت و دەست نیشانی بکات، بێگومان بەوەحی، هەرکەس شوێنکەوتوی وەحی بوو ئەوە سەربەرزە لەهەردوو ژیاندا، بەڵام ئەگەر گوێ بۆ سروش نەگرێت و شوێنکەتوی نەبوو لەهەردوو ژیاندا سەرگەردانە لەدونیا و لەقیامەت.

سەروەرمان پێغەمبەر- صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: (لەجَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيُّ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمًا فَقَالَ: "إِنِّي رَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ كَأَنَّ جِبْرِيلَ عِنْدَ رَأْسِي وَمِيكَائِيلَ عِنْدَ رِجْلَيَّ، يَقُولُ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ: اضْرِبْ لَهُ مَثَلاً. فَقَالَ: اسْمَعْ سَمِعَتْ أُذُنُكَ، وَاعْقِلْ عَقَلَ قَلْبُكَ، إِنَّمَا مَثَلُكَ وَمَثَلُ أُمَّتِكَ كَمَثَلِ مَلِكٍ اتَّخَذَ دَارًا، ثُمَّ بَنَى فِيهَا بَيْتًا، ثُمَّ جَعَلَ فِيهَا مَائِدَةً، ثُمَّ بَعَثَ رَسُولاً يَدْعُو النَّاسَ إِلَى طَعَامِهِ، فَمِنْهُمْ مَنْ أَجَابَ الرَّسُولَ، وَمِنْهُمْ مَنْ تَرَكَهُ، فَاللَّهُ هُوَ الْمَلِكُ، وَالدَّارُ الإِسْلاَمُ، وَالْبَيْتُ الْجَنَّةُ، وَأَنْتَ يَا مُحَمَّدُ رَسُولٌ، فَمَنْ أَجَابَكَ دَخَلَ الإِسْلاَمَ، وَمَنْ دَخَلَ الإِسْلاَمَ دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَمَنْ دَخَلَ الْجَنَّةَ أَكَلَ مَا فِيهَا).

لە خەوندا بینیم جوبریل لای سەرمەوە وەستا و میکائیل لای قاچمەوە، یەکێکیان بەهاوڕێکەی گوت لەو دوو فریشتەیە: نموونەیەکی بۆ بهێنەرەوە، گوتی: گوێکانت ئاوەڵا بکە و جوان هەڵیان بخە بۆ بیستن، دڵ و هۆشت والا بکە، بەڕاستی نموونەی تۆ (ئەی محەممەد) لەگەڵ نموونەی ئوممەتەکەت، هەروەك نموونەی پادشایەك وایە، کەباڵەخانەیەك دروستبکات، پاشان ماڵێکی لێ دابمەزرێنێت، پاشان لەناو ئەو ماڵەدا خوانێکی تێدا بڕازێنێتەوە، پاشان کەسێك بنێرێت هاوار لەخەڵکی بکات بۆ ئەو خوانە، هەر کەس وەڵامی ئەوکەسەی داوە بۆ خوانەکە دێتە سەر سفرە و خوانی خواردنەکە، ئەوەشی وەڵامی نەدایەوە و تێپەڕی و وازی لێهێنا، دەی محەممەد بزانە ئەو پادشایە ئەو خوای کردگارەیە، ئەو

باڵەخانەیە ئیسلامە. ئەو ماڵەش بەهەشتە. تۆش ئەی محەمەد- صلى الله عليه وسلم- ئەو نێردراوەی، هەرکەس وەڵامی دایتەوە ئەو هاتۆتە ناو ئیسلام، ئەوەی بێتە ناو ئیسلام دەچێتە بەهەشت. ئەوەی هاتە بەهەشت لەخواردنی بەهەشت دەخوات هەرچی تێدایە.

وفي رواية البخاري يقول: (فَمَنْ أَطَاعَ مُحَمَّدًا فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ، وَمَنْ عَصَى مُحَمَّدًا فَقَدْ عَصَى اللَّهَ).

لە ڕیوایەتێکیتردا هاتووە. کەبوخاری دەگێڕێتەوە: هەرکەس گوێڕایەڵی محەمەدی کرد ئەوا گوێڕایەڵی خوای کردوە. یاخود هەرکەس سەرپێچی محەمەدی کرد ئەوە سەرپێچی خوای کردوە.

وفي رواية أحمد يقول: (فَمَنِ اتَّبَعَهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَمَنْ لَمْ يَتَّبِعْهُ عُذِّبَ عَذَابًا شَدِيدًا).

هەروەها لەڕیوایەتی ئیمام ئەحمەد هاتووە: هەرکەس شوێنکەوتوی محەمەد بێت دەڕواتە بەهەشت. هەرکەس شوێنی نەکەوت ئازار دەچێژێت و لەقیامەتدا ئازارێکی زۆر بەسوێ و ناڕەحەتی دەدرێت.

وەحی بانگەوازێکە بۆ بەهەشت، ئەو کەسەی شوێن ئەو بانگەوازە نەکەوێت چارەنوسی لەئازارێکی زۆر بەسوێدایە...

سەرم سوڕدەمێنێت لەوەی کەخەڵکی بەمە دەزانن، بەڵام گەورەیی و ڕێزی وەحی وەك خۆی ناگیرێت. دێینەوە سەر ئەو باسەی لەسەرەوە ئاماژەمان بۆکرد هۆکارەکەی ئەوەیە. کەقەدری هێز و دەسەڵاتی خوا نازانن، خواناسی وەك پێویست ناکەن (وَمَا قَدَرُوا اللهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّماوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىَ عَمَّا يُشْرِكُونَ) ٦٧ الزُّمر

واتە: خوانەناسان: قەدری خوایان وەك پێوست نەگرت، ڕێزیان بۆ دانەنا. بە مەرجێك هەر هەموو گۆی زەوی پڕ مشتێکی قودرەتی ئەو زاتەیە لەڕۆژی قیامە تدا. ئاسمانەکانیش بەدەستی قودرەتی ڕاست و دروستی خوا پێچراوەن ئاماژەیە بۆ دەستەڵاتی بێ سنوری ئەو زاتە. پاکی و بێگەردی و بڵندی بۆ ئەو پەروەردگارە مەزنەی شایستەی ئەو زاتە لەکاتێکدا نەفامان هاوەڵی بۆ بڕیار بدەن و قەدری نازانن.

ئەگەر خەڵکی ئەم تواناو هێزەی خوای گەورە وەك سیفاتە پیرۆزەکانی بناسن هەرگیز بەو شێوەمان لێبەسەر نەدەهات، لەهەموو دونیادا ئەوەی ئەرزشی نەبێت موسڵمانە لەئێستادا، هۆکارەکەی ئەوەیە شوێن وەحی نەکەوتوین، بەڵکو شوێن ئارەزو و ویستی خۆمان کەوتوین.

ئەم سروشتەی کەباسمان کرد پەیامی خوای هەموو جیهانەکانە، بۆیە سیرەی بۆن خۆشی پێغەمبەر- صلی الله علیەوسلم- بنەمایەکی سەرەکیە تا لێی تێبگەین، یان جوانتر بڵێین ژیانی پێغەمبەرمان -صلی الله علیە وسلم - هەمووی وەحییە، هەروەك خوای گەورە بۆمان باس دەکات لەقورئان لەژیانی سەروەرمان دەفەرموێت: (وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الهَوَى)٣ (إنْ هُوَ إلاَّ وَحْيٌ يُوحَى) ٤النَّجم واتە: قسەو گوفتاریشی لەئارەزوبازیی و هەوا و هەوەسەوەنیە، ئەمەی کە ڕایدەگەیەنێت بەدەر نیە لەنیگا و وەحی خوایی.

تەنانەت هەموو کارە سونەتاکانیش هەر بەوەحی بووە لەلایەن خوای پەروەردگارمانەوە، ڕۆژوی سوننەت لەدوشەممە و پێنج شەممماندا و ڕۆژانی تاکەکان...هتد هەموو سوننەتەکان و فەرزەکان لەژیانی پێغەمبەرماندا - صلی الله علیە وسلم- وەحی بووە، هەموو هەڵسوکەوتێکی هەر بەسروش بووە ئەگەر تەنانەت هەڵەی بکردایە خێرا خوای گەورە جوبریلی دەنارد بۆی ڕاست دەکردەوە بۆ ئەوەی مرۆڤایەتی چاوی لێبکەن، مەبەست لەم کارانە و وەحییە بۆ ئەوە بووە کەخەڵکی لاسایی بکاتەوە چاوی لێبکەن (لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كَانَ يَرْجُو اللهَ وَاليَوْمَ الآخِرَ وَذَكَرَ اللهَ كَثِيرا) ٢١ الأحزاب

واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی لەپێغەمبەری خوادا چاکترین نموونەی تەواو ڕێك و پێك هەیەتا چاوی لێبکەن و شوێنی بکەون، بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی ڕەزامەندی خوایان مەبەستە، سەرفرازی قیامەت ئاواتیانە، هەمیشە و بەردەوام یادی خوا بەزۆری ئەنجام دەدەن و زمانیان پاراوە بەیادی ئەو.

باشترین خێر بۆ مرۆڤ فێربوونی سیرەی پێغەمبەرە -صلی الله علیە وسلم-، چونکە خێری دونیا و قیامەتی تێدایە، هەموو زانستەکانیش لەسیرەی پێغەمبەردا

- صلى الله عليەوسلم- دەبینێتەوە، تەنانەت ئەگەر سیرە نەزانی لەقورئانیش تێناگەیت.
دواکارین لەخوای گەورە لەسیرەی پێغەمبەری ئازیز - صلى الله علیه وسلم- تێمانبگەیەنێت[104].

## جێگرەوەی پێغەمبەری خوا لەدەسەلآت و فەرمانڕەوایدا

### خەلیفەی پێغەمبەری خوا:

لەدوای ئەوەی کەپێغەمبەری خوا -صلى الله علیه وسلم- توانی بەئاراستەی وەحی، هەموو دامەزراوە سەرەکیەکان لەدەولەتەکەیدا دابمەزرێنێت، وەك دامەزراوەی سوپا و ئابووری و بازاڕی ئازاد و پاراستنی سنوری دەولەتەکەی و دادوەری و یاسا و دەستور شورا و خاوەنی دوو وەزیری سەرەکی بوو بێجگە ڕاوێژکارەکانی لەبواری سەربازی و ئابووری و کۆمەلایەتی... هتد
بۆ نموونە لەبواری سەربازیدا.. هەمیشە ڕاوێژی بەحوبابی کوڕی مونزیر و محەمەدی کوڕی مەسلمە ئەو سەربازیانەی دەوری خۆی دەکرد کەخۆی هەمویانی پەروەردکرد بوو بەڕەوشتی ئیسلامەتی لەڕووی ئابورریەوە لەعوسمانی کوری عەفان و عەبدوڕەحمانی کوری عەوف...هتد
وەزیرەکانی ئەبوبەکری صدیق و عومەری کوڕی خەتتاب بوو، کە لەهەموو کارەکانیدا کەوەحی ئاراستەی نەکردایە ڕاوێژی بەهەردووکیان دەکرد..
لە ژیانیدا چەند جار ئاماژەی کردوە بەخۆشەویستی ئەبوبەکر و بەوەی کەهاوەلی تایبەتی خۆیەتی، تەنانەت نازناوی صاحب الرسول ی وەرگرتبو.. خوای گەورە لەچەند جێگادا باسیکردوە لەقورئاندا و نازناوی صاحب لەقورئانەوە بۆ ئەبوبەکری صدیق وەرگیراوە ـ ڕەزای خوای پەروەردگاری لێبێت ـ

[104] خطاب الوحي د.عثمان بركات ل ٢٥٣

تەنانەت، هارونە ڕەشید لەقازی ئیبن و عەیاش دەپرسێت، باسێکی بەخەلیفە بوونی ئەبوبەکرم بۆ بکە؟! ڕەزامەندی خوا لە ئەبوبەکری صدیق بێت.
قازی ئیبن و عەیاش بەهەندێك وشەی زۆر سەرسوڕهێنەر وەڵامی هارونە ڕەشید ئەداتەوە رەحمەتی- خوا لەهەردووکیان بێت.-
دەفەرموێت، خوا و پێغەمبەر و خەڵکیش بێدەنگ بوون لەئاست خیلافەتەکەی ئەبوبەکری صدیقدا!!..
هارونە ڕەشید فەرموی بەقازی ئیبن و عەیاش، بەڕاستی ئەوەندەیتر کارەکەت لەسەر قورس کردم هیچ تێناگەم لەمەبەستەکەت..؟
قازی ئیبن و عە یاش فەرمووی، کاتێك پێغەمبەر مابوو وەحی بەردەوامبوو ئەبووبەکر ئیمامەتی کردو خوای گەورە هیچ ئایەتێك وەحی لەسەر دانەبەزاند. پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم- بێدەنگ بوو لەئاستی ئیمامەتەکەی، کەدەبوو خەلیفەش هەموو ئوممەت لەسەری کۆکبوون کەئیمامەت بکات بۆ خەڵکی.
پێغەمبەری خوا وەفاتیکرد، کەقورسترین کار بوو بۆ هاوەڵەکان، چونکە سەردەمی وەحی ئاسانترین سەردەم بوو بۆ ئەو کۆمەڵگە بەڕێزە، هەر کارێکیان دەکرد ئەگەر هەڵەبوایە دەستبەجێ وەحی دەهاتە خوارەوە، هەڵەکانی بۆ ڕاستدەکردنەوە، بەڵام وەفاتی خۆشەویستمان پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم- کۆتایی بەوەحی دێت و قۆناغێکی نوێتر لەگوتاری ئسیلامی لەڕووی سیاسییەوە دێتە پێشەوە، کەقورسترین گوتار و ناهەموارترین کاتە بۆ هاوەڵان و تەنانەت بۆ سیستەمی ئیسلامیش، چونکە ئیتر دەبێت خۆیان ئیجتیهاد بکەن و وەحی نەماوە و خۆیان بڕیاری چارەنوس سازبدەن، داخۆ چەند قورسە بۆ دوای وەحی ئەویش لەدوای وەفاتی پێغەمبەرەوە -صلی الله علیه وسلم- سەرچاوە دەگرێت، هۆکاری ئەوەی کەپێغەمبەری خوا دەستنیشانی کەسێکی نەکرد ڕاستەوخۆ لەدوای خۆی مانای ئەوە لەکەم و کورتی نیە، بەڵکو ڕاهێنانی موسڵمانانە لەسەر شوڕا و بۆ ئەوەی شوڕا ببێتە ئەو ئامرازە گرنگ و سەرەکییە لەدەسەڵاتی ئیسلامی کەفەرمانڕەوای حوکم و حکومەتی لەسەر دادەمەزرێت..

پێغەمبەری خوا-صلی الله علیه وسلم- وەفاتی کرد، ئەنسار کەهاووڵاتیانی شاری مەدینە بوون پشتیوانی موسڵمانە کۆچکردووەکان بوون، پشتیوانان لەدوای وەفاتی پێغەمبەر- صلی الله علیه وسلم- ترسیان لێنیشت کەهەموو عەرەب دژیان دەوستێتەوە و کۆچکردووەکانی شاری مەدینە، دەگەڕێنەوە بۆ ناو مەنزڵگای خۆیان واتە: شاری مەککە، بەجێیان دێڵن و ئیتر وەك خۆیان بیریان لێدەکردەوە کەهەموو عەرەب دەیانخەنە ناو کەوانیەکەوە دژیان دەوستنەوە، بۆ ئەم حاڵو ڕەوشە ترسیان لێنیشت و دەست بەجێ هەردوو گەل و هۆزی ئەوس و خەزرەج کۆبوونەوە لەباخێك بەناوی بەنی سەعد، بۆ دەستنیشانکردنی خەلیفەی دوای پێغەمبەری خوا -صلی الله علیه وسلم.-

## سەقیفەی بەنی سەعد:

لە دوانزەی ڕەبیعولئەوەلی ساڵی ١١ی کۆچی ئەنسار (هەردوو هۆزی ئەوس و خەزرەج) کۆبوونەوە بۆ ئەوەی خەلیفەیەك بۆ موسڵمانان دەستنیشان بکەن، لەجێگایەك کەناسراوە بەسەقیفەی بەنی سەعد، کەماڵێکە یاخود بەردەم باخێکە کە کۆبوونەوە گرنگەکان و بڕیاری سەرەکیان لەو جێگایەدا دەدا هەردوو هۆزەکە.

ئەنسار بۆچونی وابوو، کەدەبێت خەلیفە لەوان بێت چونکە ئەوان زۆرینەن، دەیانزانی ئیسلام دین و دەوڵەتە، بۆیە لەدوای کۆچی دوایی پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم- پێش ئەوەی بەخاکی بسپێرن کۆبوونەوە تا خەلیفەیەك بۆ موسڵمانان دەستنیشان بکەن.

لێرەدا باسەکە ئەوە ناگەیەنێت کەپشتیوانان بەدوای دەسەڵات و سوڵتەدا گەڕابێتن، وەك هەندێك لەموستەشریق و بێدینەکان ئەو ڕەخنەیان ئاراستە دەکەن، بەڵکو ئەوان لەوپەڕی ئیمان و خۆشەویستیان بوو بۆ ئیسلام، چونکە دەیانزانی، کە ئەگەر بێت و سەرکردەیەك یاخود جێگرەوەیەك دانەنێن بۆ پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - هەموو عەرەب ڕویان تێدەکات، تا لەگەڵیان

بجەنگن. پشتیوانانیش هۆکار بوون بۆ پشتیوانی پێغەمبەری نازدار - صلی الله علیه وسلم- خوای گەورە لەوەسفی ئەنساردا دەفەرموێت: (وَالَّذِينَ تَبَوَّؤُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ)٩ الحشر

واتە: ئەوانەی کەپێشتر ماڵ و شوێنی خۆیان ئامادەکرد بۆ پێشوازیی لەکۆچکەران، دڵ و دەرونی خۆیان ڕازاندەوە بەئیمان، ئەوانەیان خۆش دەوێت، کەکۆچیان کردوە بۆ لایان، لەدڵ و دەرونیاندا جێی هیچ جۆرە حەسوودیی و بەخیلییەك نابێتەوە لەسەر ئەوەی، کەبەشی کۆچکەران دراوەو بەشی ئەوان نەدراوە، حەز بە بەخشینی

دەستکەوتەکان بەوان دەکەین تا خۆیان هەرچەندە هەژار و نەداریشن، جا ئەوەی خۆی لەنەفسی ڕەزیلی بپارێزێت و زاڵ بێت بەسەریدا ئەوانە سەرفەرازن.

پێغەمبەری خوا بەرامبەر بەئەنسار سێ جار فەرموی: (اللَّهُمَّ أَنْتُمْ مِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ)

ئێوە خۆشەویسترین خەڵکن لەدڵی مندا، کە بوخاری و موسلیم لەئەنەسەوە ڕیوایەتیان کردووە.

هەروەها لەفەرموودەیەکیتردا دەفەرموێت: (مَوْعِدُكُمُ الْحَوْضُ)

ئێوەی ئەنسار لەسەر حەوزەکەم چاوەڕوانتان دەبم بەیەکەوە کۆببینەوە. بوخاری لەئەنەسەوە ڕیوایەتیکردوە.

گەورەیی و چاکەی ئەنسار زۆر باسکراوە لەئیسلامدا، بەشێکی تایبەتی بۆ دانراوە لەفەرموودە و ڕاڤەی قورئان دا، تەنانەت پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: خۆشەویستی ئەنسار لەئیمانەوە یە و ڕق لێبوونیشیان لەدووڕویی و نیفاقەوەیە، هەرگیز ئەنسار داوای نەکردوە، بەڵکو هەمیشە بەخشیوەیەتی لەئیسلامیشدا بەبەخشندەکان ناسراوبوون.

لە حونەینیشدا ئەو هەموو سەروەت وسامان و غەنیمەتە دەستی موسڵمانان کەوت پشتیوانان یەك بەشیشیان لێ نەبرد.

پوختەی وتە: پشتیوانان، کەکۆبوونەوە لەسەقیفەی بەنی سەعد بۆ ئەوەبوو، کەپشێوی و پەرتەوازەیی نەکەوێتە ناو موسڵمانان، بۆ ئەوەی دەستنیشانی خەلیفەیەك بکەن لەدوای وەفاتی پێغەمبەری نازدار - صلی الله علیه وسلم-

ئەنسار لەخۆشیان دەترسان، کەکۆچکردوە قورەیشیەکان بەجێیان بهێڵن و بگەڕێنەوە بۆ مەککە، بۆیە خێرا خەلیفەیەکیان لەخۆیان هەڵبژارد، ئەم خەلیفەیە شاری مەدینەی مونەوەرەی پێغەمبەری خوا - صلی علیه وسلم- بو.

یەکەم: لەڕووی سیاسی و عورفی ئەو سەردەمەوە مەدینە دەوڵەتێکی سەربەخۆ بوو، ئەوس و خەزرەجی تیا دەژیا.

هەتا سیستەمەکە پێغەمبەرایەتی بوو، ڕازیبوون بەحوکمی پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم- هەمیشە پێغەمبەری خوا- صلی الله علیه وسلم- کار و بارەکانیانی دەگەڕاندەوە بۆ خۆیان تا خۆیان بڕیاری لەسەر بدەن، بیریان لەوە کردەوە کەسەرکردەیەکی نوێ بۆ ئەو شارە دابنێن، بەو پێیەی کەئەوان خەڵکی ئەو شارەن. بۆیە هیچ کام لەموهاجیرەکانیان بانگ نەکرد، چونکە ئەوان هەمویان پەناهەندەی سیاسی بوون.

دووەم: ئەو جێگایانەی کەموسڵمانی لێ دەژی و ئێستا شاری گەورەن، پایتەختی دەوڵەتی پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم- مەدینە بوو، مەککە و طائیفیش دووشاری سەرەکین، بەڵام لەڕووی ئیداری و ئابووری و سەربازییەوە مەدینە پایتەختە، یاخود سەرەکیترە.

سێیەم: پشتیوانان بیریان لەوە کردەوە، کەمەدینە جێگایەکی هەستیارە و دەبێت خەلیفەیەکی بۆ دابنێن، بەهۆکاری ئەوەی موهاجیرەکان لەناو خاکی مەدینەدا ناتوانن دەوڵەت دابمەزرێنن، چونکە لەڕووی عورفەوە خەڵکی جێگا و مەنزڵگاکە نین، مەککەش پێغەمبەریان - صلی الله علیه وسلم- دەرکردبوو، طائیفیش بەردبارانیان کردبوو، بۆیە هەستیان بەوە دەکرد، کەئەوان لەپێشترن بۆ

خەلیفەی پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم- وە ئەمانیش خۆیان لەهەمویان لەپێشتر دادەنا، چونکە لەپێشتر ئیسلامیان وەرگرتووە.
پارە و سەروەت و سامان و گیانی خۆیان بەختکرد لەپێناوی ئیسلامدا، تەنانەت لەیەکەم غەزوەدا کەغەزوەی بەدر بوو ژمارەیان زۆرتربوو لەکۆچەرییەکان.

چوارەم: خاڵێکی زۆر گرنگە ئەنسار هەستی دڵنایيان هەبوو کەکۆچبەرەکان دەگەڕێنەوە شاری مەککە لەدوای کۆچی دوایی پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم-، چونکە جێگا و مەنزڵگای خۆیانە و خاك و ئاو و ماڵیان لەوێیە، ڕاستە پێشتر لەلایەن موشریکەکانەوە داگیرکرابوو، بەڵام ئێستا شاری مەککە موسڵمانە، مافی خۆشیانە کەکۆچبەران بگەڕینەوە جێگاو ڕێگای خۆیان، لەکاتێکدا کەیەك نوێژ لەشاری مەککە یەکسانە بەسەد هەزار نوێژ.
ئەم دید و بۆچونە کە لەسەردەمی غەزوەی حونەینەوە بۆیان دروست بوبوو، ئەمەش هۆکارێکە، کەپشتیوانان بیریان لەوە دەکردەوە کەخەلیفەیەك لەخۆیان دەستنیشان بکەن.

پێنجەم: ئەنسار هەستی ئەوەی بۆ دروست بوبوو کەعەرەب لەدوای پێغمبەر - صلی الله علیه وسلم- ڕق و کینەیان بەرامبەر بەئەنسار هەیە، چونکە لەدیدی عەرەبەوە ئەوان بوون، کەپێغەمبەریان - صلی الله علیه وسلم- سەرخست.
لێرەو لەوێ و لەنیوەدوورگەی عەرەبیەوە جەنگیان دەکرد و ئیسلامیان گەیاندە هەموو ناوچەکە.
بەم هۆکارە بوو دەترسان لەوەی کەهەموو عەرەب کۆببنەوە و وەك خەندەق لەناویان بەرن، بۆیە لەناو خۆیاندا خەلیفەیان دەستنیشانکرد، کەهاوەڵێکی پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم- بوو، بەناوی سەعدی کوڕی عەبادە، کەئەوس و خەزرەج پلانیان وا دانابوو کەبیکەنە خەلیفەو بەیعەتی بدەنێ بەبێ ئەوەی یەك موهاجیری لێبێت.

**خەلیفە دەبێت لەقورەیش بێت:**

لەکۆتایی کۆبوونەوەکەیاندا بوون کەدەستنیشانی خەلیفەی موسڵمانان بکرێت لەشاری مەدینەوە کاندید کراوەکەش هاوەڵی پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم- بوو سەعدی کوڕی عەبادە. بەبێ ئەوەی کۆچبەران لەوێ بن.!

**ئەی کۆچکردوەکان لەکوێن؟**

سەرقاڵبوون بەشۆردن و کفن کردنی پێغەمبەری خواوە - صلی الله علیه وسلم-، نەیان دەزانی لەکوێ بینێژن. ئایا لەبەقیع بینێژن یاخود لەئوحود یاخود بیبەنەوە بۆ مەککە. تا ئەبوبەکری صدیق هاتو و پێی ڕاگەیاندن کەپێغەمبەری خوا- صلی الله علیه وسلم- فەرمویەتی: کەوا پێغەمبەر- صلی الله علیه وسلم- لەهەر جێگایایەکدا وەفاتی کرد لەوێدا بینێژن.

لەم کاتەشدا ژمارەیەکی زۆری پشتیوانان کۆبوونەتەوە کەیەکێك لەکۆچبەران بەمەی زانی و هەواڵەکەی دایە عومەری کوڕی خەتاب. کەسەکە هاواریکرد لەعومەر کەبێتە دەرەوە. کەلەسەر جەنازەی موبارەکی وەستابوو لەماڵی پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم- لەگەڵ ئەبوبەکر و چەند هاوەڵێکیتریدا.

عومەر دەگێڕێتەوە. کەوا زۆر توڕەبوو لەو کارەی کەئەو کەسە کردی کەبانگیکردو گوتی وەرە دەرەوە. بەڵام زانی کارەکە زۆر گرنگە هاتە دەرەوە و بۆی باسکرد ئەو کارە چەندە ترسناکە. بۆیە عومەر گەڕایەوە ماڵی پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم- و باسی کۆبوونەوەکەی بەنی سەقیفی کرد بۆ ئەبوبەکر.

دەستبەجێ ئەبوبەکردی صدیق لەگەڵ عومەری کوڕی خەتابدا ڕەزامەندی خوایان لێبێت ڕۆشتن بەرەو سەقیفە لەرێگادا دوو هاوەڵیتری پێغەمبەریان - صلی الله علیه وسلم- پێگەیشت کەلەپشتیوانان بوون، ویستیان ڕێگەیان پێ بگرن تا نەچن بۆ سەقیفەی بەنی سەعد، تافیتنە دروست نەبێت. دوو هاوەڵەکەش ناوەکانیان (مەعنی کوڕی عودەی، عوەینی کوڕی سەعدە) بوون.

هەرچی ویستیان ئەبوبەکر و عومەر بەقسە بگرن و بیانوەستێن تا کۆبوونەوەکە کۆتایی پێ دێت، بەڵام ئەوان سوور بوون لەسەر ئەوەی کەدەبێت بەزوترین کات بڕۆن و پەلەیانە. لەم کەین و بەین و قسەکردنەدا بوون لەگەڵ دوو هاوەڵەکەدا، گەیشتن بەئەبوو عوبەیدەی جەڕاح، ئەویشیان تێگەیاند و بەپەلە کەوتنە ڕێ بۆ سەقیفە.

کاتێك گەیشتنە ئەو جێگایە، تاڕادەیەك بێدەنگی مەجلیسەکەی داگرتبوو، لەبوخاریدا هاتووە کەکەسێك لەئەنسار هەڵسا بۆ ووتاردان لەنێوان ئامادەبواندا، کەئیبن حەجەر دەڵێت: قیس کوڕی سابت ڕوی کردەوە ئەبووبەکر و عومەر و ئەبوعوبەیدە پێ وتن کەئێمە زۆرینەیین و پارێزەری ئیسلام و لەبەرەی پێشەوە و کەتیبەی سەرەکی بوین و ئێوە خەڵکانێکی کەمن لەشاری مەدینە.. دەقی وتەکەی بەم شێوەیە بو: (أما بعد، فنحن أنصار الله، وكتيبة الإسلام، وأنتم معشر المهاجرين رهط. وفي رواية أخرى: رهط منا)

لێرەدا کێشەیەك ڕوئەدات ئەویش من و تۆیی دەکەوێتە نێوان هەردوو تەرەف، لەئەنسار و موهاجرین، تاڕادەیەك گوتاری سیاسی ئەنسار لەسەر زۆرینە و پارێزەری و ماندوبوونی زۆر دامەزراوە، کێشەکە بەرەو گەورەبوون دەڕوات و عومەری کوڕی خەتتاب هەڵسا ویستی قسە بکات، بەڵام ئەبوبەکر داینایەوە خۆی دەستیکرد بەقسە و باسەکان لەناو سەقیفەدا بەئامادەبوانی ناو ئەو کۆبوونەوەی گوت..

گوتارەکەی ئەبوبەکر سێ تەوەرە بوو:

یەکەم: باسی چاکەی ئەنساری کرد لەزەمانی پێغەمبەری خواوە - صلى الله عليه وسلم-.

دووەم: باسی چاکە و پیاوەتی و واقیعی ئەنساری کرد، کەچییان کردوە بۆ ئیسلام لەزمانی خۆیەوە.

سێیەم: ئەوەی ئاشکرا کرد کەئەبێت خەلافەت لەنەسەبی قوڕەیش بێت.

ئەبوبەکر ویستی تێیان گەیەنێت، کەنزیکترین نەسەب لەدڵی عەرەبەوە قورەیشە، چونکە بەسروشتی خۆیان عەرەب گوێ بۆ هەموو کەس ناگرن مەگەر کەسێك نەسەبێکی ناسراو و لەگەل و هۆزێکی ناسراو نەبێت، بۆیە ئەبوبەکر ئەوەی رۆشن کردەوە کەعەرەب گوێ بۆ ئەنسار ناگرن بەڵکو گوێ بۆ قورەیش دەگرن. ئەمەش پەیوەندی نییە بەنەتەوەگەرێتی وهۆزگەرێتیەوە، بەڵکو واقیع و رەوشی سیاسی ئەو سەردەمە وای دەخواست

ئەبوبەکر باسی خۆی نەکرد کەدەبێت خۆی بکرێتە خەلیفە، بەڵکو رایەکی نوێی هێنایە ناو کۆبوونەوەکە ئەویش ئەوەبوو، کەخەلیفە دەبێت لەقورەیش بێت، لەنێوانی ئەبوو عوبەیدە و عومەردا دانیشتبوو دەستی هەردووکیانی گرت و گوتی من ئەم دوانە کاندید دەکەم کەیەکێکیان ببنە خەلیفە.

لێرەدا دوو رەئی جیاواز لەنێوان ئەنسار و موهاجریندا دروستبوو، دوو کاندید هەیە بۆ هەڵبژاردن، سەعد لەئەنسار و لەموهاجرینیش عومەر و ئەبوو عوبەیدە.

عومەری کوڕی خەتاب دەگێڕێتەو دەڵێت: هەموو قسەکانی ئەبووبەکرم پێ خۆش و جوان بوو تەنها ئەوە نەبێت کەدەستی منی بەرزکردەوە بۆ کاندیدی، ئەبووبەکریش قسەکانی لەراستگۆیی بوو نەك لەسیاسەت، بەڵکو دەیویست تێیان بگەیەنێت کەوا عەرەب گوێ بۆ قورەیش دەگرێت نەوەکو- بۆ ئەهلی مەدینە، بۆیە راستەوخۆ یەکێك لەگەورە پیاوانی ئەنسار بەناوی (حوبابی کوڕی مونزیر) تێگەیشت لەبارودۆخەکە و تەنەزولیکرد و گوتی باشە با ئەمیرێك لەئێوە بێت و ئەمیرێکیش لەئێمە.

عومەری کوڕی خەتاب دەستبەجێ هەڵسایەوە بەرەقی گوتی شتی وا نابێت، بەڵکو دەبێت خەلیفە لەقورەیش بێت، حوبابی کوڕی مونزیریش پێی ناخۆش بوو ئامادەی جەنگی دەربڕی لەگەڵ کۆچبەراندا.

حوباب بەئاشکرا ئەوەی درکاند کەئەوان زۆرێکیان لەعەرەب و قورەیش کوشتووە بۆیە دەترسن کەتۆڵەیان لێ بسێننەوە، بۆ جاری دووەم ئەبوبەکر دەستی کردەوە بەووتار دان و گوتاریکی سیاسی و ئیمانیانەی پێشکەش کردن.

لەباسەکەیدا ئەوەی بیری ئەنسار خستەوە، کەئەوان یەکەم کەس بوون کەپشتگیری پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم- یان کردووە و ماڵ و سەروەت و سامانی خۆیان خستۆتە بەردەستی و هەموو هاوکاریەکیان کردوە، بۆیە نەبنە یەکەم کەسیش کەبەهۆکاری ئەوانەوە دووبەرەکی بکەوێتە ناو موسڵمانانەوە.

دیارە وتارەکەی ئەبووبەکر دور و درێژ بوو، دیسانەوە ئەنسار تەنەزولێکی تریان کرد، ئەمجارە گوتیان: با خەلیفە لەئێوە بێت و جێگرەکەی لەئێمە.

عومەری کوڕی خەتاب قبوڵی نەکرد ئەم جارەش، گرژی ئاڵۆزی کەوتە نێوانی عومەر و حوبابی کوڕی مونزیر. بۆیە ئەبا عوبەیدەی جەراح ئاقاری دانیشتنەکەی بەلای ئیماندا بردەوە ئەم ئایەتەی بیرخستنەوە: (وَالَّذِينَ آمَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَاهَدُواْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ آوَواْ وَّنَصَرُواْ أُولَئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ) ٧٤ الأنفال

واتە: ئەوانەش باوەڕیان هێناوەو کۆچیان کردوەو تێکۆشاون لەپێناوی خوادا، ئەوانەش جێگەی کۆچبەرانیان کردوەو پێشوازیان کردن و یارمەتیان دان، هەر ئا ئەوانە بڕواداری ڕاستەقینەن، لەبەهەشتی بەریندا بۆیان ئامادەیە لێخۆشبوون و ڕزق و ڕۆزی بەپێز و پڕ بەرەکەت و جوان و ڕازاوە.

پاشان بیری ئەوەی خستنەوە کەبەیعەتیان داوە بەپێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم- لەکاتی قورسی و ئاسانی دا وە لەکاتی تەمەڵی و چالاکی دا لەپێناوی ئیسلام دا ببەخشن و خۆیان توشی ڕۆچون و دووبەرەکی نەکەن لەگەڵ ئەهلی ئیسلام دا، بۆیە ئەو یادگاریە جوانەی بیر خستنەوە کەلە پێغەمبەری خوایان پرسی ئەگەر ئێمە ئەو کارە بکەین چیمان دەست دەکەوێت، ئەویش فەرموی: بەهەشت.

بۆیە هەموویان دەستیانکرد بەگریان کەسێك بەناوی ئوسەیدی کوری حوزەیر، کەگەورە پیاوی ئەوس بوو، پیاوێکی دوربین و ئاقڵ و لەسەرخۆ بوو، لەناو کۆمەڵەکەدا هەڵسایەوە و گوتی: با هەمومان بەیعەت بدەین بەموهاجیرەکان، مەبەستی بوو کەخەلیفە لەموهاجرین بێت، چونکە دەیزانی کەئەگەر خەلیفە لەئەنسار بێت کێشەو دوبەرەکی دەکەوێتەوە نێوانی ئەوس و خەزرەج.

کەسێکی کە هەستا بەناوی زەیدی کوڕی ثابتی ئەنساری گوتی: پێغەمبەری خوا لەموهاجرین بووە، ئێمەش لەئەنسارین، بۆیە ئێمە پشتیوانتان دەبین هەروەك چۆن پشتیوانی پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم- بوین.
ئەوەی جێگای سەرنج و تێڕامانبوو کاندیدی ئەنسارەکان سەعدی کوڕی عەبادە هیچ قسەیەکی نەکردوە، چونکە هەموو ئەنسار ڕازیبوون، کەخەلیفە لەقورەیش بێت. ئەبوبەکر چاوەڕێی دەکرد کەقسە بکات، بەڵام بێدەنگ بو.
ئەبوبەکر ڕووی تێکرد و بەسادەیی پێی گوت: سەعد دەزانی، کەپێغەمبەری خوا فەرمویەتی، کەدەبێت سەرپەرشتیاری موسڵمانان لەقورەیش بێت، ئەو کەسەی کەشوێنیان بکەوێت لەچاکەکارانە، ئەو کەسەشی شوێن خەلیفەی قورەیش نەکەوێت ئەوە لەفاجر و خراپەکارانە.
لێرەدا سەعد قسەیەکی زۆر عەجیب دەکات کەهەموو مەجلیسەکە چاوەڕێی ئەوەن کەقسەی خۆی بکات، ڕودەکاتە ئەبوبەکر و پێی دەڵێت: ڕاست دەکەیت ئێوە ئەمیر و ئێمەش وەزیر[١٠٥].
لەدوای ئەوەی ئەبوبەکر لەلایەنی عومەرەوە کاندیدکراوە بەکۆڕای دەنگی سەقیفی بەنی سەعد دەنگیاندایە ئەبوبەکر و ئەویانکردە خەلیفە و پاشان لەمزگەوتی پێغەمبەری خوا بەیعەتی پێدرا[١٠٦].
لێرە ئاماژە بەوە دەکەین،کە عەلی کوری ئەبوتالیب گوایە تورەبوە لەهەڵبژاردنی خەلیفە، لەڕاستیدا ئەمە قسەیەکی ناڕاستە و لەڕووی سەندەوە لاوازە، بەڵکو تورەبوە لەوەی دەبوو ئاگادار بکرابایەتەوە لەو کۆڕ و باسەی ناو سەقیفەی بەنی سەعد، بۆپشتگیری قسەکانی بەئەبوبکرو عومەرو ئەبوو عوبیدەی جەراح، عەلی کوڕی ئەبوو تالیب دووجار بەیعەتیداوە بەئەبووبکر بۆ بوون بەخەلیفە.

---

[١٠٥] قال ابوبكر: لقد علمت يا سعد أن رسول الله قال وأنت قاعد: «قُرَيْشٌ وُلاةُ هَذَا الأَمْرِ، فَبَرُّ النَّاسِ تَبَعٌ لِبَرِّهِمْ، وَفَاجِرُ النَّاسِ تَبَعٌ لِفَاجِرِهِمْ»، فقال سعد كلمة عجيبة في بساطة غريبة، قال: صدقت، أنتم الأمراء، ونحن الوزراء.
[١٠٦] صاحب الرسول ابوبكر الصديق. د.راغب السرجاني ل١٧٤

**ئایا هەر دەبێت خەلیفە لەقورەیش بێت؟**

لەڕاستیدا ئەم باسە لەسەربنەمای فەرموودەی پێغەمبەر خوا - صلی الله علیەوسلم- دامەزراوە چەندین فەرموودە لەسەر ئەوە هەیە کەقورەیش دەبێ خەلیفە بێت و کاروباری موسڵمانان بەدەستەوە بگرێت. مەزهەبی هەموو زانایانی کۆن و نوێ بووە و کۆڕای زانایانی لەسەر دامەزراوە.

لەدوای ئەوەی نەسەبی قوڕەیش وردە وردە بەرمو ئاوابوون چون و تێکەڵبوون لەگەڵ گەل و هۆزەکانیتردا. بەئاستەم قوڕەیشی نەسەب بدۆزرێتەوە. زانایان لەسەربنەمای ئەو فەرموودەیە. کەدەفەرموێت: گوێڕایەڵی ئەمیرەکەتان بن ئەگەر بەندەیەکی حەبەشی بێت. دەقی فەرموودەکە (قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: اسْمَعُوا وَأَطِيعُوا وَإِنْ اسْتُعْمِلَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ حَبَشِيٌّ كَأَنَّ رَأْسَهُ زَبِيبَةٌ). رواه البخاري (٧١٤٢)» ئەمەش بووە هۆکاری ئەوەی مەرج نیە تەنها لەقوریش بێت. ئەگەر قوریشی نەسەب دەست نەکەوت.

زانایان ئیستدلالیان کردوە بەچەندین فەرموودەیتر. کەقوریشیش نەبێت کارەکە ناوەستێت و لەدوایدا لەئەمازیغی و عوسمانلی و خەواریزمی و کورد و فارس و تورك تەنانەت عەبدە مەملوکیەکانیش دەسەلات و ئیسلامیان گرتە دەست و هەندێکیاشیان خیلافەتی ئیسلامیان گرتە دەست. بەڵام مەرجی پابەندبوون. دەبێت پابەندبن بەقورئان و سوننەتەوە. ئەوە مەرجی ئەمیر و خەلیفەیە تەنانەت ئەگەر قورەیشیش بێت[107].

---

[107] وذكر أيضًا الإمام ابن حجر العسقلاني في فتح الباري أن القرشية شرط في خليفة المسلمين.وذكر القرطبي رحمه الله أنه لا تنعقد الإمامة الكبرى إلا لقريش مهما وجد منهم أحد، لكن مع كل ما سبق فإن هذه الأحاديث التي جعلت الإمامة في قريش لا تجعل هذا أمرًا مطلقًا بل تقيده بشيء هام، وهو كما جاء في رواية البخاري عن معاوية: "مَا أَقَامُوا الدِّينَ.»

وكما جاء في رواية عن أبي بكر: "مَا أَطَاعُوا اللَّهَ وَاسْتَقَامُوا عَلَى أَمْرِهِ.»

وكما جاء في رواية الإمام أحمد عن أنس بن مالك قال: قال رسول الله: "الأَئِمَّةُ مِنْ قُرَيْشٍ، إِنَّ لَهُمْ عَلَيْكُمْ حَقًّا، وَلَكُمْ عَلَيْهِمْ حَقًّا مِثْلَ ذَلِكَ، مَا إِنِ اسْتُرْحِمُوا، فَرَحِمُوا، وَإِنْ عَاهَدُوا وَفَوْا، وَإِنْ حَكَمُوا عَدَلُوا، فَمَنْ لَمْ يَفْعَلْ ذَلِكَ مِنْهُمْ، فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ

خەلیفەی پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم- ئەبوبەکر صدیق ڕەزامەندی خوای لێبێت. لەسەردەمی ئەبوبەکردا گوتاری سیاسی زۆر جیاوازبوو، پڕبوو لەگۆرانکاری و نوێگەری، چونکە سەردەمی ئەبوبەکر بۆ خۆی نوێبوو، وەحی دانەدەبەزی دەبوو خۆیان بڕیار بدەن، ئەمەش هۆکاری ئەوە بوو، کەئەحکامی نوێ لەسەر بنەمای خەلیفەی پێغەمبەری خوا ئەبوبەکری صدیق دادەمەزرێت و ئەم نازناوی خەلیفەی پێغەمبەری خوا وەردەگرێت -صلی الله علیەوسلم-. بەڵام مانای وانەبوو پیرۆزی بدرێت بەدەسەڵاتەکەی بۆیە خۆی دەفەرموێت: ئەگەر هەڵەم کرد، یان کارێکی نەشیاوم کرد هیچ کەس نابێت گوێڕایەڵم بێت[108].

لەسەردەمی ئەودا قورئان کۆکرایەوە و کرایە کتێب، سوپای ئامادەکرد دژی فارس و ڕۆم و پاشان جەنگی هەڵگەڕاوەکانی ئەنجامدا، توانی سەرکەوتنی تەواوەتی بەدەست بنێت بەسەریاندا دەوڵەتی ئیسلامی بەرفراوان کردوە سنورەکانی زۆر بەرفراوان بوو..

هەڵگەڕاوەکان مانای وانەبوو کەباس لەڕادەربرینی خۆیان بکەن و لەئیسلام پاشگەز بوبنەوە، بەڵکو دەیانویست هەریەکە بەبینایەك شتێك لەئیسلام زیاد و کەم بکات هەبوو داوای پێغەمبەرایەتی دەکرد و هەبوو داوای ئەوەی دەکرد زەکات نەمێنێت....هتد بۆیە ئەبوبکر ڕازی نەبوو بەو کارە وسوپای ئامادەکرد بۆ کۆکردنەوەی خەڵکی لەژێر ئاڵای خیلافەتەکەیدا..

جزیرەی عەرەب لەسەر ئاستی گشتی هەموو پاشگەز بوونەوە لەئیسلام، تەنها مەککە و مەدینە و طائیف نەبێت. لەبەر چەند هۆکارێك بوو، هەندێکیان ئەیان ووت زەکات نادەین، بەڵام بڕوامان بەهاتنی محەمەد (علیه الصلاة والسلام) هەیە و بڕوامان بەنوێژ و ڕۆژو و ئەرکانەکانی ئیسلام هەیە، بەڵام لەزەکات داندا بمانبەخشن، هەروەها کۆمەڵێك لەعەرەبەکان گوتی:نا نا بەتەواوەتی واز لەئیسلام ئەهێنین، محەمەد بەتەنها بناغەی ئەم دەوڵەتەی دامەزراند و لەدوای

[108] إن استقمت على طاعة الله فأعينوني عليها، وإن زغت عنها فقوّموني، أيها الناس ... أطيعوني ما أطعت الله، فإذا عصيت الله فلا طاعة لي عليكم.

نەمانی محەمەد ئەم دەوڵەتە ڕوخا و ئێمە دەست ئەکەینەوە بەپەرستنی بتەکانمان، بەتایبەتی عەرەبەکانی (بەنی حەنیفە) ژمارەیان ١٠٠هەزارکەس بوو. دەستیانکرد بەپەرستنی بتەکانیان، کۆمەڵێکیتر لەناو عەرەبدا پەیدابوون بانگەوازیان بۆ پێغەمبەرایەتی خۆیان دەکرد لەبەناوبانگەکانیان (مسيلمة الحنفي الكذّاب، والأسوود العنسي، وطليحة بن خويلد، وسَجَاح) بوون.

پێش هەموو شتێك بۆ ئەوەی بزانین لەکاتێکدا کەزۆربەی زۆری عەرەب لەسەردەمی جاهیلیەتدا بوون کەپێغەمبەری خوا -عليه الصلاة والسلام- بە پەیامەکەیەوە هات و ڕوداوی پێغەمبەرایەتی خۆی بۆ خەڵکەکە ڕونکردەوە کە لەماوەی ٢ ساڵدا خەڵکی زۆر هاتە ناو ئەم ئیسلامە، لەماوەی ساڵی (وفود) و سەرەتای جەنگی (موئتا)، موسڵمانێکی زۆر ڕویانکردە ئەم ئیسلامە و خەڵکێکی زۆر بەرمو ئیسلام هاتن، لەڕاستیدا ئەم ئیسلامەش لەلای خەڵکی بەشێوەیەکی سروشتی وەریان گرتبوو، خەڵکیك کەهاتنە ناو ئەم ئسیلامەوە بەهۆکاری هێز و توانای موسڵمانان سەرسام بوون، هەروەك لەجزیرەی عەرەبی موسڵمانان توانیان کۆنترۆڵی بکەن..

ئەمە بووە هۆکاری ئەوەی زۆرێك لەخەڵکی موسڵمان ببن، هەندێك کەسیان هەبوو بۆ سەروەت و سامان ئیسلامیان وەرگرت، چونکە ئیسلام لەشەڕ و جیهاد دابوو بەحوکمی ئەوەی لەشەڕەکان سەرکەوتو بوبوون لەم ڕێگایەشەوە سەروەت و سامانێکی زۆر دەست موسڵمانان کەوتبوو، هەبوو ئارەزویان لەجیهاد و غەنیمەت بوو، هەر بۆیە دەهاتنە ناو ئیسلامەوە، هەروەها کۆمەڵێکیتر هەبوون لەترسی موسڵمانان هاتبوون، کەئەو هەموو هێز و دەسەڵاتەی موسڵمانانیان بینی مەعنەویاتی موسڵمانان بەرزبوەتەوە لەترسا دەهاتە ناو ئیسلام، هەروەها کۆمەڵێکیتر هەبوون بەهۆکاری ئەو کۆمەڵانەی سەرەوە نەبوون کەباسمان کردن، وەك ئارەزو و هێزو ترس و....هتد بەڵکو هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دواکەوتنی گەورەی عەشیرەت و زەعیم و سەرکردایەتی گەورەی گەل هۆزەکانی خۆیان بوون بەو هۆیەوە هاتبوونە ناو ئیسلامەکەوە کەوەك دەمامکێك بوو بۆ ئەوان بۆئەوەی عەرەب بسازێنن لەگەڵ موسڵمانان.

كاتێك دەوڵەتی ئیسلام بەوشێوە گەورەیە دامەزرا، وایان زانی بەکۆچی دوایی پێغەمبەری خوا -علیه الصلاة والسلام- ئەم دەوڵەتە هەڵئەوەشێتەوە ! لەگەڵ ئەو شەپۆلە گەورەیەی کە وەك دەریا رژانە ناو ئیسلام، بەڵام پێغەمبەری خوا وەفاتیکرد، لەم کاتەدا ئەبووبەکری صدیق ڕەزا و ڕەحمەتی خوای لێبێت هێزێکی سەربازی ئامادە دەکات بەسەرکردایەتی (ئوسامەی کوڕی زەید) بۆ لێدانی ڕۆم کەئەمەش وەسیەتێکی پێغەمبەری خوا بوو پێش کۆچی دوایی. ئەمەش بەکرداری هاتە دی سوپاکەی ئوسامە دەرچوو بەرە و دەوروبەری شام، کەزانیان پێغەمبەری خوا -علیه الصلاة والسلام- ناردونی وەسێتی سەروەرمانە، بۆیە ئەبوبەکری صدیق ناردنیەوە و شەڕیان نەکرد، بەڵام کە گەڕانەوە کۆمەڵێك هۆزیان بینی، کەهەڵگەڕابوونەوە، ئەم گەل و هۆزانە سەروەت و سامانێکی زۆریان دەستکەوت و توانیان سەربکەون بەسەریاندا و بەخێرایی گەڕانەوە لای ئەبوبەکری صدیق بۆ مدینەی منەورە بەدەستکەوتێکی باش و سەرکەوتن لەو ناوچانەدا، پاشان ئەبوبەکری صدیق هێزەکانی دابەشکرد بە١١ بەشەوە لەجەزیرەی عەرەبیدا، بۆ ئەوەی هێزی موسڵمانان هەڵگەڕاوەکان بترسێنێت لەو ناوچانەدا هەبوون، زۆرێك لەهاوەڵان داوای ئەوەیان کرد، کەگرفت نیە باکۆمەڵێك لەوانە زەکات نەدەن، چونکە ئێستا زۆرێك لەدەوڵەتی ئسیلامی و دەوروپشتی لەدوای کۆچی دوایی پێغەمبەر -علیه الصلاة والسلام- هەموو هەڵگەڕانەوە لەدینی ئیسلام، کۆمەڵێکی کەم مابوونەوە لەمەککە و مدینە و طائف، بەڵام ئەبوبەکری صدیق ڕازی نەبو. پاسەوان و ئێشکگرێکی زۆری دانا لەدەوروبەری شاری مەدینە نامەی نارد بۆ هەموو هۆزەکان بەزمانێکی زۆر توندوتیژ هەڕەشەی لێدەکردن و دەیترساندن بەمەبەستی مانەوەیان لەسەر دینی ئیسلام و ئەگەر وانەبێ سوپا ئەنێرێت بۆ سەریان، بەڵام ئەبوبەکری صدیق (ڕەزا و ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەیەك کاتدا سوپاکانی نارد بۆ هەمولاکان بەیەکسانی، وە ئەمانەش هەموو ئارەزویان هەبوو کەجیهاد بکەن و

خەبات بکەن لەپێناوی خوای گەورە، ئەم ١١هێزەتوانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت[١٠٩].

**مورتەد و هەڵگەراوە لەئیسلامدا..**

**ئایا مورتەد لەئیسلامدا دەکوژرێت؟**

بەڵێ : بەدڵنیاییەوە دەکوژرێت ئەم ڕێسایە و یاسایە (حوکم)ە گشتیە، چونکە بەفەرموودەیەکی ڕاستی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم- حوکمەکە دامەزراوە، دەقی فەرموودەکە ( من بدل دينه فاقتلوه)

هەرکەس ئاینەکەی گۆڕی؛ دەبێت بکوژرێت.

ئەگەر بەچاوێکی گشتی تەماشای ئەم فەرموودەیە بکەین، کەواتە ئەوەی لەئاینی مەسیحیش بێتە ناو ئاینی ئیسلام، دەبێت بکوژرێت، چونکە ئاینەکەی گۆڕیوە، یاخود کابرای جولەکەش موسڵمان ببێت، هەر دەبێت بیکوژین، چونکە دینی جولەکەی گۆڕیوە بەئیسلام!..

**ئایا گوتاری سیاسی ئیسلامی لەم بارەیەوە چییە؟**

لە فەرموودەیەکیتردا کەکەویش ڕاستە (صحيح)مو کۆڕای لەسەر دروست بووە واتە؛ (متفق عليه)ە تەفسیری فەرموودەکەی پێشترمان بۆ دەکات دەفەرموێت خوێنی موسڵمان حەرامە کەشەهاداتی هێنا بەخوای موتەعال و پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم-، مەگەر بەم سێ کردەوەیە خوێنی حەڵاڵ دەبێت؛

- یەکەم؛ کەسێك کەهاوسەرگیری کردبێت و زینا و خیانەت بکات..
- دووەم؛ کەسێك بەناحەق کەسێکیتر بکوژێت..

---

[١٠٩] صاحب الرسول ابی بکر الصديق د.راغب السرجانی ل ٢٣٣

- سێیەم: هەر کەس واز لەئاینەکەی بهێنێت و لەکۆمەڵی موسڵمانان دابڕێت.
ئەمەش دەقی فەرموودەکەیە: (قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ الثَّيِّبُ الزَّانِي وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ ) (متفق عليه)
لێرەدا مەبەست لەو کەسەیە کەموسڵمان بووە، پاشان وازی لەئاینەکەی هێناوە، یان لەبەشێکی، یاخود لەهەمووی، ئەگەر لەنوێژ کردنیش بێت، بانگەشە بۆ کوفرەکەی خۆی دەکات و ئەو بڕیار ئەدات بۆ موسڵمان.
بانگەشە بۆ داهێنانی خۆی بکات واتە: کەسە هەڵگەڕاوەکە پێناسەی ئاینی ئیسلام بکات، بەردەوام تانە و تەشەر و قسەی بێسەروبەر بکات، ئەمە گومانی تێدانیە دەکوژرێت، واتە: ئەو کەسە دەبێتە دوو کاراکتەر:
یەکەم خوا، پەنا بەخوا ئەو بڕیاری ئاین ئەدات و کاراکتەری دووەمی جێگرەوەی پێغەمبەرە ئەو بڕیار و یاسا و ئەحکام دەردەکات، بەبێ هیچ بنەمایەك، لەکۆمەڵی موسڵمانان جیاواز دەبێت نێوانیان تێك دەدات و خەڵکی لا ڕێ و سەر لێشواو دەکات. ئەم کەسە نەك دەکوژرێت، بەڵکو - دەبێت بکوژرێت، نەك - لەئیسلامدا تەنانەت لەهیچ بەرنامە و دید و بۆچونێکیتردا ڕێگا نادرێت بەکەسێك لەخۆیەوە پێناسە بۆ بنەمایەك بکات کەهیچ وجودێکی نییە، واتە: - ناکرێت ئەندازیارێك پیشەی پزیشك بەکار بهێنێت، بڵێت من هەندەسەم خوێندوە لەکاری پزیشکیش دەزانم و نەشتەرگەری دەکەم !. ئەودەمە سەندیکای ئەندازیاران و پزیشکان هەردوولا سزای ئەو کەسە ئەدەن، بەهیچ شێوەیەك ئەمە جێگای قوبوڵکردن نیە.. چ جای ئەو کەسەی کەباس لەئاینێك بکات کەلەلایەن خواوە هاتووە!.. لەکاتێکدا ئەو وازی هێناوە لەئاینەکە و پێناسەی بۆ دائەتاشێت داهێنانی تێدا بکات..
یاخود کەسێکە لەناو دەزگایەکی گەورەی دەوڵەتی ئیسلامدا کار دەکات و هەڵدەگەڕێتەوە، ئەمە لەعورف و یاسای ئەمڕۆدا لەهەمو سەرزەمویدا بەخیانەتی گەورە و جاسوسی هەژمار دەکرێت، جا هەندێك وڵات وەك ئەمریکا بەکورسی کارەبا دەیکوژێت، لەڕوسیا دەخنکێنرێت، لەچین و کۆریا ئەتەقێنرێتەوە، لەئێران

لەسێدارە ئەدرێت و لەولاتانی ئەوروپا زیندانی هەتا هەتایی دەکرێت. لەهەندێك ولات ٢٥ ساڵ زیندان دەکرێت.. بەگوێرەی ئەو یاسایەی لەو وولاتەدا دەردەچێت. لەئیسلامیشدا سزاکەی کوشتنە..

ئەمەش هیچ کەس ناتوانێت رەخنەی لێبگرێت. چونکە دەبێتە هۆکاری ئەوەی کەگیانی خەڵکیتر لەدەست بچێت. یاخود سەروەری ولات و زیان بەدەوڵەت بگات و نهێنی ئاشکرا دەکات جا لەرووی سیاسی بێت یان ئابووری، یاخود سەربازی....هتد.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە دەڵێت: باشە من واز لەئیسلام دێنم. بێ ئەوەی بانگەشە دژی بکەم تەنها خۆم بروام پێی نیە. ئایا ئەم کەسە دەکوژرێت؟

بێگومان نەخێر ناکوژێت. بەبەڵگەی ئەوەی کەسێك لەئەعرابیەکان هاتە شاری مەدینە بەپێغەمبەر- صلى الله عليه وسلم - ی گوت: (من موسڵمان دەبم و بەیعەتت ئەدەمێ لەسەر ئیسلامەتی، بیعەتی دایە)...

پاشان رۆیشت و ئازارێك هات بەسکیدا و ماوەیەك بەو ئازارەوە مایەوە. کەسە ئەعرابیەکە گەرایەوە و گوتی من بوم بەئیسلام بۆیە وام لێهاتوە. چوەوە بۆ لای پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم- گوتی من واز لەبیعەتەکەم دێنم و لەئیسلام پاشگەز دەبمەوە. پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم- چەند جارێك نارەزایی دەربری، بەڵام لەکۆتایدا کەسەکەی ئازادکرد لەهەڵبژاردنی بیروباوەریدا. لەراستیدا زۆرکردن نیە لەهەڵبژاردنی بیروباوەر[١١٠].

[١١٠] ئەمەش دەقی فەرموودەکەیە : (عن جابر قال :إن أعرابياً بايع رسول الله ?فأصاب الأعرابي وعك بالمدينة فأتي النبي فقال :يا محمد أقلني من بيعتي ?فأبى رسول الله .ثم جاءه فقال :أقلني من بيعتي ? فأبى .ثم جاءه فقال :أقلني من بيعتي فأبى فخرج الأعرابي فقال رسول الله :إنما المدينة كالكير تنفي خبثها ?وينصع طيبها وفي رواية البخاري فبايعه على الإسلام) صحيح مسلم ?كتاب الحج ?باب المدينة تنفي خبثها ?ج ٣ ص ٥٣٠ ?البخاري ?كتاب الحج ?باب حرم المدينة ?ج ٣ ص ٢٩..

هەندێك جاریش کەسێك هەڵدەگەڕێتەوە و دژایەتی موسڵمانان دەکات، پاشان دەگرێتەوە بۆ ناو ئیسلام پاشگەز دەبێتەوە لەو کارانەی کەکردویەتی. موسڵمانان لێی خۆش دەبن، بەهیچ شێوەیەك ناکوژرێت، وەك پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم- بەرامبەر بەهاوەڵێکی خۆی کردی بەناوی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەرح کاتبی وەحی بوو هەڵگەڕایەوە و چوە ناو قورەیش، پاشان لەفەتحی مەککەدا موسڵمان بویەوە[111].

ئەمانەی باسمانکرد لەشاری مەدینە ڕویداوە و پێشتریش لەمەککە ڕویداوە خەڵکانیك هەڵگەڕاونەتەوە لەئیسلام و بەلای پێغەمبەری خواوە - صلی الله علیه وسلم- زۆر ئاسایی بووە، وەك ئەو هاوەڵانەی کەلەچونیدا بۆ ئیسراو میعراج

---

[111] ئەمەش دەقی فەرمووەدەکەیە ، ما يرويه القرطبي في تفسير آية الأنعام و من أظلم ممن افترى على الله كذباً ؟أو قال أُوحي إليَّ ولم يوح إليه شيءٌ قال :المراد عبد الله بن أبي سرح ؟ الذي كان يكتب الوحي لرسول الله ؟ ثم ارتد ولحق بالمشركين .وسبب ذلك فيما ذكر المفسرون أنه لما نزلت الآية التي في المؤمنون : وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ سُلَالَةٍ مِنْ طِينٍ) المؤمنون ٢٣:١٢ (دعاه النبي فأملاها عليه ؟فلما انتهى إلى قوله :ثم أنشأناه خلقاً آخر عَجِب عبد الله في تفصيل خلق الإنسان فقال :تبارك الله أحسن الخالقين .فقال رسول الله :كذا أُنزلت عليَّ فشك عبد الله حينئذ وقال :لئن كان محمد صادقاً ؟ لقد أوحي إليَّ كما أوحي إليه ؟ ولئن كان كاذباً لقد قلت كما قال .فارتد عن الإسلام ولحق بالمشركين ...فلما دخل رسول الله مكة أمر بقتله وقتل عبد الله بن خَطَل ؟ومِقْيس بن صُبابة ولو وُجدوا تحت أستار الكعبة ؟ففر عبد الله بن أبي سرح إلى عثمان ـ وكان أخاه من الرضاعة ؟أرضعت أمه عثمان ـ فغيبه عثمان حتى أتى به رسول الله بعد ما اطمأن أهل مكة فاستأمنه له ؟فصمت رسول الله طويلاً ثم قال :نعم .فلما انصرف عثمان قال رسول الله :ما صَمَتُّ إلا ليقوم إليه بعضكم فيضرب عنقه .فقال رجل من الأنصار :فهلاً أومأتَ اليَّ يا رسول الله ؟فقال :إن النبي لا ينبغي أن تكون له خائنة الأعين) تفسير القرطبي ؟ج ٧ ص ٢٧٢٨ .(هذه حالة أخرى من حالات الردة الواضحة والتي لم يعاقب فيها النبي بشيء ؟ ولو كان هناك حد للردة لما تراجع النبي عن تنفيذه وهو القائل لأسامة بن زيد حِبه وابن حِبه حينما أتاه يستشفع في امرأة سرقت في غزوة الفتح أتُكلمني في حدٍّ من حدود الله) صحيح البخاري ؟٥:١٩٢ .(فهل من الممكن بعد كل هذا أن نقول :إن الردة حد شرعي يجب أن يطبق ؟والقرآن يقول وَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ) الكهف ١٨:٢٩ .(أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ) يونس ١٠:٩٩

بڕوایان نەکرد و هەڵگەرانەوە! فەرمانیش نەکراوە بەکوشتنی کەسیان، تەنها بڕوایان نەکرد، بەڵام بانگەشەی خراپیان نەکردوە!..

کە واتە: خەڵکی ئازادە لەهەڵبژاردنی بیروباوەڕی، بەمەرجێك کاریگەری لەسەر موسڵمانان و چەواشەکاری و دژایەتی دروست نەکات، ئەگەر دروستیکرد ئەوا تاوانە لەدەوڵەتی ئیسلامیدا بێگومان سزا وەردەگرێت، مەرجیش نیە کوشتن بێت، چونکە وەك گوتمان حوکمە گشتیەکەی کوشتنە، بەڵام دەکرێت دوای وردبکرێتەوە بۆ کەفارەت، یان بۆ قصاص، یاخود تعزیر، تادەگاتە، حەد، کەکۆتایەکەیەتی و هیچ کەس ناتوانێت دەستی تێوەربدات، لەئیسلامدا کفارەت و قصاص و تعزیز دەکرێت بەگوێرەی بڕیاری حاکم یاخود ڕەوشەکە گۆڕانکاری بەسەردا بێت، بەڵام کەگەیشتە پلەی..حد، وەك پێغەمبەری خوا دەفەرموێت، ئەگەر فاتیمەی کچیشم بێت دەستی دەبڕم.

## چۆنیەتی گوتاری ئەمیری عومەری کوڕی خەتتاب ڕەزامەندی خوای لێبێت لەهەڵبژداردندا:

ئەبوبەکری صدیق ڕەزامەندی خوای لێبیت، تا لەژیاندا بوو، عومەری کوڕی خەتاب وەزیر و دادوەری حکومەتەکەی بوو، لەزۆرێك کاروباری دەوڵەتی خیلافەتەکەیدا ڕاوێژی بەعومەر دەکرد، کەلەمەرگ نزیك بویەوە بەهۆکاری نەخۆشی ڕاوێژیکرد بەهاوەڵان و عومەری کوڕی خەتتاب شیاوە بۆ ئەو جێگاو پۆستە..

لەڕاستیدا ئەوەی کەدەڵێن: عومەر بەتەعین دانراوە بەخەلیفە لەلایەن ئەبوبەکرەوە، بەوشێوە ڕەهاییە نیە، چونکە ئەبوبەکر بەتەنها عومەری کاندید نەکردبوو بۆ دوای خۆی، بەڵکو ـ ئەبووعوبەیدەی جەڕاح لەهەمانکاتدا کاندیدبوو، هۆکاری ڕاوێژ و پرسی زۆر لەسەر ئەوەی کامیان جێگرەوەی ئەبوبەکربن، دیاربوو زۆرینە ڕازیبوون لەسەر عومەر کوڕی خەتتاب و هەندێکیش عومەریان بەشیاو نەدەزانی دەیانگوت توڕەیە و کار لەسەر موسڵمانان قورسەدەکات!..

لەدوای وەفاتی ئەبوبکر عومەر بووە خەلیفە و لەسەردەمی ئەدا دادپەروەری گوتاری سەرەکی بوە عومەر بوو، لەهەمانکاتدا هێزی سەربازی و توانا سەربازیەکان و فراوانکردنی خاکی موسڵمانان لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتتابدا زۆر چوە پێشەوە زۆرێك لەوڵاتی فارس و ڕۆم و میسر و ناوچەکانی دیکە کەوتە بەردەستی موسڵمانان..

تایبەتمەندی عومەر زۆربوە هەرگیز پیرۆزی نەداوەتە دەسەڵاتی خۆی و ئیمامی عومەر لەسەر مینبەر دەفەرموێت: (ئەگەر هەڵەم کرد ڕاستم بکەنەوە)، کەسێك هەڵسا گوتی بەشمشێرەکانمان ڕاستت دەکەینەوە، ئەویش پێکەنی و گوتی: سوپاس بۆ خوا لەناو ئەم ئوممەتەدا خەڵکی باش ماوە دڵ خۆش بو..

ئەوەش دەقی فەرموودەکەیە: عمر بن الخطاب رضي الله عنه حينما يقول على المنبر: ـ "إذا أصبت فأعينوني، وإذا أخطأت فقوموني"، فقال له رجل من بين الناس: "إذا أخطأت قومناك بسيوفنا."!..فتبسم الفاروق وحمد الله بأن أمته بخير ما دام فيها مثل هولاء الرجال !!!

ئەوەندەی کەلەسەردەمی ئەودا گوتاری خواناسی بوو ئەوەندە گرنگی نەداوە بەسیاسەت و ئابووری و هێزی سەربازی..

ئەبوبکری صدیق ئەوەی تیا بەدیدەکرد و دەیزانی کەئەوەی نهێنیە لەناخیدا زۆر گەورەتر و باشترە لەوەی کەدەری دەبڕێت هەربۆیە کاتێك کە وەفاتیکرد ڕایگەیاند کەعومەر خەلیفەیە لەدوای پرس و ڕای زۆر، گوتیان ئەی خەلیفەی پێغەمبەر - صلی اللەعلیەوسلم- ؟ فەرموی عمری کوڕی خطاب ! گوتیان چۆن ئەوەدەکەیت بەجێنیشینی خۆت لەکاتێکدا ئەو ئەوەندە توندڕەوە و گوتی: نەخێر ئەوە ئێمە شك دەبات بۆیەوا توڕە و توندڕەوە لەسەرحەق ئەگەر ئێمە نەمێنین ئەو نەرم دەبێت.

کاتێك کەدەستەڵات کەوتە دەستی و بوو بەئەمیری ئیمانداران، یەکەم کەس بوو ناویاننا ئەمیری ئیمانداران، بوبە باوکێکی بەڕەحم و بەبەزەیی بۆ ئومەتەکەی پێغەمبەر- صلی اللەعلیەوسلم- و برایەك بوو بۆ هاوەڵەکانی و سیاسییەکی زۆر زیرەك و دانابوو دادوەرێکی بێ هاوتابوو باشترین وەسفیش

بۆئەو وتەکەی عبدالله کوڕی ئیبن مەسعوودەکە گوتویەتی: (ئیسلامبوونی عمر کردنەوە و سەرکەوتنێکی گەورەبوو بۆئیسلام کۆچکردنی سەرکەوتنێکی گەورە بوو دەسەڵاتەکەیشی ڕەحمەتێك بوو بۆ ئومەتە).

لە بەسەرهاتەکانی ئیمامی عمر کوڕی خطاب بەشەو دەگەڕا لەکۆڵان و ناو ماڵە کاندا تەماشایکرد، کە ئافرەتێکی بەتەمەن ئاگری کردۆتەوە و مەنجەڵێکی لەسەری داناوەو منداڵەکانی دەگریان.

عمری کوڕی خطاب لەدەرگاکەوە نزیك بۆیەوە و پرسیاریکرد گوتی، (یاأمة الله) ئەی ئافرەتی بەندی خوا ئەوە بۆ ئەومنداڵانە دەگرین ؟

ئافرەتەکە وتی: گریانەکەیان لەبرسایە!

عمر گوتی، ئەی ئەو مەنجەڵە چی یەلەسەر ئەو ئاگرە؟

ئافرەتەکە گوتی: ئەوە ئاوی تێدایەو ئەیان خلافێنم بەوەی کەگوایە ئاردو ڕۆنی تیایە!

عمر گوتی: شکاتت لەچییەو گلەییت لەچییە؟

ئافرەتەکەگوتی، شکات و گلەیم لەعمری کوڕی خطابە لەلای خوا !

عمری کوڕی خطاب گوتی: عمر تاوانی چییە؟

ئافرەتەکە گوتی: ئەی چۆن کاروبارمانی گردۆتە دەست و ئاگای لێمان نییە؟

عمری کوڕی خطاب دانیشت و دەستیکرد بەگریان و پاشان هەستایەوە و ڕۆیشت بۆ بەیتومالی موسڵمانان کە سەروەتی تێدایە بۆ فەقیر و هەژاران و تورەکەیەکی گرتەدەستەوەو پڕیکرد لەئارد و ڕۆن و چەوری و خورما و جل و بەرگ، تا جاخەکە پڕبوو.

پاشان بەئەسلەمی کوری گوت، ئەسلم بیدە بەکۆڵما.

ئەسلم گوتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران من هەڵی دەگرم لەجیاتی تۆ.

عمری کوڕی خطاب گوتی، دایکت نەبێ ئەسلم، من خۆم هەڵیدەگرم من بەرپرسیارم لەوان و لەقیامەتدا لێمدەپرسنەوە.

ڕۆیشت کە گەیشتە ئەوێ هەندێ لەئارد و چەوری و خورمای بۆیان خستەسەر ئاگرەکە و خۆیشی ڕیشی زۆر گەورەبوو کاتێك کەفوی لەئاگرەکەدەکرد دوکەڵ

لەنێوان ڕیشیەوە دەردەچوو بەرز دەبۆوە تاوەکو خواردنی بۆیان ئامادەکرد و بەدەستی خۆی خواردنی دەکردە دەم منداڵەکانەوە تاوەکو تێریان خوارد.

ئافرەتەکە گوتی: تۆ شایستەتریت بەخەلیفەیی وەك لەعمری کوڕی خطاب !

عمری کوڕی خطاب گوتی: کەڕۆژبۆوە وەرە بۆلای عمری کوڕی خطاب باسی بۆدە کەم و وەزعەکەتی بۆ دەگێڕمەوە. کەوتەسەر پێلاوەکانیان و وەکو شێرێك یاری لەگەڵیاندا دەکرد. تادەستیان کردەپێکەنین.

عمر گوتی: ئەسلم ئەزانی بۆ وا بەسەر پێلاوەکانیاندا کەوتم و یاریم کرد لەگەڵیاندا؟

ئەسلم گوتی: هیچ نییە ئەی ئەمیری ئیمانداران قەیدی نییە.

عمر گوتی: چونکە بینیم دەگریان حەزم نەکرد بەجێیان بهێڵم تانەکەونە پێکە نین ئەوجا دڵم داکەوت ئیسراحەتم کرد !

پاشان چو بۆ نوێژی بەیانی بەجەماعەت وئیبن ئەبوو مەسعوود دەڵێت: (ئەو نوێژە هیچ لەعمری کوڕی خطاب تێنەگەیشتم لەقورئان خوێندنەکەی لەبەر گریانی).

کاتێك کەڕۆژ بۆوە ئافرەتەکە چو بۆلای عمر خەلیفەی ئیمانداران، بینی کەئەو پیاوە بەتەمەنەی کەشەو خواردنی بۆهێنا و منداڵەکانی ژێرکردەوە دانیشتوە لە تەنیشتی علی کوڕی ئەبوو طالب وئیبن مسعود ڕەزا و رەحمەتی خوایان لێبێت گەیاندیان گوتیان ئەوە عمرە.

عمر گوتی: بێخەمبە ئەی ئافرەتی بەندەی خوا (یاامة الله)، ئەو زوڵمەی ئیمشەو لێتمکرد بەچەند پێم ئەفرۆشیتەوە.

ئافرەتەکە گوتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران، نەیتوانی قسەکەی تەواو بکات.

عمر گوتی: ئەوەکریم بە٦٠٠ شەش سەد درهەم و علی تۆش بینوسە بۆی !

پاشان عمر گوتی: ئەگەر مردم بیخەنە ناو کفنەکەمەوە. بەڵکو خوای گەورە بەهۆی ئەوەوە ڕەحمم پێبکات.

لەبەر فراوانی دەسەلاَت و دەوڵەتەکەی دوژمنانی ئیسلام چاویان هەڵندەهات بەدەسەلاَتەکەی بۆیە پلانیان لەدژی گێڕاو برینداریان کرد و تالە کۆتایدا وەفاتیکرد و بو بە شەهید..

لە کاتێکدا کەعومەری کوری خەتاب بریندار دەکرێت هیوای ژیانی نەماوە.. بۆیە دەستەیەك لەهاوەڵان هەڵدەبژێرێت کەبریتین لەشەش کەس (عوسمانی کوڕی عەفان، عەلی کوڕی ئەبوتالیب، عەبدورحمانی کوڕی عەوف، زوبێری کوڕی عەوام، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس، تەڵحەی کوڕی عوبێدولاَ) حەوتەم کەس بەراوێژکاریان کەکوڕەکەی خۆی بوو بەناوی عبدالله ی کوڕی عومەر، تەنها ڕاوێژی پێدەکرا کاندید نەبوو بۆ سەرۆکایەتی دەوڵەتەکە.

بۆچارەسەرکردنی ئەم شەش کاندیدە زوبێری کوڕی عەوام کاندیدیەکەی خۆی پێشکەشی عەلی کوڕی ئەبی تالیب کرد، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص پێشکەشی عوسمانی کوڕی عەفانی کرد، وە طەلحەی کوڕی عوبێدولاَ پێشکەشی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفی کرد.

ئێستا لەو شەش کەسە مایەوە سێ کەس، ئەو سێ کەسەش: عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف بەعەلی کوڕی ئەبی تالیب و بەعوسمانی کوری عەفان فەرموو ئەگەر واز لەکاندیدیەکەی خۆم بێنم ئامادەم بەیعەت بدەمە هەرکامێکتان قبوڵی بکەن هەردووکیان ڕەزامەندیان لەسەر دەربڕی. عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف سێ شەو و سێ ڕۆژ نەخەوت، تا هەڵبژاردنی کرد لەنێوانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و عوسمانی کوڕی عەفان دا لەناو شاری مەدینەدا دەنگی هەموو ماڵەکانی وەرگرت، لەکۆتایدا هەموو لەسەر ئەوە ڕێکەوتن کەهەموو یان دەنگ بدەن بەعوسمانی کوڕی عەفان.

لە دوایدا هەموو هاوەڵەکان لەحکومەتەکەی عوسمان مانەوەو بوونە ڕاوێژکار و دەسەلاَتداری ناو حکومەتەکە ئەگەر موسڵمانان لەدەست و دڵ و هێزی یەك سەرکردەدا کۆبنەوە ئەوانیتر هەموو هاوکاری بێ ئەوکات خوای گەورە پرۆژەی دەوڵەتیان وەك خەلاَت پێ دەبەخشێت.

**کۆتایی و دەرئەنجام:**

لێرەوە لەوێ زۆرێك لەئیسلامیەکان و نوخبەکانی و تەنانەت سەرکردەکانی لەدەرگای ئەو وتەیە دەدەنەوە، کەدەرگای ئیجتیهاد و لێکۆڵینەوە داخراوە لەم سەردەمەدا.. یاخود دەڵێن: ((کراوە بەڵام وەك پێویست نیە، بەڵام لەڕاستیدا گوتاری سیاسی ئیسلامی نێوەندگیری و دادپەروەرانە کاری لەسەر نەکراوە، لەسەر بنەمای گۆڕاو نەگۆڕەکانی، بەڵکو ئەوەی دەیەوێت گوتاری دینی و یاخود ئاخفتن لەسەر گوتاری سیاسی ئیسلامی بکات، تا یاخود سەلەفیەکی وشك و ڕەدکرەوەی هەموو بیرکردنەوەیەکی تەندروستە، یاخود موعتزیلەیەکی ئەقڵانی زۆر دەماگیرە، یان قورئانیەکی داماوە.. خۆشی نازانێت باس لەچی دەکات.. لەنێوانیاندا خەڵکێك هەیە.. دەیەوێت گوتاری ئیسلامی نوێ ببێتەوە، هەڵبەت گۆڕانکاری نا، بەڵکو نوێگەریی.. بەگوتاری ئیسلامیەوە دیار بێت.. لەهەموو ڕووەکانەوە، تا ببیتەوە مۆرکی ئەم سەردەم و ڕەوشە و بتوانرێت تەفسیری نوێ و گونجاندنی لەگەڵ واقیعی ئەمڕۆ و پێداویستی ئەقڵی نەوەکانی ئەم ئیسلامە تێر بکات.. لەم کتێبەدا ئەوەمان خستۆتە ڕو، کەگوتاری ئاینی و یاخود گوتاری سیاسی ئیسلامی ئاراستە دەکات بەناوی دینی ئیسلامەوە بۆ موسڵمان و بێجگە لە موسڵمان لەهەموو کەمە ئاین و نەتەوەکانیتر، بانگەواز بۆ ئیسلام و فێریان دەکات و پەروەردەیان دەکات لەسەر بیروباوەڕ و شەریعەتەکەی، عیبادەت و مامەڵەکانی و فیکرو ئاکارو ڕەوشتی و شیکاری ئەدات لەسەر زۆرێك لەووێستگەکانی ئەم ئیسلامە لەڕووی مێژوویی و ئێستاشمانەوە، کەهەموو پەیوەستە بەژیانی مرۆڤ و جیهان و تاك و کۆمەڵگە لەڕووی ڕوحی و مادییەوە.. لەڕووی تیرۆری و زانستیەوە.. ڕاستە لێرەدا نەمانتوانی هەموو لایەنەکانی گوتاری سیاسی بخەینە ڕوو، بەهۆکاری ئەوەی سنوردارکرابوو نوسینەکە.. کێشەی گوتاری ئیسلامی: کێشە لەئیسلامدا نیە هیچ خێچو خوارییەك لەئاینی پیرۆزی ئیسلامدا بەدڵنیاییەوە نیە، خوای گەورە بەتەواوەتی و بەکامڵی ناردویەتی و دەفەرموێت: ( الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا )٣ المائدة

واتە: ئەمڕۆ ئاین و بەرنامەکەتانم بە کۆتایی گەیاند. وە ناز و نیعمەتەکانی خۆمم بۆ تەواو کردن وە ڕازیم بەوەی کە ئیسلام ببێتە بەرنامە و دین و ئاینتان، بەڵکو نا تەواوی و کەمو کورتی بەدڵناییەوە لەجۆری مامەمەڵەکردنمانە لەگەڵ دەقە ئاینیەکاندا و لەگەڵ مەنهەجە ڕەبانیەکەی خوای پەروەردگاردا.. کێشەکە.. تێنەگەیشتنە لەدەقە شەرعیەکا نو نەزانیە و نەگونجانیەتی لەگەڵ ڕەوش و واقعی ئەمڕۆدا، لەکاتیکدا گوتاری قورئانی بۆ خۆی گۆڕانکاری بەسەرداهاتوە لەمەککەوە بۆ مەدینە، بەڵام بۆ ئەمڕۆمان گۆڕانکاری بەسەر دەقەکانی قورئاندا نەیەت، ئەوەی کەدەمانەوێت سوودی لێوەربگرین تەنها نوێکردنەوە نۆێگەراییە لەڕووی ڕاڤە و تێگەیشتن و دەقە شەرعیەکان، ئەکرێت بەشێوەیەکی گشتی کێشە و خەلەل لەدۆگمایی و وەستاوی ئیجتیهادی زانایان بێت هەندێك جار نەبوونی جورئەت.. لەسەر دەقە شەرعیەکان.. ئەگەر تەماشای هەندێك لەبانگخواز و زاناکان و سیاسیەکان بکەین، کەهەریەکە خاوەنی گوتاری تایبەتی خۆیانن لەڕووی ئاینی و تەنانەت سیاسییەوە.. عەدنان ئیبراهیم ووێڕای تێبینیم لەسەری، بەڵام چونکە خاوەن گوتاری تایبەت بوو، وەك چۆن ئاگر دەنێت بەپوشەوە ئەوکەسە خەڵکی گوێ بۆ دەگرێت و زۆرێك لەبۆچونەکانی بەهەند وەردەگیرا، مەگەر ئەو هەڵە و چەوتو چەوێڵیانەی کەکردی بەرامبەر بەهاوەڵان و بەتایبەت بەمعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان، نموونەیتر زۆرن لەوانەی کەنوێگەری بەگوتاری ئاینی و سیاسیانەوە هەیە، نموونەی (د. سەلەمان فەهدعودە، ئەندازیار فازیل سلێمان، حەسەن تورابی، غەنوشی..هتد.) لەناو کوردا (د.موستەفا زەڵمی، م. عەلی باپیر) لەو دووکەسە زیاترم نەدیوە کەخاوەن جورئەت بن لەدەربرینی حکومەکان و وەرگرتنی بەبەڵگە و ڕەتکردنەوەی بەڵگەوە، یاخود ئەو دووکەسە دەرکەوتوەکانیانن، هەندێکیتر هەوڵیان داوە.. بەڵام زۆر نەزانانە تێکەوتون، لەجیاتی نوێگەریی دەیانەویت گۆڕانگاری لەدیندا بکەن و خەڵك و زانایانیشیان لەخۆیان تورە کردوە، لەڕاستیشدا هەموو سەردەم و زەمەنێك موجتەهید زانای نوێگەری سەردەمی خۆی هەبووە، کەپێویست ناکات لێرەدا ناوەکانیان ڕیز بکەین و باسی ژیانیان بکەین، بەڵام ئاماژە بەهەندێك

دەکەین وەك ناوەکانیان و ناسراوترین لەنوێگەراکانی سەردەمەکانی خۆیان نموونەی؛ ئیمامی شافعی، ئیمامی ئەحمەد، ئەوبوحەسەنی ئەشعری، ئیبن وتیمییە، ئیمامی شاطبی، ئیمامی شەوکانی، صنعانی، محەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب... هتد.

## کێشەکە لەکوێوە سەرچاوەی گرتوە؟

سەرچاوەی کێشەکان لەگوتاری سیاسی ئیسلامیدا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو قوتابخانە فکریانەی کە لەسەرچاوەکەی ئاینی ئیسلامە و هەندێکیان کاریگەری ڕۆژئاوا و عەلمانیەتیان بەسەرموەیە، هەندێکیش پێچەوانەکەی کە تائێستاش دەیەوێت مێژووی موسڵمانان بکاتە گوتاری سیاسی ئیسلامی لەنێوانی ئەم دوو ئاراستەیەدا، ململانێیەکی بەهێز هەیە و لەنێوەندەدا گوتاری سیاسی.. لەبنەرەتی (قورئان و سوننەت و واقعی و مێژوو و ئەقڵ).. کەلەڕاستیدا بنەمای دامەزراندنی گوتاری سیاسی ئیسلامی تەندروستە، ئەو پێنج چەمکەی ئاماژەمان پێداوە ئوصولیەت دەگەیەنێت بەمانای ئەصلیەت، بەواتای خواناسی و دینداری و گەڕانەوە بۆ سەرەتای خەصڵەتە ئیسلامیەکان، کەسەرچاوەش واتە؛ شەریعەت.. شەریعەتیش بەمانای یاسا بنەڕەتیەکان. گوتاری سیاسی ئیسلامی سێ جۆرە؛ گوتاری جەماوەری و گەل: سەرچاوەکەی ناو گەلە و درێژ دەبێتەوە بەناو ناخی هەموو ئەو جەماوەرە موسڵمانەی کەبوونی هەیە.. یاخود هەموو خەڵکی بەگشتی، لەڕووی چین و توێژ و قوتابخانە و ئایدۆلۆژیاکانەوە لەعەلمانی و سیستەمە نوێ و جیهانی و..هتد، تا ئەوکاتە گۆڕانکاری لەناو گۆمەڵگەی ئیسلامیدا بکرێت و بگەڕێتەوە سەر بنەڕەتی خۆی و ئاکار و ڕەوشتی ئیسلامی و گۆمەڵگەی پێغەمبەری.. واتە؛.. دورکەوتنەوە لەشارستانیەتی ڕۆژئاوایی و گەڕانەوە بۆ سەر ئەصالەتی کۆمەڵگە و شارستانیەتی ئیسلامی. گوتاری سیاسی، ئەمەش گوتاری ئەو کەسە نوخبەییە لەچین و توێژی ناوەندی کۆمەڵگە کە ئامادەن ببنە سەرکردە، بەڵام تا ئیستا هەر لەپلەی کادێریدا ماونەتەوە، وەك

چین و توێژی زانکۆکان و دەرچووەکانی و مامۆستاکانی.. ئەم گوتارە زیاتر گرنی ئەدات بەکاری سیاسی بۆ گۆڕانکاری.. گوتاری فکری: گوتارێکە کەزیاتر لەڕووی تیۆرییەوە ئاراستە دەکات و تەنضیری ناو فکری بزوتنەوە ئیسلامیەکان دەکات. لەئێستا و ئەمڕۆماندا دوو گوتاری ئیسلامی بوونیان هەیە و بەردەوام لەململانێ دان، هەردووکیان سەرچاوەکانی دوو بنەمای بەهێزی ئیسلامی و دووکەسایەتی زانا و ئەکادیمی گەورە، قسەو باسی لەسەر دەکەن.. ئەویش زانا و ناسراو.. دکتۆر یوسوف قەرزاوییە، ئەویدیکەش زانا و ئەکادیمی گەورە دکتۆر عەبدول وەهاب مەسیریە.

## سەرچاوەکان:

١ ـ القران كريم

٢ ـ تفسير ئاسان، بۆتێگەیشتنی قورئان: نوسینی: بورهانی ئەمین عەبدولکەریم، ناوەندی ڕۆشنبیر

٣ ـ الدراسة والمناهج التعليمية، الخطاب السياسي، الجامعة الاردن، كليه العلوم السياسيه.. مرحله رابعة كليه العلوم السياسيه.. ، سنة ١٩٩٦

٤ ـ گوتاری سیاسی حیزبی ڕاپەڕینی ئیسلامی تونسی پیرمو پرۆگرامیان.. ساڵی ٢٠١١

٥ ـ المعهد الديمقراطي الوطنی میسریە( ناسراوە بەNDI ) چەند کۆرسێکی پێگەیشتنی قیادی

٦ ـ لسان العرب، ابن المظور...

٧ ـ فەرهەنگی سیاسی نوێ ٢٠٠٦، ئامادەکردنی زاهیر محەممەدی و یاسین حاجی زادە

٨ ـ مدخل لدراسة القانون -تعريف القانون- وخصائص القاعدة القانونية- دعبدالكريم الطالب .. المرحلة الاولى كوليه القانون جامعة الحسن الأول.. ٢٠٠٦

٩ ـ تجديد الخطاب السياسي..دكتور مصطفي الفقي الطبعة الثانية، لبنان- بيروت- ٢٠٠٠

١٠ ـ مختصر أصول الخطاب السياسي الإسلامي القرآني والنبوي والراشدي: د. حاكم المطيری

١١ ـ تحرير الإنسان وتجريد الطغيان: د. حاكم المطيری

١٢ ـ الحرية أو الطوفان: د. حاكم المطيری

١٣- الخطاب الإسلامي بين الأصالة والمعاصرة، د. عبدالعزيز التويجري الطبعة الثالث- قاهيره -١٩٩٨

١٤- الخطاب الإسلامي.. الماهية ودلالات التجديد، وسام فؤاد- الناشر دار الكتاب – قاهيرة/١٩٩٥

١٥ ـ جيهانبينى ئيسلام.. م. كريكار - چاپى دووەم، ٢٠٠٩ له بلاوكراوەكانى ديد نوێ

١٦ ـ شرح العقيدة الطحاوية، الشيخ الدكتور سفر بن عبدالرحمن الحوالي ...وەرگێرانى، باوكى محەمەد – ٢٠٠٦

١٧ ـ منهاج المسلم، ابوو بكر جابر الجزائرى..دار الفكر – لبنان بيروت – ١٩٩٩

١٩ ـ تفسير التحرير والتنوير.. محمد الطاهر بن عاشور.. الدار التونسية للنشر- ٢٠٠٨

٢٠ ـ فتح القدير، محمد بن علي بن محمد بن عبد الله الشوكاني اليمني (المتوفى، ١٢٥٠هـ) دار ابن كثير، دار الكلم الطيب - دمشق، بيروت- الطبعة، الأولى - ١٤١٤ ه

٢٢ ـ تفسير عبد الرحمن السعدي أو كتاب تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان ، من تفاسير القرآن الكريم العصرية.

٢٣ ـ كتێبى مافى مرۆڤ لەئيسلام دا لەنوسينى دكتۆر سلێمان حەقيل- الطبعه الاولى ...٢٠٠٢

٢٤ ـ أخلاقيات الحروب في السنة النبوية.. للدكتور راغب السرجاني، مؤسسة اقرا/ الطبعة الاولى-٢٠١٠

٢٥ ـ فتح الباري ابن الحجر العسقلانى، منشورات محمد على بيضون= دار الكتاب العلمية- لبنان ، بيروت..٢٠٠٤

٢٦ ـ جمع البيان ـ نوسينەكەم لەجێگايەكى ترموە گواستۆتەوە سەرچاوەكەى نێت / Islm Story.com

٢٧ ـ مجموع الفتاوى ابن التيمية، منشورات محمد على بيضون= دار الكتاب العلمية- لبنان ، بيروت..٢٠٠٥

٢٨ ـ الأم..ئيمامى شافعى .. – ١٩٩٠- دار المعرفة - بيروت

٢٩ ـ حقوق الإنسان، محمد الزحيلي.. دراسة مقارنة مع الإعلان العالمي والإعلان الإسلامي لحقوق الإنسان-دار ابن كثير-

٣٠ ـ (فقه الخلافة وتطورها..) رواد قلعچى، الطبعة الاولى ٢٠٠١.. لبنان -بيروت

٣١- الاسلام والغرب د. جمال النابلسي؛ الطبعة الاولى ٢٠٠٨- قاهيره
٣٢ ـ ژیان و ڕەوشتی پێغەمبەر عبدولعزیز عەلائەدین موستەفا ١٩٩٤ چاپ سنە - ئێران
٣٣ ـ مصنفة النظمه الاسلامية.. د. مصطفى كمال وصفى.. الناشرمكتبة وهبة قاهيره دار الكتاب المصرية-٢٠٠٩..
٣٤ ـ عندما عهد الرسول.د. راغب السرجانى .. اقلام ..٢٠١٢ الطبعة الثانية
٣٥ ـ السياسه ولحكم د. حسن الترابى.. الدار العربية للعلوم ناشرون / الطبعة الاولى ..٢٠١١
٣٦ ـ سمات الاقتصاد الإسلامي ـ د.عبدالجبار السبهاني ـ الطبعة الاولى .. لبنان – بيروت ..٢٠٠٦
٣٧ ـ موسوعة الاقتصاد الإسلامي في المصارف والنقود والأسواق المالية.. الإمارات العربية المتحدة.. / موسوعة الحرة- عام ٢٠٠٠
٣٨ ـ گۆڤاری ڕێگای هزر ژمارە ٤ گۆڤاریکی وەرزییە لە هەرێمی کوردستان دەردەچوو
٣٩ ـ الحرية.. محمد صالح المنج/ الناشر؛ الام القرى ..المكة المكرمة- ٢٠٠٧
٤٠ ـ التفسير الشعراوي.. شيخ محمد المتولى الشعراوى دار الكتب العالمية قاهيره ٢٠٠٢-
٤١ ـ فيقه الجهاد دراسة مقارنة لاحكام وفلسفته في ضوء القران وسنة.. نوسینی؛ دکتۆر يوسف القرضاوي؛ مكتبة وهبة قاهيره الطبعة الثالثة:٢٠١٠
٤٢ ـ قصة الاندلوس..دکتۆر راغب السرجانى من فتح الى السقوط.. مؤسسة اقرا..٢٠١١
٤٣ ـ العالم قبل الاسلام.. د. راغب السراجانى.. مؤسسة اقلام - ٢٠٠٢
٤٤ ـ قراءة سياسية للسيرة النبوية؛ محمد رواس قلعەجى؛ دار النفائس الطبعة الاولى ١٩٩٦
٤٥ ـ الاسيره وبناء الامم..دراغب السرجانى موسسة اقلام؛ ٢٠٠٣ الطبعة الاولى
٤٦ ـ قصة العرب.. د. الحسون محى الدين الطبعة الاولى - ١٩٩٢

٤٧ ـ رجال حول الرسول.خالد محمد خالد- لبنان بيروت-٢٠٠٠
٤٨ ـ وشهد شاهد من اهلها..د. راغب السرجانى ناشر النهصة مصريه الطبعة الثانية- ٢٠١٠
٤٩ ـ النظام السياسي فى الاسلام د. محمد عندالقادر ابوو الفارس دار القران الكريم الكويت. المدروس فى كلية الشريعه بالجمعةالاردنية- ١٩٨٤
٥٠ ـ خطاب الوحي د.عثمان بركات.. الطبعة الاولى قاهيره - ٢٠٠١
٥١ ـ صاحب الرسول ابوبكر الصديق. د.راغب السرجانى الطبعة الاولى – الاقلام - ٢٠٠١
٥٢ ـ كۆمەڵناسی ئەنتۆنی گیدنز، وەرگێڕانی حەسەن ئەحمەد- چاپخانەی ئاراس هەولێر -٢٠٠٩
٥٣ ـ التاريخ الاسلامى.. محمود شاكر، الطبعة الثامنة- ٢٠٠٠ المكتبه الاسلامى – بيروت – ديمشق -عمان
٥٤ ـ ئازادکردنی مرۆڤ وراماڵینی ستەمکاری حاكم المطيرى وەرگێڕانی فاتح سەنگاوی- زنجیرەی کتبەکانی گۆڤاری ڕێنوین، چاپی یەکەم، ٢٠١١
٥٥ ـ العمق الاستراتيجى د.احمد داود اغلو، المركز الجزيرة للدراسات- ٢٠١١- الطبعة الاولى
٥٦ ـ في الفقه السياسي د.حسن الترابى .. الدار العربية للعلوم الناشرون- الطبعة الاولى ٢٠١٠
٥٧ ـ ـ الجديد في الفقه السياسى المعصر د. سعدالدين مسعد الهلالى- مكتبة وهبة الطبعة الاولى -٢٠١١
٥٨ ـ الطرق الحكمية في السياسة الشرعية ابن قيم الجوزية- دار الكتب العلمية، لبنان – بيروت الطبعة الاولى ١٩٩٥
٥٩ ـ تأملات في الواقع الاسلامى.. عمر عبيد حسنة- المكتب الاسلامي الطبعة الاولى ١٩٩٠
٦٠ ـ دەوڵەتی خیلافەت .نوسینی ئیکرام کەریم .. چاپی یەکەم - پرۆژەی تیشك، ساڵی ٢٠٠٧

٦١ ـ السلام و الاخر من يعترف بمن ؟ ومن ينكر من؟ آ.د. محمد عمارة، الطبعة الأولى لدار السلام ٢٠١٢
٦٢ ـ الثقافة المجتمع.. د. سمير ابرهيم حسن، دار الفكر بدمشق، الطبعة الأولى ٢٠٠٧
٦٣ ـ الحريات العامة في الدولة الاسلامية.. راشد الغنوشي، مركز دراسات الوحدة العربية، الطبعة الأولى، بيروت/لبنان ١٩٩٣
٦٤ ـ التصور السياسى للحركة الاسلامية..رفاعي سرور، دار اشبيلية ١٩٩٥
٦٥ ـ دين الانسان.. فراس السواح، دار علاءالدين، سورية/دمشق، الطبعة الرابعة، ٢٠٠٢
٦٦ ـ المشترك الانساني.. د. راغب السرجاني، مؤسسة اقرأ، الطبعة الأولى، ٢٠١١
٦٧ ـ الشورى فريضة اسلامية د. على محمد الصلابى، دار ابن الكثير، الطبعة الأولى، ٢٠١٠
٦٨- الموسو عة الميسر التاريخ الاوربا.. د. محمد موسى شريف .. مؤسسة اقرأ، الطبعة الثامنة، ٢٠٠٧
٦٩-قصة الحروب الصليبية. د. راغب السرجانى، مؤسسة اقرأ، الطبعة الخامسة، ٢٠٠٩
٧٠-الدولة العثمانية.. د.على محمد الصلابي، بيروت-لبنان، الطبعة الأولى ٢٠٠٧
٧١-دائرەتول مەعريفی بەريتانی و ويكيپيديا ئەنتەرنێتی).
٧٢-مێژووی نوێی ئەوروپا.. نوسينی: ه.ا.ل.فيشەر، چاپخانەی رۆژهەڵات، هەولێر ٢٠٠٩
٧٣- Verdenshistoriet مێژويەکی فراوانی هەموو ئەوروپايە بەزمانەکانی جيهان بڵاوە بەزمانی نەرويجی سودی لێوەرگيراوە، ٢٠٠٦نرويج- ئۆسلۆ
٧٤- الفرق والمذاهيب.. ممدوح الحربى .. الطبعة الاولى دار الناشر الكتب العالمية .. قاهير..٢٠٠٧

٧٥-ابو بكر الصاحب الرسول .. د.راغب السرجانى، دار الاقلام .. الطبعة الاولى - ٢٠٠٤

٧٦- سيرة الرحيق المختوم.. صفي الرحمن المبارك كفوري، دار الكتب العلمية، بيروت-لبنان، الطبعة الجديدة لونان ٢٠٠٧

**بەرهەمەکانی نوسەر**

١- ڕێرەوێك بۆ خۆناسین
٢- تنۆك
٣- گفتوگۆی قەڵەم
٤- گفتوگۆی ناخ
٥ -مێژووی سەلاحەدینی ئەیبوبی وئێستامان
٦- گەل و گۆڕانكاری
٧- چەند ومرزێك لەئەزمون
٨- ناساندنی چەند لێرەوارێك
٩ -زەردەشتیزم لەنێوان پەیامبەری و فەلسەفەو مێژوودا
١٠ -گوتاری سیاسی ئیسلامی
١١ -ڕێڕەو
١٢ - لەژێر ئاڵای پێغەمبەردا
١٣- ئیسلام فۆبیا

## پێڕست



خەسرەو عەبدولکەریم محەمەد سەعید ناسراو  بە ماکوان کەریم ، لەساڵی 1977 لەشاری پێنجوێن لەدایك بووە، بڕوانامە ماستەری لەزانکۆی  لەندەن (London Hu_ manities College) بەدەستهێناوە، ئێستا لەووڵاتی نەرویج نیشتەجێیە..

# گوتاری سیاسی ئیسلامی

## لە نێوانی ئێستاو مێژوودا

ماکوان کەریم

بڵاوکراوەکانی بژاڤی نوێ

ISBN 978_82_690419_0_3

